

# ئافرەت

لە ڕوانگەی

# عەلمانی

# و

# ئایینیەوە

نووسینی

مسعود عبدالخالق

چاپی یەکەم

هەولێر - 2010

ناوی کتێب: ئافرەت لە روانگەی عەلمانی و ئاییینیەوە
نووســـــینی: مەسعود عبدالخالق
نەخشەسازی: جمعە صدیق کاکە
بـــــەرگ: یوسف هەریری
چاپی یەکەم ٢٠١٠
نرخ : ٢٥٠٠ دینار
چاپ : چاپخانەی منارە – هەولێر (٠٧٥٠٤٤٥٦٢٩٧)

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٨١٦)ی ساڵی ٢٠١٠ی دراوەتێ

ئافرەت لە ڕوانگەی عەلمانی وئاینی دا

## سەرەتا:

**بزوتنەوەی ئافرەتان :** بەپێی فەرهەنگی جیهانی نوێ - کە لە هەناوی ڕۆژئاواو مەدرەسەی سەرمایەداری و ڕابوونی ئەوروپی دەرچوە - یەکەم جار مافی ئافرەت لە جاڕنامەکەی خاتوو(ئۆلیمپ دی جۆجیە)ی فرنسی سالی ١٧٩١ ی هاتوە، کە لە١٧ مادە پێك هاتبوو[١]، یەکەم کتێب لەو بارەیەوە خاتو(سیمۆن دی بۆفوار) بە ناوی (**الجنس الثانی**) نوسراوە[٢]، لە کۆتایی سەدەی ١٩ جم وجۆلێك لەئەوروپا وئەمریکا دروست بوو خۆی لە نارەزایی وداوای مافی ئافرەتان نواند ، چەندین کۆڕو کۆنگرە کرا، دوای لەگەل گەشەی مارکسیەت و شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ زۆر گرنگی بەو کێشەیە درا ، لەنیوەی سەدەی بیستەم ئەو ڕاپەڕینانە سەرتاسەری ئەوروپا- لەئیرلەندا تا ئوسترالیای گرتەوە ،داوای ڕێز گرتن وماف و بەشداری ژیانی کۆمەلایەتی وسیاسی دەکرا ، لە بەریتانیا ناوی (میسز پانك هریست) وکچەکانی بەو بزوتنەوەیە ناوزەد دەکرا[٣]،یەکەم جار لە ویلایەتی وایۆمینگی ئەمریکی سالی ١٨٦٩مافی دەنگدانیان پێ درا ،بەلام تا سالی ١٩٢٠ ئینجا دەستوری فیدرالی ئەمریکی ئەو مافەی تۆمار کرد ، لە نیوزلەندا سالی ١٨٩٣،لە ئوسترالیا لە ١٩٠٢،نەرویج وسوید ودانیمارك لە ١٩١٣،،کەنەدا١٩١٧،بەریتانیا و نەمساو پۆلەنداو مەجەرو چیکۆسلۆڤاکیا وروسیا ١٩١٨ ، بەلجیکیا ١٩٤٥، هەرچەندە فرنسا سەرمەشقی عەلمانیەت وفەرهەنگی نوێی ئەوروپی بوو بەلام تا سالی ١٩٤٦ مافی دەنگدانی بە ئافرەت ڕەوا نەدەبینی ،دوای لە مادەی (٢)ی دەستوری سالی ١٩٥٨ بە فەرمی تۆمارکرا ،لە نێو عەرەبیش لەو جۆرە بزوتنەوانە یەکەم جار لە میسرسەری هەلدا ،لە سالی ١٩٠٨ کۆمەلەیەك دروست بوو بەناوی (جمعیە حقوق المرأە) ، هەریەکە لە هودا شەعراوی وقاسم ئەمین بە پێشڕەوی بزوتنەوەی ئافرەتانی عەرەب هەژمار دەکرێ ،یەکەم خۆ

---

[١] لەمادەی یەکەم واهاتوە : تتضمن الوثيقة في المادة (١) ((أن المرأة ولدت حرة, وتحيا حياة مساوية لرجل في الحقوق, ويجب أن يقوم التميز الاجتماعي فقط على المنفعة العامة)) .

[٢] تێبینی ئەوە بکە نوسیومانە یەکەم کتێب لەو بارەیەوە ،ئەگینا بە دەیان کتێب لە بارەی ئافرەت لە فقهی ئیسلامیدا هەیە ،پێش هەمو ئەوانە ئیبن روشد داکۆکی لە مافی ئافرەت کردوە ,

پێشاندانیان لە ٢٠/مارس/ ١٩١٩ کرد ،دوای لە ١٩٢٤یەکێتی ئافرەتانی میسریان دروست کرد، دوای بە فەرمی بەپێی مادەی(٣١ و٦١)ی دەستوری میسری ١٩٥٦مافی دەنگ ویەکسانیان پێ درا.

لە سەر ئاستی جهانی و یاسای نێو دەولەتی یەکەم جار لە ڕێکەوتنامەی لاهای ١٩٠٢ باس لە کێشەکانی ئافرەت کرا ،دوای لە ڕێکەوتنی (قەدەغەی بازرگانی بە ئافرەت)لە ١٩٠٤ و١٩٢١و ١٩٣٣،دوای لە ڕێکەوتنی(مافی سیاسی ئافرەت ) لە ١٩٥٢،بڕیاری ژ:١٩٢١ی رۆژی ٥/کانونی یەکەمی/١٩٦٣ی نەتەوە یەکگرتوەکان، ئینجا ڕێکەوتنی (قەلاچۆی جیاوازی دژی ئافرەت —سیداو) لە١٩٧٩،دوای ڕێکەوتنی (دەرکێشانی توندو تیژی دژ بە ئافرەت )لە١٩٨٣ .. تا دەگاتەکۆنگرەکانی مکسیکۆ لە ١٩٧٥ وە کۆبنهاگن لە١٩٨٠ و وپکین لە ١٩٩٥..،لە چوارچێوەی جاڕنامەکانیش لە مادەی (١٣ -لقی ب) ی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان و جاڕنامەی (مافی مرۆڤ-بەتایبەتی مادەی٢ ومادەی ١٦)، هەروەهاجاڕنامەی(میساقی مافی ئافرەت)لە نەتەوەیەکگرتوەکان لە١٩٥٤/٧/٧ ، لەخودی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکانیش جاڕی یەکسانی مافی ئافرەت وپیاودراو بەند کرا بە مافی چارەنوس[٤] ،دوا هەنگاویشی قەلاچۆی هەمو جۆرە جیاوازی ودژایەتیەکی نەژادی ئافرەت لە خولی (٥٤)ی نەتەوەیەکگرتوەکان لە١٥/ئۆکتۆبەر/١٩٩٩ جاڕدرا کە لە ٢١مادە پێك هاتبوو.

بەو شێوەیە بزوتنەوەی ئافرەتان پەرەی سەند، دوای وەرچەرخا بۆ بزوتنەوەیەکی فکری تیایدا داوای یەکسانی تەواوی پیاو ئافرەت کرا ، بەوەش نەوەستا تا ڕادەیەك بەرەو بزوتنەوەیەکی دەمارگیری وا چوو کە ئافرەت بە ئەسل ودژ بە پیاو پۆلین بکرێ ،بەو شێوەیە بەشێك لەو بزوتنەوەیە بوە بزوتنەوەی مێینە (فیمینیزم) و بوە بەشێك لە شارستانی نوێ کە یارمەتی جیهانی ئیسلامی لێ کەمە ، ئێستا لە ژێر باری سیستەمی نوێی جیهانی ئەو بزوتنەوەیە سارد بوویتەوە ، تەنانەت لە ( سێ ئاڕستەکەی نێو کۆنگرە پکین)ئاڕستەیەکیان بە ڕابەرایەتی نەجات خانی پاکستانی ڕای وابوو کۆتایی بە بزوتنەوەی ئافرەت بهێنرێت ،لە هەمان کۆنگرەدا چالاکوانی پۆلەندی( ئەجنیشکا گراف ) توێژینەوەیەکی بەناوی ( مفارقات الکرونولوجیا النسویە فی بولندا المعاصرە ) تیایدا هاتوە کە

---

[٣] بڕوانە : السمحرانی - القاموس السیاسی ص٤٧٠

[٤] بڕوانە دەقی بڕیاڕی ژ:١٥١٤ی خولی ١٥ ی ئەنجومەنی ئاسایش ١٤/دیسمبر/١٩٦١

پەرچەکردار وادژی بزوتنەوەی ئافرەتان دروست دەبێت وپێشنیاری دەستکاری لە بنەماکانی کرد کە زیاتر مرۆڤایەتی بگرێتەوە ، ئیستا زیاتر قەتیس ماوە لە جیهانی سێیەم و وولاَتانی دیکتاتۆر هەم لەوێ مافی ئافرەت لەگەل مافی پیاو نەماوە هەم بە ڕوالەتیش زۆر داکۆکی لە سەر دەکرێ ، ئێستا لە وولاَتانی عەرەبی ولە دەسەلاَتی کوردیش زیاترین ڕێکخراوو سەنتەر و ناو هێنانی ئەوانە کەچی زیاتر لە لای خۆیان دەچەوسێتەوە ، تەقەلا دەدەین زۆر بە کورتی خوێنەر سەرەتایەك لە بناغە فکری وفەلسەفی وسیاسی ئەو کێشە یە بگات .

*** *** ***

لە زۆربەی کتێب و نوسراوەکان سەبارەت بە ئافرەت ئەوەی لێ بەدی دەکری کەئافرەت لەلایەن پیاوەوە زۆرداری لی دەکرێ ،یەکسەر ئەوەدەنگەشی لەگەل بەرز دەکرێتەوە کەدەبێت یەکسان بن لەگەل پیاو، لێرەدا بەو ڕووکارە نابین و چارەسەری کێشەکەشی بەو جۆرە نابینین و لەزۆربەی بۆچوونەکان پێچەوانەین . لەئەنجامی دیراسەکردن کەلە دوایدا دەردەکەوی ئەو داوایانە نەك هەر ناکرێت و زەحمەتە بەلکو جۆرە زۆرداریەکی ترە لەئافرەت ،بۆیە دیسان نووسەران و لێکۆلەرەوەکانی خۆمان بە لاسایی کردنەوە لەدەرگای ئەو کێشەی داوە ،بەو جۆرە ڕاستی کیشەی ئافرەتان پیێ دەست نیشان نەکراوەو چارەسەرە کەشیان نەزانیوە ،چونکە ڕاو بۆ چوونی ئەو نووسەرو سیاسەتمەدارانەی کەئیستا لەکوردستان لەبارەی ئافرەت دەنووسن و دەیلێن زۆر بە زەقی بێ بەرپرسیاریەتی پێوە دیارە، هۆکارێکیشە بۆ ئەو کارەساتانەی ڕووبەڕوویان دەبێتەوە لە سوتان وکوشتن وئەزیەت دانیان ، نازانن ئاخۆ ئەوە خزمەتی ئافرەت دەکا یان نا ؟ خزمەتی کۆمەلگەو کیشەی کورد دەکا یان نا؟ .. زۆربەی ئەوانە لەئەسلدا مارکیسزمانە پەروەردەی فکری کراون، ئنجا ئیستاش بە بیری ڕۆژ ئاوای ومدرسەی لیبرال دیموکراسی و سەرمایەداریش کاریگەر بووینەوە، بۆیە ئایدۆلۆجیاو نووسینەکانیان ئاوێتە یە کە بە خۆشیان پی یان لیك ناکریتەوە ،پیك هاتووە لەهەموو مەدرەسەکان ،بۆیە ئیمە یەکە یەکە لێیان قوول دەبینەوە ، واچاکیشە بگەڕێینەوە سەرسەروچاوەکانی داینمۆی فکری ڕەوشەنیرانی و نووسەرانی کوردستان ، کەمدرسە فکری و سیاسیەکانی جهانیەو بریتی یە لە :

١- مدرسەی شیوعیەت ٢- مدرسەی سۆشیا لیسنەکان ٣- مدرسەی لیبرال دیموکراسی ٤- مدرسەی ئاین .

**چەند سەرنجێك** ئەو داواکاریانە لە بنەچەدا ڕەوایی خۆی هەی بەلأم سورڕەددریٚ وبەلایەکی تری مەترسیدار دەڕوا، لە بەشێکیان دا شۆڕش و یاخی بوونە لە نێو خێزان وکۆمەلگەو وسروست وگەردوونیش،تەنانەت دژ بە ئافرەتانی تری تەمەن پیر،دژ بەدایك وخوشك وزۆرلای تری بیٚ تاوانە ،خۆی لە قەرەی بزوتنەوەیەکی فاشی دەدا ،بە تایبەتی لەو کاتانەی تەنها داواکاریەکان قەتیس دەکرێنەوە لە کچە گەنجەکان ی تەمەن نێوان ١٦ تا٢٨ سالی،ئەی مافی مندال مافی دایك مافی پیرێژن ..ئەوە جۆرە ڕەگەزپەرستیەکە مەبەستەکە دیارەو پیاوانی فکر فاشی پێیان دەکەن .

**کیٚ دەیوروژێنی؟**

ئەوەی تێبینی دەکرێت لەزۆربەی نوسینەکاندا ئەوانەی کێشەی ئافرەت بەرز دەکەنەوە پیاون،یان ئەگەر ئافرەتیش بن پیاویان لە پشتە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ ،بەو شێوەیەش زۆربەی ڕێکخراوە ئافرەتیەکانیش پاشکۆی حزبێکن کە پیاو بە موتلەقی بەسەری زالە، باشە دەبێت دادگەری ئەو نوسەرو پیاوانە تا ئەو ڕادە چووبێتە پێش (لە خۆبوردوانە) بۆمەسەلەکان چووبن و بلێن ئیمە زۆر دارین و وەرن شۆرشمان لە سەربکەن ! ئەو هەنگاوە خۆی دیسان زۆر داریەکی ترە، کە خۆیان کردۆتە نوێنەری ئافرەتان،وەك چۆن: زۆردارانیش خۆیان کردۆتە نوێنەری چەوساوەوپرولیتارەیەکان ،دەولەمەندی زانا خۆی کردۆتە نوینەری هەژار , داگیرکەر خۆی کردۆتە نوێنەری گەلانی داگیر کراو, لە هەموی سەیر تر جارێکیان بارزان تکریتی ببوە نوێنەری عیراق لە کۆنگرەیەکی مافی مرۆڤ !، بریا ئافرەتیش وەك کرێکارەکانی ئەلمانیای سەردەمی (ئەریش هونیکەر) هاواریان بەڕووی ئەو وەزیرە بکردبایەو کاتی ووتی من نوێنەری ئیوەم و ئەوانیش بەیەك دەنگ ووتیان ئەگەر نوێنەری ئێمە بوایە لەناو ئێمە دەبووی، لەکارگە لەگەلمان دەبووی و مندالت لەناو مندالی ئێمە بەرووتی و برسی دەبوو .. ! بریا ئافرەتیش بەیەك دەنگ بەو نوسەرو پیاوانەی دەگوت ئەگەر ئیوە نوێنەری ئێمەن وەك ئێمە دایك دەبوون ،ئایە ئەو نووسەرانە خۆیان لەناو سنوری دەسەلاتی خۆیان چەندیان لە و بۆ چوونانە جیٚ بەجیٚ کردووە , دەبا پیشرەوبن لەو ئەزموونە ئەگەر باوەریان پی هەیە ئافرەتەکانیان ئازاد بکەن بەو ئازادیەی کەخۆیان باوەریان پی هەیە، بابزانین ئەنجامی چۆن دەبیت ؟ تا هەموومان چاوی لی بکەین , یان ئەو جۆرە پیاوانە چەندە باوەڕیان بە مافی ئافرەتێکی پیر هەیە !؟، بەلام بەداخەوە ئەو نووسەرانە نەلە ماهیەتی ئەو کیشەیە گەیشتونە نەچارەسەریەکەشی دەزانن چی یە .

هەندی لەنوسەران وئافرەتەکانیش بەگەر ڕاپێچی ئەو نووسەرە پیاوانە کەوتوون کە هەندێکیان رەخنەکانیان لەجێ یە بەلام هۆیەکانیان دایتە پال (سیستەمی باوکایەتی)کە دەبوایە هۆیەکەی لەسیستەمی کۆمەلایەتی یەکە ومدرسە فکریەکان و دەستورو عادەت و نەریتە کۆمەلایەتیەکان بگرتایە .

**چۆنیەتی گەلآلەکردنی کێشەکە**

بەشی زۆری ئەو نووسەرانە هەتا مدرسە فیکریەکان و رێبازە سیاسیەکانیش کیشەی ئافرەت بەکیشەیەکی سەربەخۆ دەزانن بە جیا لە گیرو گرفتەکانی کۆمەلایەتی , هەروەها جیاوازی نێوان پیاوو ئافرەت دەگێرنەوە تەنها بۆهەل و مەرجە کۆمەلایەتیەکان، بۆیە جارەسەرەکانیان بەزۆری بەبریارو چەسپاندنی ئەو یەکسانیە لە نوسینەکانیدا دەدۆزیەوە ، دیسان بەهەلە داچونێکی ترە ، هەرچەندە لەدوایدا لەگەل ئەو بابەتە زیاتر بەیکدا دەچین بەلام ئەوە روون دەکەینەوە .. ئەگەر ئەو مەسەلەیە بەوشیوە بۆچوونانە بوایە دەبوایە ئیستاو چ لەقولایی میژوو بزوتنەوەیەکی ئافرتانمان بدیبایەوە لە پیاوان هەلستانایە وەك چۆن بزوتنەوەی سپارتاکۆسی بەندەکان ڕوویدا، یان حزبیکیان دەبوو، لەوەش زیاتر وەك زانستی میژوو دەبوایە ئافرەتان زمانێکی جیاشیان لەگەل پیاوان هەبوایە ،ئیستا ئەو ریکخراوانەی بەناوی ( یەکیتی ئافرەتان ...! )بە لایەن کەمەوە لەولآتی خۆمان کلکی حزبێکەو بەدوای پیاوان کەوتوون و دروست کراوە، ئەگینا بۆچی چەند حزب هەیە ئەوەندە یەکیتی ئافرەتان هەیە لەگلیدا. ، بۆیە کیشەی ئافرەتان بریتی نیە لەجیاوازیەکانی لەگەل پیاو ، بەلکو بەجمکی و خورسکی ئەو جیاوازیانە هەیە، بەهەردوولایان " یەکەیەکی" تیروتەسەل تەواو دەکەن ، ئەسلی کێشە کە لەوە سەر هەلدەدا کاتی ئەو جیاوازیانە بکرێتە جیاوازی مرۆڤایەتی بەنوقستانی بژمیردرێ ،بەشداری چالاکی ژیانیان پی نەکەن وەك تابعیکی سانەوی و سەلبی حیسابی بۆ بکری، کەلە زۆر لەبۆچوون ونەریتوهەندێ ئاینیشدا رەگی داکوتاوە[٥]. بەو شێوە لەنگی لە چۆنیەتی تەرحکردنەکە بوویتە هۆی خواستەکانی مافی ئافرەت بەلێلی بمینێتەوە کەچیان گەرەگە ، ئیحتجاجەکەیان دژ بەکێ یە ، دژ بە:مێردەکانیانە ، بە ئاینە بە نەریتی میللەتە کەیە بە یاساو دەستوری وولاتەکەیە ...دیار نیە چی دەوێ .

**چۆنیەتی چارەسەری**

---

[٥] لە تەورات لە ئایەتەکانی ٢٢ تا ٢٥ لە سفر التكوين ٢ باس لە دروست بوونی حەوا دەکا لە پەراسوی ئادەم و لە پێناو پیاو .

بەشی زۆری چارەسەری ئەو کێشەیە لە لایەن نووسەرو ریبازە سیاسی مدرسە فیکریەکان دا بریتیە لە داوای یەکسانی ئافرەت و پیاو کردنە لەهەموو بوارەکانی زیندەگی و کۆمەلایەتی و مەدەنی کە رزگار بوون ئافرەتی تیا دەدۆزنەوە ،بە هەڵە زاراوەی (جندەر) و(دایك سالاری)بەکاردەهێنن. بەلام بەزوریش ئەورێگا چارەیان روون نەکردۆتەوە (بیجگە لە مارکیسزم ) چۆن ئەو یەکسانیە دێتە دی..! هیچ نمونەیەکی واقعی لەمیژووشدا نیە کە ئافرەت و پیاو لەومەجالانە بەیەکسانی بۆساتیك دیترابن ، هەرچەندە لەرووی تیوری (کەبێ مەسئولیەت ترە ) دیسان نەیان توانیوە موزاعەفاتە کۆمەلاتیەکانی ئەو یەکسانیە چارەسەر بکەن، بیجگە لەوەی رەگی ئەو نایە کسانیە هەر لەهۆکارە کۆمەلایەتیەکان نیە، بەلکو قولترن بۆناو رووە فسیولوجی و بایولوجی هەتا کیمیای و فیزیایش شۆڕدەبێتەوە، .... جا نازانین ئەو یەکسانیە چۆن بە خەباتی سیاسی دێتە دی ، ئەوە پیویستی بەدەست کاری کردنی یاساکانی سروشت و هەندیکی گەردوونیش هەیە، بەلام باجارێ هەر لەچوار چیوەی کۆمەل بمێنین و دەقاو دەق بێینە سەرخیزان کەشانەیەکی زیندووی کۆمەلایەتیە ، مادام لەچارەسەریەکان دا خیزان بمێنێت (چونکە لەچارەسەری مارکیسزم دا خێزان نامێنێت )، ئایا دەشێت دوو سەرکردەی خێزان هەبێت ، سەرنج بدەن چ لەسروشت چ لەژیاندا چ لەکۆمەلدا هیچ سیستەمێك هەیە دووسەرکردە دوو بەڕێوەبەر و دووشێوە ڕێنمایی ... هەبێت ، سیستەمی بوونەوەر هەر هەمووی پێکهاتووە بەشێوەی (هەرەمی) و ناوەندی ، لەچ وولاتێك دووسەرۆك کۆمار هەیە ،نمونەی نوێشاز لە ئۆرگوای لە نێوان (١٩١١ تا١٩١٥) ٩کەس پێکەوە سەرۆك بوون[٦] ،تا ئیستاش ئیش وکارەکانیان وەك نوکتەی سیاسی وياسايي باس دەکرێ ،لەو وولاتە پان وبەرینە نەگونجێ ئەی چۆن لەناو خێزاندا دووسەرۆك دەگونجێت ، هەردەبێت یەکیان بن و ئەو کاتیش ئەو یەکسانیەو هاوسەنگیە تیك دەچێتەوە مادام یەکیان فەرمان ڕەوا یەکیان فەرمان وەرگر بیت . کەواتە ئەو یەکسانیەی ئافرەت و پیاو لەژێر سیستەمی کۆمەلەیەکی خیزان مەحالە، وەك مەحالەکانی ناو سروشت (وەك هایزنبرگ و ئەخیل و سولەحفات..مەحال ئەوەندە زۆرە ناژمێردرێت) ، بۆیە مارکیسزم لەچوار چیوەی (سیستەمی خیزان ) دا ئەو یەکسانیەی پێ نەدۆزرایەوە ، بریاری هەلوەشانەوەی خیزانی داوە ، بۆ ئەوەی هەر کەسێ لەخۆی بەرپرسیار بیت و فلسەفەی (individual) لەوە سەری هەڵدا،لە ڕاستیدا بیرو ڕای وزاناو فەلسەفەومەدرەسەکان تریش لەبارەی ئافرەت یان زۆر سەرەڕۆو سادەیە یان ئەوەتاکەقوول

[٦] بڕوانە : مەوسوعەی جودی ل١١١

بوویتەوەحەتمەن بەجۆرێك چۆتەوە سەر ڕیشالەکانی مارکسیزم لەو بارەیەوە ،بۆیە لەبارەی توێژینەوە لە کێشەی ئافرەت هەلوەستەی هەرە گەورە لە سەر مارکسی دەکرێت ، بەو شیوەیە لەمارکیسزمدا دەچینە نێو ڕاو بۆچوونی مدرسە فیکریەکان بۆ ئەو مەسە لەیە .

تێبینی : ئێمە باسی مەدرەسەکان و هەلسەنگاندنیان دەکەین ،ئەوەش زۆر دوورو درێژە، بۆیە دەبێ خوێنەر ئاگای لەوە بێت کە تەنها ئەو لایەنانە لەو مدرسانە باس دەکەین کە پەیوەستە بە بابەتەکەمان —کە کێشەی ئافرەتە .

# بەشی یەکەم

## کیشەو چارەسەری ئافرەت لەڕوانگەی مارکیسزم

فەلسەفەی مارکیسزم جیا لەهەموو فەلسەفەکانی تر هەموو کێشەو دیاردە کۆمەڵایەتی وتاکیانەکان لە زانستی و چینایەتی و سیاسی و نەژادی و نەتەوایەتی و جنسی و ئاینی.... بۆ هۆیە ئابووریەکان دەگێرتەوە ، ئەو بنچینە ئابووریەی ناو ناوە ( ژێرخان )، بەو شیوەیە کیشەی ئافرەتیش بە شیکە لەکیشەی چینایەتی و چارەسەریەکەشی هەر لەوی دەدۆزیتەوە ، بۆیە پیویستە لەبنچینەکانی ئەو مەسەلەیە کەمێك بکولینەوە .

### ژێرخانی ئابوری و کێشەی کۆمەلایەتیەکان

لەکۆنەوە زۆر مدرسە فیکری و فەلسەفی لەلیکدانەوەکانیاندا هەولیان داوە چەند روویەك (کە نیمچە سەربەخۆی — استقلال نسبی ) یان چەند عاملێك لەیەك قاوغ و عامل کۆبکەنەوە ، هەر لە زەمانی مدرسەی یۆنانی کۆن و هەتا ئیستاش بەرداومە ، دیارە لەسەر مەسەلەی جم و جۆلی کۆمەلایەتیەکان و ئەو هۆکارانەی کە ئادەمیزاد بەتاك و بە کۆمەل هەلدەسورینی دوو بەشە : یەکەمیان عاملە ناوەکیەکان و بریتیە لەلایەك لە عقل (فکر — ئەخلاق - راستی — مرۆڤایەتی ... هتد ) لەلایەکی ترەوە نەفس (خۆپەرستی — کیخوایەتی — زال بوون — خۆبە تەواو زانی ) ئەو بەرەنجامە لایەنیکی بەهیزی شەخسیەتی هەر مرۆڤیك پیك دینیت .

دووەمیان :- هۆکارە دەرکیەکان کە هەندێکیان سەربەخۆن و هەندیکیشیان لەڕێی ئەو عاملە ناوەکیانە کاری خۆیان دەکەن ،کە بریتین لە عاملەکانی:( خوێن وخزمایەتی ، ئابووری ، چینایەتی ،

نیشتمان ، جنسی ، نەژادی. .) بەشێکیشیان بەهاوبەشی لەگەل یەکەم کاردەکەن .جاهەر زانایەك کەلە بواری پسپۆریەکەی قول دەبێتەوە، لەو بوارە دەروانێتە چالاکیەکانی ئادەمیزاد و لەو عاملە دەیدۆزیتەوە ، بۆنمونە (سیکموند فروید) وە مدرسەی جنسی کەپسپۆرن لەدەرون ناسی هەموو ئەو جمو جۆلانەی مرۆڤ لە چالاکی رۆژانەی لە هات وچۆو سەردان وکارو بەرهەم وئاشتی وناکۆکی وچونە مزگەوت وکنێسەو فەرمانگەو تاقیگەی زانستی.. دگێڕنەوە بۆ هۆکارە سایکو لوجیاکان کەدەقاو دەق بۆ (پالنەری جنسی )،دەلێن هەمو ئەو جم وجۆلانە لە ڕووکەش ئامانج ومەبەستی جیاجیا دەردەکەویّ بەلام لە ناوەڕۆك وماهیەتدا مەبەستەشاراوەکانی پالنەری جنسیە ، بلیخانوف کەپسپۆر بوو لەبواری سروشتی ئەو جم جۆلانە دەداتە پال کەش و هەواو کاریگەری جوگرافی ،هەر بەو شیوەیە (ئەرنولد تویینی ) دەیداتە پال(التحدی و الاستجابه ) ، دۆهرنگ (بۆچەوسانەوە ) هیگل بۆ (سلبیات) کارلیل (بۆپالەوانەکان)...هتد، هەرچی مارکس و مارکیسزم کەخۆی پسپۆرێکی ئابووری ناس بوو ،هەموو پەیوەندیەکانی کۆمەلایەتی واهاتە بەرچاو کە لەئەنجامی پیویستیە ئابووریەکانن ، وەك ئەنجلس دەلیت (مارکس بۆیە ئەو ڕایەی هەیە لەبەر هۆیەکی سادە و ساکار، ئەویش ئەوەیە پیش ئەوەی ئادەمیزاد بیر لەسیاسەت و دادگەری بکاتەوە پیویستی بەخواردن و پۆشەك و هێلانە هەیە ) ، بەو شیوەیە کاریگەری ئابوری یەك لاکە رەوەیە ، بەکورتی لێرەدا نامانەوی لەو بابەتە دوورو دریژە بپێچینەوە ئەوەندەمان دەویت ، کە پەیوەندیدارە بە بابەتەکەمان .

لەو دەروازەدا دەچینە ناو مەسەلەی ئافرەت لەروانگەی پەیوەندیەکانی ئابوری کەرەنگ دانەوەکەی سەرخانی بریتیە لە (ناکۆکی چینایەتی ) ،بۆ ئەو مەسەلەیەش هەلویستی مارکیسزم لە لایەن ئەنجلس لە کتێبی (اصل العائله والملکیه الخاصه والدوله)[٧] دا ڕوون ەکراوەتەوە ، کەپشتی بە کتێبی(المجتمع القدیم -لویس مۆرگان١٨٦٦-١٩٤٥ )[٨]بەستبوو ،لەو کتێبانە بۆچونەکانی مارکسیەتی بە ڕوونیدا تیادا گوزارش کراوە کە لە میژوودا چۆن مافی ئافرەت کەووتووە.

**میژوو .... ئافرەت**

بەرای مارکسیزم کۆمەل لەرەوتی تەمەنی خۆیدا پینج شێوە (رژیمی کۆمەلایەتی ـــ ئابوری )

---

[٧] ئەو کتیبەش هەر مسوودەی کارل مارکس بوو دوای ئەنجلس تەواوی کرد ،چەند کتێبێکی تریش هەیە لەوانە: العائله المقدسه-مارکس،علاقه المراه بالرجل ...هتد

[٨] ئەنجلس ومارکس زۆر بەو کتێبەی مۆرگان کاریگەرن ، وەسفی بە ئاستی (اصل انواع)ی داروین دەکەن ،یەکەمیان لە زانستی کۆمەلایەتی ودوەمیان لە زانستی بایۆلۆجی .

بەخۆوە دیوە ،کەلە ١-کۆمەلگەی سەرەتایی دەست پی دەکات٢- ئنجا بەندیاتی٣- دەرەبەگایەتی ٤- سەرمایەداری ٥- سوشیالیزم ... دەلێن وا بەرەو قۆناغی (شوعیەت ) دەرۆن، کەزۆر لە بنەماکانی ئابووری لە ( کۆمەلی سەرەتایی ) دەچێت، بەلام لەسەر بنچینەیەکی نویٚ ،ئەوجۆرە بۆچوونە بەگشتی پیٚی دەوتریت( **تطور خط مستقيم** – پەرەسەندنی ڕیٚك ) ، ئەوەش پاساوی هەرسیٚ یاسای فلسفی دیالیکتیکە بەتایبەتی یاسای (نەفی ئەلنەفی). لەراستیدا زانایانی (پەرەسەندنی- **تطوری** ) کۆمەلایەتی وەك ( لوپۆك . پاخوفن – مالکینان – باستیان – جیر – والکیز ..)، بەتایبەتی (مۆرگان) لەکتیٚبی (المجتمع القديم- (system of eans angaimty and aftarniy ) هەمان بۆچونیان هەبوو ،چونکە سەردەمی ئەو بۆچونانە گونجاو وباوی تیۆری پەرە سەندن بوە ،کە لەلایەن (داروین ١٨٠٩-١٨٨١ ن ) پیشتریش لەلایەن (لامارك ) دارێژرابوو، لەو تیۆرەدا کۆمەل لە رەچەلەکدا لەو ئادەمیزادانە هاتوون کە باپیرانیان گۆریلاوئاژەل بووە ، بیرۆکەی نەبوونی رژێم و خێزان و میری و یاسا و خزمایەتی و ئاینی ... لەوە هاتوە،هەندیٚ زانیاری دەگمەنی تر لە ئەنسرۆپۆلۆجیاو میٚژوودا لە بارەی ئافرەت بوویتە پالپشتی ئەو تیۆرانە ،هەندیٚکی لیٚ هەلٚدەبژێرین :

+سەرۆك عەشیرەتی (دورگەی بلیۆ)هەمو ئیشیٚکی دەگەڕایەوە لای ئەنجومەنیٚکی ڕاویٚژ کە لە پیریٚژنانی ناوچەکە پیٚك هاتبوو .

+جاران ئافرەت بە هیٚز تر بوە لە پیاو بە پیٚچەوانەی (فقهی قەوامە) ،سەرۆك عەشیرەتی (تچاپۆ )دەلیٚ:ئافرەت دوو هیٚندەی پیاو باری هەلٚدەگرت ،خوا بۆ کاری قورسی دروست کردوون .

سەبارەت بە(گرنگ نەبوونی پەردەی کچیٚنی بۆ بوونی کیانی خیٚزان) دیسان پالپشت کراوەتە سەر زانیاریەکی دەگمەن ،دەلێن: لە خێلەکانی (کامشادال)ئەگەر زاوا بووکی بە کچیٚنی بۆ بهاتبایە مالٚەوە جویٚنی بە دایکی دەدا [٩]،چونکە مانای خویٚن ڕشتنی ئەفرادی عەشیرەتەکەی بوو، ئەوەش حەرام بوو ، دەلێن تا ئەو دواییەش لە فیلیپین فەرمانبەریٚکی حکومی بەو کارە هەلٚدەستاو پێش ئەوەی کچەکە بگاتە لای زاوا ئەو فەرمانبەرە پەردەی کچیٚنی بۆ لادەدان و پاداشیشی وەردەگرت و لە نان خواردنیش خواردنیٚکی تایبەتی و باشتری بۆ دەهات لە کاتی ئاهەنگی بووك گواستنەوە

---

[٩] بۆچی بەدایك چونکە گوایە باوك نەبوە دایك سالاری بوە .

...،واتە پێش تر لە سەردەمی (دایك سالاری )پەردەی کچێنی بەلاٌبوو دوای لە سەردەمی (باوك سالاری )بوە سەروەری ..

هەرچەندە ئەو بۆ چوونانە پڕیەتی لە (**متناقظات**) بەلاّم ببوە بنچینەی تیڕوانینی ئەو سەردەم ، لەنوسەرە میانڕەوەکانیش بەدی دەکرێت، بۆنموونە (جورج حنا ) وەصفی سەردەمی کۆمەلی سەرەتایی دەکات دەلێت: ( ژیانی ئەو سەردەم وەك ئاژەل بوو نەرژیمێك هەبوو نە رێسایەك )([10]) ، لەهەمان لاپەرە دەلێت دایك دەسەلاتی یەکەم بوو لەخێزاندا ، هەروەها د کمال مەزهر دەلێت لەوکاتی لەسەر هیچ ئاینێك نەبوون و خواوەندو پەرستنیشیان تەنیا دایکیان بوو[*] ،بە گشتی زانست بەو ڕووکارە بوو ،تا ئیستاش کاریگەری ماوە هەر بە نمونە لە ڕاڤەی (ئەندازەی جینەکان) هاتوە :کشت وکال پێش ١٠٠٠٠سال دەستی پیّ کردو تەنهاش ئافرەتان جووتیار بوون[11] ،تەنانەت تا ئەو ساتەش (مەوسوعەی بەریتانی )ویکبیدیای بەناوبانگ لە مادەی (مافی ئافرەت) باس لە دەسەلاّتی دایك سالاری دەکا لە کۆمەلگەی سەرەتای ، بەپێی ئەو ڕوانگەیە بەگشتی کۆمەلی سەرەتایی (مشاعی) کۆمەلێك بووینە پەیوەندی ئادەمیزاد بەیەکەوە زۆر لاواز بووە، هەریەکە ژیانی ڕاوچیەتی بۆخۆی بووە، چ پیاو چ ئافرەت کەس لێپسراوی کەس نەبووە، دوو غەریزەی بنچینەی لەکاردا بوو: یەکیان خواردەمەنی و دەوومیان جنسی ،وەك بەروونی لەنووسەرە خۆمالیەکانیش رەنگی داوەتەوە ، بەرای (سامی عبداللەکە- قوتابیەکی رێبازی ئەو مدرسانەیە )دەلێت (..هەردوو غەریزەی سەرەکی خواردەمەنی و جنسی پالنەری ئادەمیزادی سەرەتایی بووە)([12])،خواردەمەنیەکەی بەهۆی راووچیەتی و جنسیەکەشی بەهۆی رفاندنی دەست کەوتوە ،هەروەك دەلێت (... هەر ئافرەتێك دەربکەوتیبایە یەکسەر لەلایەن پیاوەوە ڕفێنرابوو ) ،ئەوەش هەمان ڕای(جۆن ماکلنین)ە کەلە کتێبی (الزواج البدائی) هاتووە، هەروەها ڕای داروینیش کە لە کتێبی (اصل الانواع) باسی کردوە ، بەو شێوەیە خێزان و یاساو مرۆڤایەتی نەبوو ،منالان بەدایکیان دەناسران و باوك دیار نەبوو چونکە ئافرەتەکە تاسەر دیار نەبوو لەلای کێیە ، ئەو قۆناغە یە پێی دەوتریّ دایك سالاری ، یەکەم کەس ئەو ناوەی داهێنا (باخۆفن

---

[10] - قصە الانسان ص ١٥- ١٦

[*] هەرلە چوار چیوەی قسەکانی خۆی ناکۆکە باسی خێزان دەکاو باسی رژێم دەکا .... ئەی خێزان ناکا رژیم ئینجا دەلیت دایك پەرستڕا بوو ئەی ئەوەش ناکا مرکزیەتیك کە مانای رژێمە ، لەهەمان کاتدا واتای ئاینیشە .

[11] الموسوعە الصغیرە رقم ١٥٧- الهندسة الوراثية ج١ ص١٢

[12] سامی عبداللە -نشاط الجنسی ص٩

١٨١٥-١٨٨٧)ی سویسری بوو لەکتێبەکەی(حق الام)[١٣] ،قۆناغێکی دوور و درێژی بوە، ئامرازی بەرهەم هێنانی بریتی بوو لەدەست و بازوو ، بەرای مارکیسزم لەو قۆناغەدا ئافرەت و پیاو یەکسان بوون هەریەکە پایەی بەرهەم هینانی سەربەخۆی هەبووە،لەو کاتی بەدواوە ئافرەت سەربەخۆیی وئازادی لە دەست داوە .

تا ئێرە ڕای مارکسی ومادیەکانی ئەو سەردەم بووە ..

هەر لە نزیکەوە پڕیەتی لە ڕای پێچەوانەی یەکتر ،لەلایەك دەلێن هەر ئافرەت ببینرابوایە لەلایەن پیاوەوە دەرفێنرا ،ئەی کوا ئازادیەکەی ؟ ئەی کوا سالاریەکەی؟ چۆن ئافرەت جووتیار بووینە؟ کەی ئەوە ئافرەت سالاری بوە ؟.. لەگەل دەیان پرسیاری تر دوای هەلۆەستەی لەسەر دەکەین .

ڕوانگەی زانستیانە تا ئەو ساتەش بەو تیۆرانەی سەروو کاریگەرە[١٤]* ، بەو شێوە لایەنگیریەی ئایدیۆلۆژیای مادی دەکاو کۆی ئەو مێژوەی بەو شێوەی خوارەوە بەکورتی گوزارش دەکا:

سەرەتا دەسەلأت لە دەست ئافرەت بوە ،دوای ئینقلابی لەسەر کراو بێ ماف وچەوسایەوە بوە ،هیچ شەریعەت ویاساو نەریتێك نەبوە پاریزگاری لێبکات، یەکەم جار لە ناوچەکانی ئەوەی ئیستا پێی دەوترێ ڕۆژهەلأتی ناوەڕاست هەندێ یاسا بە ناوی (شەریعەتی ئۆرنامۆ) هاتوە ، تیایداقەدەغەی سێکسی بە زۆری ودابەشی ژن بە میرات کراوە ،دوای شەریعەتی ئۆشنۆیا هەندێ چاکسازی تری کردوە ،دوای شەریعەتی (لبت عشتار)مافی ئافرەتی نەخۆش و پەك کەوتەو کچی بێ مێردی دیاری کرد ،لە یاساکانی حمورابیش لە کۆی ٢٨٢مادەی یاسایی ٩٢ مادەی سەبارەت بە ئافرەت بوو ، کە تیایدا بۆ یەکەم جار ئافرەت توانی کڕین وفرۆشتن و مولکیەت ومیرات وزۆری تر بە دەست بهێنی ،لە سەردەمی ئەگریك ویۆنانی کۆن یاساکانیان لە قازانجی ئافرەتان نەبوو ، بێ بەش کرابوون لەمیرات و عیبادەت ،بەلأم بۆ ئافرەتە خزمەتکارەکان دەکراگۆرانی ودانس وهونەری تر بکەن[١٥] —ئەوەش مانای خۆی هەیە ،ئافرەتیش لەگەل چینەکانی غەوارەوبەندە و هەژاران بە هاوولأتی یۆنانی هەژمار نەدەکرا

---

[١٣] بە پێی (مقدمة فی انثروبولوجیة الإجتماعیة ص٣١ ) ئەویش سودی لە هیرۆدۆتس وەرگرتوە .

* هەر بە نمونە لە ڕاڤەی (ئەندازەی جینەکان) لە لایەن (موسوعه الصغیره – ر:١٥٧) هاتوە : لە کۆندا تەنها ئافرەتان جووتیار بوون .

[١٥] لە ل١٥١ی جمهوریە افلاتون باسی ئەو ڕۆلەی ئافرەت دەکا .

، لە کۆماری ئەفلاتون [١٦] و ئەرستۆش لە کتێبەکەی (رساله فی السیاسه)دەڵێ سروشت هێزی بە مێشك وعەقلی ئافرەت نەبەخشیوە بۆیە تەنها بۆ ناو ماڵ دەگونجێن ، سوکراتیش ئافرەت بە سەرچاوەی کێشەو قەیران پۆلین دەکاو دەڵێ : ئافرەت ئەو درەختەیە گەڵاکانی سەرنج رأکێشن بەڵام بەرەکەی ژاراویە ،دەڵێ نوقستانیشە لە خوار مرۆڤە هەرە باشەکەیان لە ئاستی بەندەدایە. لەناوچەکانی ئیسپارتەی یۆنان بارودۆخیان باشتر بوو [١٧] ،لە سەردەمی ڕۆمانی لەچاو پێشوو زۆر باش بوو ، تا ڕادەی بەشداری لە دەسەڵات و کۆکردنەوەی سامان و بوون بە قازی ، بەڵام بە (شەیتانی دل)یش وەسف دەکرا ،لە سەردەمی فیرعەونەکانیش بارودۆخیان لە هاوتاکانیان چاکتر بوە ، چەندین ئافرەتی ناوداریان لێ پەیدا بوە، لەوانە زولەیخا [١٨] و شاژن حاتشبسوت٢٠ ساڵ جلەوی دەسەڵاتی میسری لەدەست بوو ،هەروەها دەسەڵاتی ئافرەتانی تری وەك اخناتون نفرتیتی–جوانی جوانان هاوسەرەڕەشەکەی‌امنحوتب(تی)وکیلوبترا،..لەگەڵئەوانەشدا ساڵانە جوانترین کچ پێشکەشی ڕووباری نیل دەکرا [١٩] ، لە چین وهند بارو دۆخیان زۆر خراپ بوە ، تا ئەو ڕادەیە دەبوایە ئافرەتی هندی لەگەل مردنی مێردەکەی پێکەوە بسوتابوونایە ئەگینا وەك نەریتی عەرەب سەرشۆڕی بوو، بەڵام ئاینی زەردەشتی لە چاو ئەوانە پایەی ئافرەت زۆر باش بوە ،بۆیە لە چوارچێوەی دەسەڵات گرتنە دەست دوو کچی کیسرای دوەم(شەهرباراز وسەباهبود)بوون [٢٠] ، لە (الموسوعه الحره)ی بریتانی هاتوەو دەلێت بەو هۆیەوە ئافرەتانی کورد لە مێژوودا ئاوا ڕۆلی بە هێزیان هەبوە [٢١] ،لە گەڕیدە دەرەکیەکانیش ئەو ڕاستیە بەرجەستە بوە ،(کلۆدیس ریچ)دەلێ ئافرەتی کورد لە چاو ئافرەتانی تورك وعەرەب و ئێرانیش زۆر باشتر بوەو جۆرە یەکسانی وسەربەخۆیی ودەسەڵاتیان هەبوە [٢٢] ، هەروەها لەبەڵگەنامەکانی بریتانیش وا هاتوە:

١٤\ اذار \ ١٩٣١

*CO 730/ 161/2*

---

[١٦] لە جمهوریە افلاتون لە (ل١٤٨ تا١٥٦) وەسفی ئافرەت بە شێوەی جیا جیا دەکا .

[١٧] جمهوریە افلاتون باس لەئیسپارتەو کریت بە چاکتر دەکا .

[١٨] لە قورئان –سورەتی یوسف باسی دەکا .

[١٩] بۆدرێژەی ئەو نەریتە بروانە :سینۆهە دکتۆری فیرعەون بە درێژی ئەو بابەتی تێدایە .

[٢٠] ایران– تاریخ والحضارة ص٣٢

[٢١] بۆ درێژەی ئەو باسانە بڕوانە : (الموسوعه الحره ) مادە :حقوق المرأة .

[٢٢] کلودیس–رحلة فی العراق سنة١٨٨٠ص١٠٤

... ان الكرد ليس عربا وهذه حقيقة ثابتة . ليس هناك شك بكون الكرد مسلمين ولكن اسلامهم يختلف عن اسلام العرب. فالعرب بصورة عامة ، خاصة الشيعة متعصبون ولكن الكرد غير متعصبين. للكرد تطلعات الى الحرية التي تتوق اليها الاوروبيون. ولتأكيد هذا اسرد الحقائق التالية:

أ) يعطي الكرد اكثر من العرب الحقوق النساء

ب) لاتلبس المرأة النقاب التي تلبسها المرأة العربية وتختلط بحرية بالرجال

ت) ترقص المرأة الكردية بحرية مع الرجال

ث) حتى في المجالس الخاصة كانت النساء يرأسن الاجتماعات ولنا في زوجة الشيخ قادر نموذج حي.

ج) تستضيف المرأة الكردية ضيفها حتى في غياب زوجها.

لە ئاینە ڕاستەقینەکان باری ئافرەت لە مسیحی ویەهودی وئیسلام باش بوە، تەنانەت ح مسیح جاروایە بە یەکەم داکۆکیکەری ئافرەت هەژمار دەکرێ وەك لە کتێبی پیرۆز هاتوە: «**لَيْسَ جَيِّدًا أَنْ يَكُونَ آدَمُ وَحْدَهُ، فَأَصْنَعَ لَهُ مُعِينًا نَظِيرَهُ**)تكوين ٢: ١٨، ڕێزی ح مریەمیش بەلگەی ترە، بەڵام دوای دەستکاری کردنی کتێبە ئاسمانیەکان فتوای توندیان لە دژ دراوە [٢٣]،لە تەوراتی ئیستا ئافرەت تاوان بارو هەلخەلەتێنەری ئادەم بوە، واباس لە حەوا دەکات : امرأة ماكرة، عاصية لأوامر ربها، تنقاد للشيطان المتمثل في صورة الأفعى الحية. وتخدع الرجل آدم، وتغريه بأكل الثمرة، وعصيان أوامر ربه، فيعصاه (تكوين ٣/١-٦). لەگەل زۆربەی ئافرەتە ناودارەکان ئاوا بە خراپی باسیان دەکا ، باسی سارە خاتونیش دژ بە هاجەرە بەو شێوەیە دەکا : (فقال أبرام لساراي: هو ذا جاريتك في يدك، أفعلي بها ما يحسن في عينيك، فأذلتها ساراي، فهربت من وجهها- تكوين ٦/١٦) ، لە ئینجیل زۆر بە ڕاشکاوانە هۆی سەردەستەیی پیاو بەسەر ئافرەت بەو ئایەتانە گوزارش دەکا: ١) قال بولس في رسالته الأولى إلى كورنثوس ﴿ ١١ : ٣ _ ٩ ﴾ :

" وَلَكِنْ أُرِيدُ أَنْ تَعْلَمُوا أَنَّ رَأْسَ كُلِّ رَجُلٍ هُوَ الْمَسِيحُ. وَأَمَّا رَأْسُ الْمَرْأَةِ فَهُوَ الرَّجُلُ. وَرَأْسُ الْمَسِيحِ هُوَ اللهُ .... الرَّجُلَ لاَ يَنْبَغِي أَنْ يُغَطِّيَ رَأْسَهُ لِكَوْنِهِ صُورَةَ اللهِ وَمَجْدَهُ. وَأَمَّا الْمَرْأَةُ فَهِيَ مَجْدُ الرَّجُلِ.

[٢٣] بۆ دڵنیا بوون لە دەستکاری کتێبی پیرۆز پێش ئەوەی بڕوانیە (ملل والنحل)ی ابن حزم و(ابن تيميه ) کتێبی (رساله فی السياسه واللاهوت)ی سپینۆزا هەروەها هۆبز(**اصول الطبيعة..**) بخوێنەوە .

لأَنَّ الرَّجُلَ لَيْسَ مِنَ الْمَرْأَةِ بَلِ الْمَرْأَةُ مِنَ الرَّجُلِ. وَلأَنَّ الرَّجُلَ لَمْ يُخْلَقْ مِنْ أَجْلِ الْمَرْأَةِ بَلِ الْمَرْأَةُ مِنْ أَجْلِ الرَّجُلِ " .

لە تیلمۆد دەلێ جگە لە ئافرەتانی بەنی ئیسرائیل ئەوانی تر ئاژەلن ،ئاژەلیش مارەیی ناوێت ونەی بوە ،لەئینجیلیش تاوانی دەرپەڕاندنی مرۆڤ لە بەهەشت دەخەنە ئەستۆی ئافرەت( لأَنَّ آدَمَ جُبِلَ أَوَّلاً ثُمَّ حَوَّاءُ، وَآدَمُ لَمْ يُغْوَ لَكِنَّ الْمَرْأَةَ أُغْوِيَتْ فَحَصَلَتْ فِي التَّعَدِّي[٢٤] ،هەموشیان یەکەم جەنگی بەشەری[٢٥] دەخەنە ئەستۆی ئافرەت ، ئەو تێڕوانینانە ڕەنگی دابۆوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست تا سەدەی ڕابووردوو هەلوێستیان بەرامبەر ئافرەت سەلبی بوە ،"أدینوس" دەلیێت:( المرأة . . هي العمل الوحيد غير الكامل . . الذي ترك الله أمر إتمامه للرجل) هەروەها "توما الأكويني" بەو ڕووکارە دەلێت:( المرأة إنسان ناقص التكوين . . وكائن عرضي ) ،تا ئەو ڕادەیە کۆبونەوەیەکی فەرمی لە سالی ١٥٨٦ لە فرنسا کرا بۆ ئەوەی بزانن ئاخۆ ئافرەت مرۆڤی تەواوە ؟ لە ڕۆژی دوای سزاو پاداشی هەیە ؟ لەسەر ئەو بنچینەیە سەلامە موسا دەلێت :ئەوەی لە ناو پاریس تێبینیم کرد ڕێزی ئافرەت لە سۆنگەی ئاینیەوە هاتوەو بێ ڕێزیشی لە نەریتەوە دێت[٢٦] ، لەبەریتانیاش بە بیانۆی پیسی وفیلبازیان فەرمان لە هنری پێنجەم دەرچوو تیایدا لە ئافەرەت قەدەغە کرابوو (کتێبی پیرۆز )بخوێنن،مولکیشیان بەناو نەدەبوو تا سالی ١٨٨٢ ، تەنانەت تا سەرەتای ئەو سەدەیە ئافرەت مافی دەنگ دانی نەبووە .

ئەگەر بۆ کەمێکیش بێت پێویستە هەلوەستەیەك بکەین سەبارەت بەو زانیاریە ئەکادیمیانەی سەروو:

١- لەپێشدا دەبێ ئەوەی بزانین کە یەکەم شەریعەت مەرج نیە لە لای (حمو رابی)هاتبێت ،بەلکو تا ئیستا ئەو دۆزراوەتەوە .

٢- زۆربەی ئەو شارستانیانەی لە قوولای مێژوو باس دەکرێ یان بەرهەمی شۆرشی پێغمبەرێکە یان درێژکراوەیتی ،ئەوەی گرفتە ئەو پێکوەبەستنە لەلایەن توێژینەوە ئەکادیمیەکان فەرامۆش کراوە بەو بیانۆیەی گوایە ئەوە کاری زانستی نیە .

---

[٢٤] ئینجیل ١تیموثاوس ٢ : ١٢ _ ١٤

[٢٥] ئەو جەنگە کەلەنێوان قابیل وهابیل دروست بوو .

[٢٦] سلامة موسى –مقالات ممنوعة ص١٣٤ .

٣- لە سەر ئەو بنچینەیە دەبینین شارستانی یۆنان ومیسرو چین ومیزۆپۆتامیا ..بەرهەمی پێغمبەرانن بەوشێوەیەی خوارەوە :فیساگۆرس(٥٨١-٤٩٧ پ ز) وئنکسماندرس هەریەکە قوتابی ح، پیغەمبەران (ح داود و ح سلیمان )دەرسیان خویندووە[٢٧] ،شریعەتی حەمورابی درێژ کراوەی شریعەتی ح ئیبراهیمە ،بە پێی (پەیمانگای ئیسلامی بریتانی –زانستەکانی بەراوردی ئاینی )ئەوا حەمو رابی ٣٠٠ سال دوای ح ئیبراهیم هاتوە لە ١٨٧٠ پ ز ،بۆیەش بەشی زۆری مادەکانی شریعەتی حەمورابی لەتەورات و ئینجیل وشریعەتی ح ئیبراهیم وهەندێکیشی لە ئاڤیستای زەردەشتی دەچێ ، هەندێکی لەگەل قورئانیش لێك نزیکە[٢٨]، لە سەر ئەو بنچینە قوولە ڕۆسۆ دەلێت یەکەم دەسەلات وشارستانی ئاینی بوە[٢٩] .

٤- هەر بۆیەش لەو شوێنانەی کە ڕووناکی پێغەمبەرو ئەو شارستانیەی لە دوای خۆیان بە جێیان هێشتوە باشتر بوە لە شوێنەکانی تری ژێر ڕکێفی داب ونەریتی کۆمەلایەتی وفەرهەنگی دەسەلاتداران .

٥-هەر لەو ڕەوتە واچاکە ڕوون کردنەوەیەك لەبارەی گرنگ نەبوونی پەردەی کچێنی وەك لە سەروو باس کرا گوایە بەلا بوە ..بە پێچەوانەوە هەر مانای خۆی داوە ،کە دەلێن لە ئەورووپاو زۆر ناوچەی

---

[٥] **بروانە : الملل والنحل** ..ص ٦٧-٧٢ .هەر بۆیەش مەدرەسەو پەیڕەوی فیساگۆرس لەهەموان ئاینی تر بوە .

[٢٨] توێژەران زۆر لای لە یەکچوو لە نێوان تەورات و یاساکانی حمورابی وشریعەتی ح ئیبراهیم دۆزیتەوە ،هەندێکی بە نمونە لێرە تۆمار دەکەین کە لە (مەوسوعەی بریتانی)مان وەرگرتوە : یاساکانی ژ:١٩٦،١٩٥،١٢٩،٨...وەکو ئایەتەکانی (٢١-٣٧-خروج)،(٢٢-٢٢-تپنیە)،(١٥-خروج)،( ٢٠-٢٤-لاوین)...لەگەل زۆری تر ،هەر ئەو دەقەی هەردوولاش بە نمونە تۆماردەکەین : قانون حمورابی رقم١٢٩- إذا قبض على امرأة مضطجعة، مع سيد فيجب عليهم أن يوثقوهما ويلقوهما في الماء. ويمكن لزوج المرأة أن يبقي زوجته على قيد الحياة إذا رغب، كما يمكن للملك أن يخلّي حياة أمته.

التوراة: وإن أخذ رجل يضاجع امرأة متزوجة فليمُت كلاهما. (تثنية ٢٢:٢٢) ،

لە قورئانیش زینای پیاو ژنی بە هاوسەری ئەو سزایە هەیە ، لە ئاڤیستای زەردەشتیش سزای ژنی مێردار لە زینا هەر ئەوەیە ، هەمو ئەوانە بەلگەن کە هەموی لە ڕەچەلەکدا لە پەیام هاتوون دوای بەرەبەرە دەستکاری کراون .

[٢٨] جان جاك رۆسۆ–**العقد الإجتماعي**–ص٢٠١ .

جیهانی دراوەتە کەسی تر خوێنی پەردەی کچێنی بڕێژن .. وانیە،لە هەندێ سەرچاوەی تریش باس لەوە دەکا لە ئەورووپاو شوێنی تر ئەو کارە بە پیاوانی ئاینی دەسپێرا ،ویستر مارك دەلێ ئەو کارە بەردەوام بوو تاسەدەی١٧،مافی هێنانی بووك لە شەوی یەکەم بۆ پیاوانی ئاینی وشاو بەرپرسەکانیان ناونرا بوو( jus primae nocti )[٣٠]،جارجاریش دەدرا زاناو فەیلەسوفانی سەر بەدەسەلات،لەو بارەیەوە (مالکۆلمی سێیەم –شای ئیقۆسیا)بڕیارێکی فەرمی لە(١٠٥٧ - ١٠٩٣)زەدرکرد تیایدا مافی شەوی یەکەمی بووکێنی پیاو ماقوولانی قۆرخ کرد بۆ خۆی جێنشینەکانی ،بەلاَم بووکی مالە هەژارەکان بەر ئەوانی تر بکەوێ ،دوای (مالکۆلمی چوارەم لە ژێر فشاری ژنەکەی ئەو یاسایەی هەلوەشاندەوەلە (١١٤١-١١٦٥) ،هەندێ جار وەك خەلاَت هەندی کەس لەوە دەبووردران وشەوی یەکەم ولادانی پەردەی کشێنی بۆ زاوا خۆی دەمایەوە ..کەواتە لەوەوە بۆمان دەردەکەوێ کەئەو نەریتە لە ئەنجامی زۆر داری داهاتوە نەك لەبەر نەبوونی گرنگی پەردەی کچێنی .

ئەوەی سەروو کورتە وەلاَمێك بوو دوای باسیان دەکەین، جارێ لەسەر بۆچونەکانی ئەوان بەردەوام دەبین بزانین چۆن مافی ئافرەت کەوت وچۆن خێزان سەری هەلدا؟

**پەیدابوونی خێزان**

ئەنجلس لەکتێبی (اصل العائلە والملکیە الخاصە والدولە ) پوختەی رای سەرانی مارکیسزم تیادا گوزارش کردوە، زۆریش پالپشت کراوەتە سەر کتابەکەی مورگان (**مجتمع القدیم** ) و راو بۆ چونەکانی زانایانی کەلەسەروو ناومان بردون ،هەروەها بە گشتی لەگەل بیرۆکەی (تیوری پەرسەندن ) تێکی دەکردوە ، سەرەنجامی هەر هەموویان مارکسیەکانی پاش (مارکس و **ئەنجلس** )لەوانە: (**لینین** – ماو – ستالین،بلیخانۆف ،جۆرج بۆلیتزر،.. ) لەگەل زۆربەی زانا وفەیلەسوفەکانی سەدەی (١٩)وای بۆ دەچن کە مێژووی کۆمەل لەقۆناغی سەرەتایی بەبێ خێزان بوە ، لە سەر چۆنیەتی پەیدابوونی خێزان رای جیا جیایان هەبوە،هەر بەنموونە هەندێکیان تۆمار دەکەین و کە نوینەرایەتی مەدرەسەیەکن :

**( یۆهان باخۆفن )** : لەکتێبەکەی (حق الام) وای بۆ چووە کە ئافرەت بۆتە هۆی پەیدابوونی خێزان و ئەویش سەرەك خێزان بووە، مولکیەتیش هەر لەگەلی پەیدابووە ( لە تویژینەوە کەیداپالپشتی کردووتە سەر زانیاریە مێژوویيەکانی هیرۆدۆتس وهەندی خێلی یونانی کەدەلێن وابوینە ) .

[٣٠] بڕوانە: Gorg orwel –Ninteen Eighty Four p67

**(چۆن لدیۆك )** : لەکتێبی (اصل المدنیه ) وای بۆ چووە کە کۆمەل لەسەرەتادا ١- فرەمێردی بووە ٢- ئینجا فرە ژنی ٣- ئینجا تاك مێردی بەخۆوە بینیوە -لە تویژینەوەکەیدا پالپشتی کردۆتە سەر خێلە ئوسترالیە کۆنەکان وابوینە .

**(چۆن ماکینین)** : لەکتێبی (الزواج البدائیە ) هەمان گۆران و پەیدابوونی خیزان لە دایکەوە بووەو ، ئەسلەکەشی دەگێریتەوە بۆ **(الزواج بالخطف** – ژن هەلگرتن )(ژن هێنان بە فڕاندن)[31] کە لەشەردا دەستیان دەکەوت ، ئەوەش لەو ڕایەی داروین هەلّدەقولیّ کە مانەوەبۆ بە هێزە لە چوارچێوەی مل ملانیّ و دەلّیّ :چەندین نێر شەڕ لە سەر مێیەك دەکاو لە کۆتایدا بە هێزەکە دەستی بەسەر دادەگریّ و نەوەی بەهێز تر لە جاران پەیدا دەکا [32]،هەندێکی تر (هەر سەر بە تەتەوریەکانن) پێیان وابوو کە خیزان نەبووە ،بەلام وای بۆ چوون کەباووك بوە سەرەك خێزان بە پێچەوانەی ئەوانەی سەروو کە (دایك) یان داناوە بە سەرۆك خێزان ،لەوانە :هنری مین - لە کتێبەکەی (القانون القدیم- ١٨٦٠ ) ، (سیرڤینی) یش دەلیت خێزان لە پیویستی خێلایەتی پەیدابووە، خێلیش دروست کراوی کشتوکالە لەوەوە لە مارکسیزم نزیك دەبێتەوە ئەگەر ئەو گریمانەیە ڕاست بێت کەدەلێت جووتیاری کۆن ئافرەت بووینە .

هەمو ئەوانە و توێژینەوەکانی (لویس مورگان ) لە پوختەی مەدرەسەی مارکسیزم ئەوەیە : خیزان لەدوای پەیدابوونی (مولکیەی خێل – مولکیەی بنەمالە – مولکیەی بچوك) لەوە هاتوە کەپیاو چیتر پێی قەبوول نەکراوە خۆشەویستەکەی(ئافرەت) هاوبەشی ژیانی لە مولکیە لەلایەن کەسانی تر بەکار بهینریت، وەیان دەستی بەسەردا بگیریت، هەربا ڕای (سامی عبدالله ) نەقل کەین کە دەلّیّ: (...بەلام گوڕانێکی بەهیزو قول بەسەر غەریزەی جنسی داهات ، کەرەنگە لەسەرەتادا هەر تەنیا ئارەزووی شەهوانی بیت و گۆراو گەشەی کرد بۆ خۆشەویستیەکی پیرۆز )، بەو شیوەیە پیاو ئافرەتیکی دەگرت و بەرە بەرە بەرەوتی میژوویەکی دوور و دریژ لەگەل چەندین پروسەی ئالۆزتر خیزان پەیدابوو ..، کەبریتیە لەژن و میردو منالەکان لە چوارچێوەی ژیانێکی تایبەت، کەبنچینەکەی لەسەر (میرات) (مولکیەت) دامەزراوە ، دەتوانین سەرەنجام بۆچوونەکان لەدوو تەوەری سەرەکی کۆبکەینەوە لەبارەی پەیدابوون و پیکهینانی خیزان، هەردووکیان وەك ئایدیولۆجیای ماددی

---

[31] ئەوەیان جیایە لەگەل بەدووکەوتن ،لەبەدووکەوتن هەردوولایان قایلن بەلاّم لە (بالخطف) فڕاندنە بیّ ڕەزامەندی خۆی ،لەو سەردەمە بە (إغتصاب) ناودەبریّ .

[32] جارلز داروین- اصل الأنواع —ص٢٢٤ .

کلاسیکی ([33] ) پێیان وابووە:خیزان لە پێشتر نەبووە : یەکیان پالنەری جنسی کە مدرسەی فروید یە ئەوەی تریان مدرسەی مارکسیزمە کەلێرەوە نەك هەر پەیدابوونی خیزانی پی لیك دەداتەوە بەلکو پەیدابوونی خیل ونەتەوە ودەولەت و ناکۆکیە کۆمەلایەتیەکانیش پێ لێك دەداتەوە،پوختەکەی ئەوەیە مارکسیزم هۆی پەیدابوونی دەداتە پال (ئابووری) و لەرێی پەیدابوونی مولکیەت وە هەولی داوە کارگەری جنسیشی بخرێتە چوار چێوەی ئابووری وەك ئەنجلس قوناغی سەرەتایی کۆمەل دەکاتە سێ بەش و هەل و مەرجی کۆمەلایەتی لەسەر بنچینەی پەیوەندی جنسی بەو شێوەیە دابەش دەکات و دەلیت: (الطور الوحشیة = زواج جماعی)* ،(البربریة =الزواج الثنائی) ،(الحضارة -= الزواج الاحادی )،یان بەشێوەیەکی میانڕەوتر: فرە مێردی -دایك سالاری،فرەژنی-باوك سالاری ،تاك مێردی دەسەلاتی هاوبەش . بۆبنچینە ئابووریەکەش لەو بارەیە ئەنجلس لەکتیبی(اصل العائلە..)دەلیت (... ئەو خیزانەی کە خۆی لەمولکیەتی تایبەتی پەیدابووەو لەسەر میراتی باوك بەجی ماوە .. ، هەروەها بەرای مارکسیزم لەسەین و بەینی کیشەی نەقابلی پیاو لەتێکەل بوونی ئافرەتەکانیان لەگەل پیاوی بیگانە فکرەی دابەش کردنی ئیش هاتە ئاراوە ، لەدوای گۆرانکاریەکی مێژووی قوول ئیش دابەش کرا لەنێوان پیاو ژن، بەرکەوتنی ئیشی ناومال بۆ ئافرەت و و ئی دەرەوەش بۆ پیاو لەو دابەشکردنەدا مافی ئافرەت کەوت ، وەك ئەنجلس دەلیت: (یەکەم ناکۆکی چینایەتی لەمیژوودا واریکەوت لەگەل گەشەسەندنی ململانی ژن و میرد لە ژێرسایەی تاك میردی ، وەیەکەم چەوسانەوەش وا هەلکەوت لەگەل بالا دەستی پیاو بەسەر ئافرەت لە ناو یەك خێزاندا )[34] .. ئی دی چیتر منال بەناوی دایکی نەکراو خرایە سەر ڕەچەلەکی باوکی ،باوك سالاری دەستی پێ کرد ، شارستانیەتی دایك کۆتایی هات و نۆرەی باوك دەستی پی کرد، لەو کاتیەوە تا ئیستا ئافرەت مافی کەوتوە ،لە نێو خێزان بوویتە ئەو شانۆیەی کە باوك ڕۆلی برجوازی ببینێت و ئافرەتیش پرۆلیتاریا ،لە جەنگێکی بەردەوام دان ،چارەی بۆ نەدۆزرایتەوە ،تا ئەو ڕۆژی بە یەکجاری چینایەتی نامێنێت و دەزگای خێزان خۆی هەلدەوەشێتەوەململانێی دایك وباوك لەسەر دایك سالاری وباوك سالاری

---

[33] - هەرچەندە هەندیکیان لە پیش ( فروید ) هەبووینە بەلام مدرسە کە بەناوی ئەوە

* ئەگەر ئافرەتان ئاوا بە ووردی تێبگەن کە دایك سالاری ووەحشیەت وفرە مێردی پێکگ وەبەستراون هەرگیز باس لە دایك سالاری ناکەن ،چونکە سوکایەتیە پێیان .

[34] اصل العائلة والملكية الخاصة والدولة ص٨٢

نامێنێت وهەردوو سیستەم لە ناو دەچێ و هەرکەسە مرۆڤ سالاری خۆی دەبێ.  ئەوە پوختەی ڕای مارکسیزم ومادیەکانە .

**چارەسەریەکانی**

مارکسیزم لەناوکێشەوژانەکانی سەرمایەداری سەری هەلداوگەشەی کرد،دیارە دژبەوچارسەری و تیۆرانەشە کەلەچوارچێوەی سەرمایە داری باویان هەبوو ، لەونەش ( لیبرال – دیموکرات ، سوسیال دیموکراتی و..) لەهەموان زیاتر مەسەلەی مولکیەت و مەسەلەی ئافرەتانە بەتایبەتی ، جا نەك هەر لەرووی واقیعدا بەلکو لەرووی تیوریشەوە ، وەبە چارەسەری کاتی وهەلخەلتێنەری دانا ، بەتایبەتی ئەو سەربەستیە بۆ ئافرەت لەژێر سایەی دیموکراتی سەرمایەداری هاتووەبەلەبیر بردنی کیشەئەسلیەکەی لەقەلەم داوە، پێیان وایە ئەوە زیاتر بارگرانیە بۆ ئافرەتان کەچەوسانەوەی چینایەتیشی دێتە سەر ، بۆیە مارکسیزم هەر وەك لەسەرووش دەرکەوت وای بۆ چووە کەئافرەت لەئەنجامی پرۆسەی ئابووری قوول کیشەکەی پەیدا بووە، بریتی یە لەکردارێکی میژوویی ئالۆز، بەبڕیاریك یان بەتۆمارکردنی یەکسانی  لە (پەیرەوی حزبێك ) یان لەدەستوری وولاتێك یان دروست کردنی (یەکیتی ئافرەتانیك ) یان هەر ریکخراویکی پیشەیی بۆیان ئەو مەسەلەیە چارەسەر نابیت ، هەربۆیە کیشەکەی بەکۆمەلێ کێشەی مێژووی بەستەوەو تا رزگاری کۆمەلێکی چیندار بۆ بێ چین (کەشوعیەت دا دێتە دی) ئەو کێشەیە چارەسەر نابیت ،... جابابزانین چۆن بەدروستی چارەسەر دەبیت؟ دووبارە دەگەڕێتەوە سەر ئەسلی مەسەلەکە ،مادەم لەگەل پەیدابوونی خیزان و دابەشکردنی کار لەنیوان پیاو ئافرەت کەئەوانەش لەئەنجامی پەیدابوونی مولکیەتەوە دەردەکەوتن ،ئەوا دەبیت ئەو دەزگایە هەلوشینیتەوە ، بۆ ئەوەی دابەش کردنی کار نەمینیت، بۆیە لەشوعیەت دا هەروەك مولکیەت نامینی – دەولەت نامینی – یاسا نامینی ..خیزانیش نامینی ، سەرەنج بدە لەوەلامی مان و نەمانی خیزان لەشوعیەتدا ئەنجلس دەلی (... هەرچیەکی بنیاد نراوی سەر مولکیەت بیت نامینیت )([٣٥]) ، زیاتر لەوەش دەلیت نەك بەبریار و بە ویست و ئارەزووی ئیمە نابیت بەلکو ئەو دەزگایانە خۆیان دەپووکێنەوە،لەبەر ئەوەی پێویست نابیت ، خەلکی هەست بەبەر پرسیارەتی دەکەن ،خۆیان ڕۆلی دەولەت وپۆلیس و یاسا دەبینن هەروەك لینین دەلیت :چۆن ئیستا دەبینین جەماوەر دووشەڕکەر لێك دەکەنەوە یان نایەلین پەلاماری ئافرەت بدرێ، کۆمەلگەی شیوعیەت خۆیان ئەو

[٣٥] – انجلس– نصوص مختارة ص ٣٦١

بەرپرسیارەتەی ئارامی هەلدەگرن [36]، هەموو پیویستیەکی ژیانیش لەژیر سایەی پیش کەوتنی تەکنیکی دێتە دی، هەرکەسی چ ئافرەت چ پیاو بەو پرانسیپە دەژی ( بەپێی توانا ئیش و بەپی پیویست وەرگرتن )[37]، ئیدی کەس پیویستی بە بەرپرسیاریەتی کەس نابیت و کۆمەلگایەکی هیمن و مسۆگەر دێتەدی ، ئەو پیویستیانەی مولکیەت و خیزان و دابەش کردنی کارو یەکگرتنی ژن و پیاو نامینیت ! وەك دەلین (بەهەشتیکی سەرزەمین) لەرووی خاسیەتە بنچینەیەکان دەگرێتەوە لەهەموو روویەکەوە، ئافرەتیش دەبنەوە ئادەمیزادی تەواو، دایك سەربەخۆ دەبی و منالەکانیان سەربەخۆ دەبی و منالەکانیان بەناو ئەوان دەکرێنەوە .

بەو شیوەیە پایەی ئافرەت دەگەرێتەوە شوینی سروشتی خۆی(دایك سالاری)، دوای ئەوەی بۆ یەك (سورە میژوویی) لەدەستی دابوو، هەر ئەوەشە  زۆربەی نوسەرانمان لە دوا تەقەلایان بانگیشەی بۆ دەکەن ،دەبیٚ ئاگایان لەوە نەبیٚ خودی خاوەنی ئەو تیۆرەش سەردەمی دایك سالاری بە سەردەمی دڕندایەتی بەستۆتەوە .

## گرفتە کوشندەکانی مارکسیزم

کەدەلێن گیروگرفتی تیۆری واتە بەعملی و سەلماندن نیە، بەلکو تەنیا هەلسەنگاندنە هەر لەمەجالی تیۆری، ئینجا زیاتر بەلای ئەوانە دەچین کەڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ پەیوەستە بە بابەتەکەمان .

گیرو گرفتەکان دەکرێنە دووبەش ،بەشی یەکەمیان لەتیۆرانینی کیٚشەکەو بنەماکانیەتی ، دوەمیان بریتیە لەچۆنیەتی چارەسەریەکانە، لەبەشی یەکەمدا گیرو گرفەکان بەگشتی تر باس دەکەین، بۆیە پیویستە زۆر بەکورتی ئەنجام و شکستە کانی فکری مارکسیزم دەرخەین ... بەو شیوەیە بەشی یەکەم دەستی پی دەکەین کەبریتیە لە گرفتە سەرەکیەکانی فلسفی :-

**فلسفەی مارکسیزم** : لەسەرەتا دەبیت ئەو رووداوە میژوویە تۆمار بکەین کەفلسفەی مارکسیزم بەتیکرایی شکستی هێنا نەك وەك ئەزموونیکی کۆمەلایەتی واقیعی بەلکو وەك مدرسەی فکری ، مانای ئەوەیە خەلکانی چەپ و مارکسیزم نابیٚ کیانی فەلسەفەکەی وەك یاسا بە ( حجە) بەکار بهێنن، بەهەر سیٚ بەشەکانی:(ئابووری سیاسی)  (تیۆری زانیاریەکەی )  (مادیەتی جیهان بینیەکەی ) ..، بەلام سەرەرای ئەوەش هێشتا وەك فلسفە و رێبازیکی کۆمەلایەتی و کلاسیکی جیٚ ی پەندو

---

[36] لینین –مختارات

[37] مبادیء الشیوعیة

سود وەرگرتنە لیّ ی ، ئیمەش لەپەندو سود و بۆچونەکانی سەر مەسەلەکەی خۆمان ووت ویّژ دەکەین کە پەیوەندیدارە بە بابەتەکە .

گیرو گرفتەکانی مارکسیزم هەرچەندە لەزانستی نویّ دا دەستی پی کرد نەك لەقەیرانە سیاسیەکان بەتایبەتی زانستەکانی گەردوون و هەروەها فیزیایی نوی، بەلام ئەوەی پەیوەندی بە (کیشەی ئافرەت) ەوە هەیە،ئەوا مارکسیزم لەرووی دەست نیشانی میژوویی کیشەکە خۆی و ئەسلی(پیوەرەکەی)مونتەلەقەکانی شکستی هیناوە ، وەك بینیمان مونتەلەقی بۆچوونەکەشی تیوری پەرەسەندنە، خاوەنە سەرکیەکانی (لامارك) و (داروین ) بوون ، بەروونی دەرکەوت کە ئەو تیۆرە هەلەیە و کۆتایی بەدیراسەتەکانی هات، ئیستا (ئەندازەی جینەکان ) جیّی گرتەوە،کە تیایدا (شوینی جین) لەناو کرۆموسۆم بەرپرسە لە گۆرانکاریەکانی هەر جۆرە گیان لەبەریّك ، دەریش کەوت هەر جۆریك لەپۆلەکانی ژیان شوێنێکی جینی تایبەتی هەیە لەکرومۆسوم ، بەو شیوەیە بی دوودلی دەرکەوت کە ئادەمیزاد چۆن هاتووە هەروا بووە هیچ گۆرانیکی جۆری بەسەردا نایەت(جگە لە گۆرانکاری عەقلی)،باپیرە گەورەمان ئادەمە،ئیستا سەردەمی تیۆری وانەماوە تویّژینەوەی ووردی ئەکادیمی دەکریّ ماجستیّر ودکتۆرا لەسەر ئەوە دیّتەوە ئاخۆ کاتژمیّر چەند ئادەم دابەزیتە سەر زەوی ،هەر بەنمونە: یەکەم جار ح ئادەم لە شاری غوکلاندی هند[38] نەوەکانی بەسەر زەوی دا بلاوبوونەوە، هەندیك میّژووی دابەزینی بۆ ٣٥- ٤٠ سەدە پ.ز دەگیرنەوە، (یوشر) دەلی ژیان لە ٤٠٠٤پ.ز دەستی پیکردووە، هەرچی (لایتفوت)ە دەلی ژیان لە ١٣/ئوکتوبەری/٤٠٠٤پ.ز سەعات ٩ی بەیانی دەستی پیکرد!!، هەرچی (ئاشۆسە) دەلّیّ لە نیّوان ڕۆژی هەینی دابەزینی ح ئادەم وهەینی تۆفانی ح نوح ٢٢٠٠ سال و٢٦ سال و ٢٣ ڕۆژ و٤ سەعاتە[39] ! .

ئینجا ئەو راو بۆچونانەی کە گوایە کۆمەل بە(٥) قوناغیی مێژوویدا تیپەربووە... ئیستا هیچ بەلگەی زانستی نەماوەو ئەو (مشاعی البدائی ،دایك سالاری ،بیّ دەولەت و بیّ یاسا یی ...هتد) هەر نەبووە، راستە هەندی خەلك هەبووینە لەقولایی میژوو وەك درندە ژیاون، بەلام بەشی زۆری شارستانیەتی بەگویرەی سەردەمی خۆی هەبووە ، خیزانداریش هەر هەبووە ، هەر لەچوار چیوەی

---

[38] بروانە (معجم ديانات وأساگیر العلمیه...، ج٣ ص١٥٠ )دەلی: لە بناری شاخی هیمالایەی هەرەبەرزی جهان دابەزیتە سەرزەوی.بەلام هنری فورستر دەلی لە غوکلاندی هند دابەزی ، بە پیّی (بدايه والنهايه- ابن الكپير) ح ئادەم رۆژی جومعە دروست کراوە .

[39] بروانە: لقطة العجلان مما تمس إلى معرفته حاجة الإنسان - الملك محمد صديق حسن خان

رایەکانی خۆیان کە کەتۆمارمان کردن بە زۆری وا دەردەکەون کە تیۆرەکانیان لەدیراسەت کردنی توێژیکی کۆمەلایەتی یان خیلێك یان ناوچەیەك بەرەنجام هیناوە ، کردویانە بە بۆچونێکی گشتی ودوایش کردوویانە بە چەمك ویاسا، (**الزواج الخطف** – ژن رفاندن یان نزیك لە ژن هەلگرتن ) ئەگەر لەو کاتی هەبووە ئیستاش هەیە ، ئەگەر غەریزەی جنسی و خۆراك لەو سەردەمی سەرەکی بووە ئیستاش لەشارستانیەتی مادی سەرمایەداری هەر سەرەکی یە ، بۆیە زۆر لەزانا هاوسەردەمانی ئەوان بەو بۆچونانە قایل نەبوون ،هەتا تەتەوریەکانیش لەوانە (هنری مین)لە کتێبەکەی بەناوی ( قانوون القدیم - ١٨٦١ )پی وابوو خیزان هەر هەبووە و لەباوکەوەش دەستی پی کردوە و بی یاسایی و گەرە لاوژی جنسی نەبووە، لە خراپترین دۆخی مێژوویشدا دەسەلات و مەرکەزیەت و ئەخلاق و مرۆڤایەتی شان بەشانی پێچەوانەکانی هەر هەبوە، (ویسترمارك) لەکتیبەکەی بەناوی (میژووی هاوسەری سەرەتایی– تاریخ الزواج البدائی )جوان روونی کردۆتەوە کەسنوری جنسی (الجنس الحرام) ی لەبەشەریەت گێڕاوەتەوە بۆ ئەو قەدەغانەی کە لەناو خیزاندا پەیدا دەبن، ئەو غەریزەیەش کپ دەکاتەوە. بۆچوونەکانی مارکسیزم ویستویەتی پالپشت بکاتە سەر دیراسەتەکانی زانستی بۆیەك مەبەستی سەرەکی ،ئەویش تابیسەلمینن کە سەردەمیك هەبووە کۆمەل وەك دڕندە هیچ ریساو ریکەوتن و رژیمیکی تیا نەبووە ، بەلام ئەو دەست نەکەوت چوونکە ئەگەر سەرنج بدەینە رای (جۆن مالکین)یان (سیرڤی)یان هەریەکیان کە دەلێن لە شەڕ یان لە تەمەلوك یان لە (ژن هەلگرتن)یان لە حۆشەویستی.. خێزانپەیدا بوە،باشە شەڕەکە لەنێوان کێو کیٚ بوە ؟مادام ژن ڕفێنرابێت لەکیٚ رفێنراوە ؟ ئەوەش بەروونی مانای بوونی کۆمەل کۆمەل وسنورو قەدەغەیە ،مانای ئەوەیە (کۆمەل ) هەبووە – خیزانداری هەبووە، (محرم الجنسی ) هەبووە، واتە یاساو رێساش هەبووە ، بۆیە ئەو دیاردانەش هەبوە ،لە بەلگەنامەکانی سەردەمی یۆنانیش ئەو ڕاستیانە بە ڕوونی بە دی دەکریٚ [٤٠]، ئیستاش خۆشەویستی هەرهەیەو پەیداکەری خیزان نیە بەتەنها، ئەگەر دەلێن دایك دەپەرسترا یان سەرەك هۆز یان یان.. هەموو ئەو وەسفانەی (کۆمەلگای سەرەتایی) لەگەل ئەو سەلبیاتانەش خۆی لەخۆیدا لێیان دەردەکەوی قەدەغەش هەبووە، واتە رژێم وشارستانی هەبووە ، ئاین هەبووە ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە ئەو نووسینەی (د کمال مزهر ) کەویستویەتی بیسلەمینی کەژیانی سەرەتایی بی رژێم و کەس بەکەس نەبووە دەلیت :( ئەوسا شتێك نەبوو پێی بلین گواستنەوەی ئافرەت بۆ مالی

[٤٠] بۆ زیاتر بە ووردی بڕوانە جمهوریە افلاتون لە (کتاب الخامس- مسألە الجنسیە ل١٤٦ تا ل١٥٨ ) .

میرد ، لانەی کامیان باشتر بوایە ئەوەی تریان دەچووە خزمەتی ) (جیابوونەوەش بەدەست ئافرەت بوو )([41])، هەمان دەرئەنجام بەدەست دەهێنی و خۆی بەلگەی پێچەوانەی سەلماندنەکەیەتی ، رای ئەنسرۆپولوجیەکان سەبارەت بەو مەسەلەیە دەلین لە سەدەی (١٩) وا باو بوو گوایە سەردەمێك هەبووە کۆمەل بیٚ رژێم و لەدڕندە چووینە ، خیزان نەبووە و سیستەمی فرەمێردی هەبووە ... هتد ، بەلام ئەمرۆ تەواو گەیشتونەتە ئەو ئەنجامەی کە رژێم و یاسا هەبووە مادام کۆمەلگایەك هەبووبیٚ ناوی ئادەمیزاد بوو بێت [42] . ئەو رایە تەواو راستە ئەگینا بۆچی لەشوێنێك نەمان بینی ئافرەتیك سەرەك خیزان بیت ؟ بۆ هەرپیاو ؟ لەو مەسەلەیەدا موفەکیرە مارکسیەکانی نۆیش گومانیان پەیدا کردبوو ،ئەوەتا (کاوتسکی) دەلێت خێزان هەر هەبووە بەلام سەردەمیك خێل زۆر پیرۆز بووە منالەکانی لەجیاتی دایك و باوکی بەناوی عەشیرەتی هەل دەدرا ،ئەوەش راستە بەلام نەك بەگشتی ، ئیستاش لە هەندی شوێنی خێلەکی پەرست هەروایە ، هەروەها فرۆیدیش لەدوایدا بەرروونی گەراوەتەوە سەر رای بوونی خیزان و رەخنەی لەوەی پیشەوە گرتەوە[43]، زیاتریش لەوە دەلێت :ئەوەی راستی بێت یەك جۆر (**فوضی الجنسیة** ) هەیە ئەویش ئەو ( **بغاء**) بەر بلاوەی لەکۆمەلەکانی ئێستامان دەبینین. لە فەیلەسوفە عەلمانیەکانی تریش رۆسۆش دەلێت خێزان هەر هەبوە وبریتیشە لە کۆن ترین کۆمەلگەی سروشتی[44] .

لە نوسینە کۆنەکانی میسری (بە هیمۆگرافی نوسراوە) باس لە هۆی هەلچوون ولافاوی نیل دەکاو هاتوە : هۆیەکەی ئەوەیە هەر جارەك (ئیبزیس) مردنی (اوزوریس)ی هاوسەرەکەی بە بیر دێتەوە ئەوەندە لە سەر لێواری نیل دەگرییٚ ئاوا دەبێتە لافاو ، ئەوەش بە ڕوونی دەری دەخا کە لەو قوولاییەی مێژوو خێزان بەو سیستەمەی ئیستا هەبوە، لە سەردەمی کۆنی یۆنانیش باس لە خێزان و لە لاوازی ئافرەت لە تواناو بەرگەی دەکا بە بەراورد لەگەل پیاو[45] ، هیچ شارستانیەك نادۆزیەوە بیٚ خێزان.

[41] – **د . کمال مظهر** – مێژووی ئافرەت ل٨ بیرو را زانستیە نوێکانی د کمال زۆر گۆڕاوە بەو ڕووکارەی وا ئێمە لەسەرین.

[42] (مقدمة فی انذوثؤلوجیا الاجتماعیة) لەبابەتی (السیاسة بدون دولة ) .

[43] نظریة الجنسیة ص١٩٥ .

[44] **فی العقد الإجتماعی ص٣٦**

[45] بڕوانە: جمهوریە افلاتون ص١٥٥

سەبارەت بەو بۆچوونەی گوایە ئافرەت لە سەردەمیك چەند مێردێكی هەبووە وەك د . كمال مزهر بە (هەوێكانی پیاو ) ناوی بردووە لە ل٨ ،كەچی هەرلە ل٩ سەبارەت بە زانینیان كەئافرەت هەر لە خۆوە مندالی نابێت دەلێت (لەمەدا خێری ئەو ئافرەتە ناشرینانە بنوسی كەپیاوان توخونیان نەكەوتوون بەوەوە زانیان كە بەبێ پیاو ولە خۆڕا مندالیان نابێت)، كەس ناچێتە ئەقلی مادام جوانی و ناشیرنی هەبوو بێت بتوانریت چەند مێردێك لەسەر یەك ئافرتدا داوەرێتەوە، ئەوەی زۆر جێی سەرنجە هەر لە كتێبەكەی مۆرگان(١٨٦٦-١٩٤٥ز) خۆی لە ئەنجامی بەدواداچوونی سەلماندوویەتی كە فرە مێردی وسیستەمی بێ خێزانی بوونی نەبوە ..چۆن؟ مۆرگان دەڵێ لەناو زۆربەی كۆمەلگا كۆنەكانی هندیە ئەمریكیەكان وبەریتانی و ئاری ئاسیایی وزۆری تر [٤٦] گەڕاوم ئەو ووشانەی وەك :باوك ودایك وبرا وخوشك وەك یەك بووینە یان زۆر لێك نزیك بووینە، ئێمەش دەلێین ئەوە باشترین بەڵگەیە كە سیستەمی خێزانی وهاوسەری ڕێكخراو هەبوە پێش ئەوەی ئەو میلەتانە لێك جیا ببنەوە بۆیە ئەو ناوانە(باوك وبرا و..)وا لێك نزیكن ،... ئەوە لەبارەی كۆمەلی سەرەتایی .

**هەرچی مەسەلەی بەندایەتی یە** .. ئەوە زۆر ڕوونە تەنها بەشێك لە بەشەریەت بەو قۆناغەدا تێپەرینە ،گەرچی دەرەبەگایەتی زۆر بەرفراوان بوو هەتا ئیستاش هەر ماوە ، زۆر میللەتان( سێ چوار یەكی دنیا) بە بێ ئەوەی قۆناغی سەرمایەداری ببینن وەك خۆیان دەلین گەیشتونە (سوسیالشت و شوعی )... ئەوانە هەمووی (**متناقظاتة**- ناكۆكین لەگەل یەك) بۆیە ئەو پالپشت و ئەستونگە مێژوویانەش كە گوایە شیوعیەتیكی ترمان بۆ دێنێ بمانەوێ یان نەمانەوێ ئەوە دەرنەچوو ،هەر بۆنمونە وەك (**متناقظة**) ی ووتەكانی خۆیان :لەلایەك زۆر داكۆكی لە سەر مادیایەتی مێژوو دەكەن، هەمـوولایەكمان دەزانین عەقل چەند رۆلی هەیە لەسەر ئادەمیزاد رووداوە میژوویەكان ،كەچی (لینین) زۆر بەبی دوودلی دانی بەوە نا كە (**عقل**) مادی رووت نیە، بەلكو خاسیەتی (لامادی) هەیە[٤٧]، زانایانی سۆفیەتی پێشوش دووبارەی ئەو رایەی كردۆتەوە([٤٨])، كەواتە مادیەتی میژووی لیرەدا كەوت ،مادام (الامادی) بەشداری لەدروست كردنی كرد ، هەر لەبارەی میژووەوە دیسان

---

[٤٦] مۆرگان لیستێكی دوورو درێژی لە هەموو میلەتانی جهان كۆكردەوە لە كتێبێك بە ناوی (انساق النسب والمصاهرە) لە سالی ١٨٧١ بلاوی كردەوە .

[٤٧] لینین — دفاتر فلسفیە

[٤٨] – بۆ زیاتر بڕوانە: مادیة الدیالیكتیكیة–جماعة من اساتذة السوفیتیة ، تعریب:فؤاد مرعی وبدرالدین السباعی..ص١٣١–١٤١

(لینین) و(ماو) وچەند زانای تر کە پسپۆری ئەو بابەتەش نین وەك (بافلوف) (ئاینشاین) (دلتای) (اونست ترولنیت) (بندتو کرۆچە ) (کولنجوود) بەوە رازی نەبوون کە (کارکەری ئابووری ) پالنەری کۆمەل بیت، بەلکو تۆماریان کردووە کە (گەلان خاوەنی میژووی خۆیانن )،ئەوەش پیێچەوانەی کرۆکی مارکسیەتە کە پیێی وایە ئابوری بزوینەری گەشەی کۆمەلە ، دیسان پەیدابوونی بزوتنەوە نیشتمانیەکانی و دان نان بەو کیشەیە وەك (پایەی یەکەمی ناکۆکی ) دیسان هەرشکستە(چونکە بە پیێی مارکسیەت ژێرخانەکە هەردەبیت ئابووری بیت و ئەو ناکۆکیەش لەپایەی یەکەم هەر دەبیت ناکۆکی جینایەتی بیت وەك لە مانەفیستەکە ی شیوعی هاتوە)،بەو شیوەیە کیانی مارکسیزم لەیەکەم کلپەی بەدەست کاری ترسناك وا بەرێوەیە هەتا یەکجاری کەوت، هەر لە یەکەم بەیانی شوعی لەلایەن (مارکس – ئەنجلی ) نوسراوە کە:(میژوو تا ئەمرۆ بریتیە لەمیژووی ناکوکی چینەکان )، دیسان ئەنجلس هەر زوو دەسکاری کردو (مشاعی البدائی ) لی ئاوێر کرد، چونکە (چینی جیا جیا) لەو کاتی نەبووە ، ئینجا وەك لەسەرووش باسمان کرد لەمەسەلەی بزووتنەوە نیشتمانیەکان میژوویان دروست کردوو ناکۆکی چینایەتیش نەبوو، بەو شیوەیە بەدەستکاریەوە گەیشتە ئەو تی روانینەی بلیێن (گەلان میژووی خۆیان دروست دەکەن ) ئەوە لە جەوهەردا جیاوازیەکی گەورەی لەگەل مانفیستەکە هەیە، واتە ئەو ناکۆکی چینایەتیەی کەکۆتایەکەی بە(دیکتاتۆری برولیتاریا ) دەهات وادەرنەچوو ،بۆیە ئەو شوعیەتەی کەتیایدا گوایە هەموو کێشەیەك چارسەر کراوە ، چاوەڕێ بوون لەدیکتاتۆری پرۆلیتارياوە بەرهەم بیت نەزۆك دەرچوو، ئی دی ووت ویژ لەسەر مەبدەئەکانی شوعیەت بووە فەرەزی وبەس ،ئیستا ئەو باسانە لە خانەی زانستی وفەلسەفی دابەزیوە بۆ میژووی فلسەفە .

## گیرو گرفتەکانی لەچارەسەریدا

لەوەو پیش بۆمان دەرکەوت کە: ١- خیزان هەرهەبووە هەر دەمینیت ٢-کیشەی ئافرەت تەنهابەشیك نیە لەناکۆکی چینایەتی ٣- راستەوخۆ ناگەریتەوە بۆکیشە ئابوریەکان ٤- شیوعیەت وەك قوناغیکی حەتمی لەپیش کۆمەل نیە،.. بۆیە لیرەدا شتیکی زۆر گرنگ دەردەکەوی کەتەشخیسی کێشەی ئافرەت لە(پزیشکایەتی مارکسیزم ) نەدۆزاریەوە ، زۆر سروشتیە دەرمانەکەی بەهەلە بۆ دانریت،سەرەرای ئەوەش ئیمە هەر لەگەلیا پیادەچین.

لەبەرئەوەی مارکسیزم چارەسەریەکانی ئافرەت لەهاتنەدی شوعیەت دەدۆزیتەوە، با بزانین ئەو (شوعیەتەی) لە کۆتایی سەدەی بیستەم وای بەسەر هات ئەوە بریتی بوو لە چەند گیروگرفت وپرۆڤەیەك بوو کۆمەلگە جارێکی تر پێویستی پیٚ دەبێت؟ یان هەر خەیالیکی مەحالە؟دیارە واقع (تجربە العمل ) یەکلای کردەوە بەلای مەحال و هیچ دوودلیەك نەما، ئەگینا بەنمونە لەوولاتێکا نمونەو پیادەکردنێکی سەرکەوتومان دەبینی ، ئەوەیان هەتا مارکیسەهەرەتۆخەکانیش گەیشتوونە قەناعەتی تەواو، بەلام رەنگە لەرووی تیوریەوە هیشتا ووردبوونەوە بەراوردی بوێتـ ،بۆیە لە سەر هەندیٚ بەشی هەلوەستە دەکەین کە پەیوەندی بە چارەسەری کێشەی ئافرەت هەیە .

**شوعیەت ناکۆکە خۆ بەخۆ لەگەل بەشەکانی تری فلسفەی مارکسیزم:**

ئەو بابەتە زۆر دوورو درێژە ، تەنیا دوونمونەی بەکورتی دەخەینە روو، ئەگەر بەسەرەنجەوە لیێان وورد بینەوە دەبینین ئەو شوعیەتە هەم لەناوەخۆ خۆبەخۆ ناکۆکەو هەم لەگەل بەشەکانی تری فلسفەی مارکیسزم ،بۆیە هەر لەچوارچێوەی خۆی وبە پیێی فلسەفەی مارکسیزم خۆی بەشەکانی تری وا هەول دەدەین بابەتەکە بەیەکتر چارەسەردەکەین :

**<u>چارەنووسی ناکۆکی چینایەتی لەشیوعیەتدا</u>** هەلبەتە لەشوعیەت چینایەتی نامێنیٚ ، ئەوە ناکۆکە لەگەل یاسای بنەرەتی دیالیکتیك ([٤٩])، وەك لینین دەلیت ئەو یاسایەکروکی دیالیکتیکە (یەکیتی ناکۆکی لایەنەکانی دژ بەیەك ) ، کە چین نەما ناکۆکی چینایەتیش نامێنیٚ ،ئەوە لەلایەك وە لەلایەکی ترەوە هەر بەجمکی لەگەل پەیدابوونی مارکسیزم ئەو پرسیارەش لەگەل هاتووە: دەلین — باشە خۆ میژوو راناوەستی ؟ ئەی بەچی دەجولیت ئەگەر ناکۆکی چینایەتی نەمینیت ؟ دیارە وەك (مادیە دیالیکتیك ) وەلامی داوەتەوە دەلیت ئەو کاتی ناکۆکی کۆمەل لەگەل سروشت دەست پی دەکات ، هەرچەندە ئەو وەلامە لەگەل (مانفیێستەکەی شیوعیەت ) وزۆربەی بنەماکانی شیوعیەت و بیرو ڕای سەرانی مارکسیەت (مارکس ،ئەنجلس، لینین،ماو،پۆلیتزەر،بلیخانۆف،ستالین ،ترۆتسکی.. بە جیایی ئینتمایانیشەوە) ناکۆکە ، سەرەرای ئەوەش ئەو وەلامە دەیان پرسیاری تری نوی دروست دەکات ،باهەریەکێك لەو پرسیارانە هەلبژیرین کە لەهەموان ئاسانتر بیت وبەدوایدا بچین : هەرچەندە ئەو وەلامە لاوازە چونکە پیشتریش واتە پێش شیوعیەتیش ئەو کارکەرە هەر هەبووە ، واتە کۆمەل لەمل ملانی بووینە لەگەل سروشت ،بەلام خۆ ئەو کارکەرە نابێتە پالنەربە پێی تەرازوە لۆژیکیەکانی

---

[٤٩] یاسای بنەرەتی مارکسیزم بریتیە لە یاسای یەکەمی دیالکتیك کە بریتیە لە (یەکێتی وململانێی دژەکان

مارکسیزم خۆیان ، چونکە دەرەکی یە ، لەروانگەی مارکسیزم بێجگە لە کارگەرە ناوەکیەکان ئەوی تر (سانەوین ) ، خۆ ئەگەر (بە گریمانەیی و تیوری )کەمێکیشی لی ببورین ئەوە لەلایەکی تریش ئەو ناکۆکیە مەرجەکانی دیالیکتیك هەلناگری، کەیەکێکیان ئەوەیە (هەردوولای ناکۆك مەرجن بۆمانی یەکتر)، ڕاستە سروشت مەرجە بۆمانی کۆمەل بەلام پیچەوانەکەی راست نیە .هەرچەندە (ماوتسی تونك ) لەکتێبی (لەمەر ناکۆکی- **حول التناقض)** و ئەنجلسیش لەکتێبی (ئەنتی دوهرنگ ) هەولیان داوە — زەمینەی تیوری بۆ ئەو مەسەلەیە خۆش بکەن و هەریەکە بەجیا لەدوویەك . ووتویانە — مردن بی ژیان نیەو ژیانیش بی مردن نیە — وەئەنجلس لەرەوەتی راڤەی ناکۆکی نیوان (خاك و نەبات ) دەلێت هەردوولا بیێ یەکتر نابن ،ئەوەی هەمان هەلەی (میسالە خودیەکان) تێیکەوتبون ، (چان پۆل سارتەر) یش هەلەکەی نویێ کردەوە کاتی لەکتیبی (الوجود والعدم) دەلیت (بی جیهان کەس ناژی پی بەشەریش جیهان نابیت ) ، ڕاستیەکەی وانیە، جیهان بی ئادەمیزاد دەبیت، خاك بی نەبات دەبێت، مردوو بی ژیان دەبیت ، هەروەك سروشت بی کۆمەل دەبیت ،بەلام پیچەوانەکانیان ، بەوشیوەیە ئەو وەلاٌمەی دیالکتیك وئەنجلس وماو نابێتە پەیوەندی دیالیکتیك، ئەگەر بەسەر ئەو کۆسپە گەورەش بازماندا ، خۆناشیت ئەو ناکۆکیەی نیوان کۆمەل و سروشت هەروا بمێنێت — چارەسەری چی یە؟ جورج پۆلتیزو لە(اصول المارکسیە ) لەرەوتی راڤەی سەرەنجامی چارەسەری ناکۆکیەکان دەلیت: لایە زالەکە لەکۆتایدا لایەکەی تر قوت دەدات هەروەك پرۆلیتاریا برجوازی قووت دەدات، جا ئیستا ئایا کۆمەل سروشت قوت دەدا یان سروشت کۆمەل قووت دەدا ؟ دیارە هەرلایەکی هەلبژیری هەر توشی کۆلەرێیە بۆ فلسفەی مارکسیزم، بەرەو مەحالی وەلامت دەبات پرسیاریش زیاد دەبیت ...، بەو شیوەیە نەك لە واقعەکەی هەربە تیوریەکەی وەلامی نیە، هەر کاتی وەلامیکی لاوازیش دەست دەکەویت و هەردەمادەست ڕووبەرووی پرسیاری نوی زیاتر دەبێت .

هەر بەهەمان شێوە ( ناکۆکی بنچینەیی لە فلسەفەی مارکسیزم ) دەدۆزیتەوە کە بەچەند پرسیارێکی کورتی مارکسیانە خۆیان بەو شیوەی پێشوو دووچاری کۆلە ڕیێ دەبێت،کەواتە وەلاٌمی ڕاستەقینەی پرسیارەکەی پێشوو ناکۆکی نیوان کۆمەل و سروشتی نیە،لەشیوعیەت (پالنەرەکە — محرکەکە) ناوەکیە ،تەقەلا دراوە وەلامێکی تر ئامادەبکریێ لە ڕێی ئەو بەشەی هەرە بە هێزە لە مارکسیەت وبە ژێر خانی فلسفەی مارکسیزم هەژمار دەکریێت، با سەرەنج بدەین :هیزی بەرهەم

هێنەر  لە مارکسیەتدا بنچینەیە (واتە ناوەرۆکە) و پەیوەندی بەرهەم هینانیش (شیوەیە ) ، هیزی بەرهەم هینان لەجولان دایە ، جولانەوەی هیزی بەرهەم هینانی لەچ ناکۆکیەکی ناوەکی دروست دەبیت؟ لەوەلام دا سەیری کتێبی (اسس مارکسیە – لینینە ) وەڵامی داوەتەوە ،لەدوای هینان و بردنیکی زۆر دەلیت بەهۆی ناکۆکی نیوان ئادەمیزاد ئامرازی بەرهەم هینان .. ،بەلام هەر زۆر ئاشکرایە هەتادوور لەو بابەتەش  زانایانی فیزیایش لێی بە دەنگ هاتوون وەك (اینشتاین) دەلیت (ئامراز ) زادەی چالاکی ئادەمیزادە،لەئاستی مرۆڤ نیە ، بۆیە لە و ناکۆکیە شانۆگەریە ئامرازەکە چ دەوری نیە و ئادەمیزادەکە بنچینەیە ..، واتە ناکۆکی نێوان ئامرازو ئادەمی زاد ئەسلی نیە ، لیرەدا دوو ئەنجامی گرنگمان بەردەست دەکەویت .

١- ئادەمیزاد خۆی پالنەرو دروست کەری میژوو وپیشکەوتنی خۆیەتی نەك هیزی بەرهەم هینەر یان سروشت یان هەرکارکەرێکی تری ئابووری یان جنسی یان ...

٢- پەیوەندی ئادەمیزاد بەسروشت و هیزی بەرهەم هینەر و سەرجەم دروست کراوەکانی تر پەیوەندیەکی ناکۆکی نیە ،ئینجا لەهەردووکیان بۆمان دەردەچیت کەیاساکانی شیوعیەت ناکۆکن لەگەل بەشەکانی تری مارکسیزم و هەرهەمووشیان ناکۆکن لەگەل واقیعدا، ئابەو شیوەیە ئەگەر پێداچین لەشیوعیەتدا یاساکانی مارکسیزم زوربەی هەرە زۆری تێك ناکەتەوە .

## ئافرەت لەشیوعیەت دا

هەموو لایەك گەیشتینە قەناعەت کەشیوعیەت هەروەك (دوورگەی پۆتوپیا – شاری زانایان و **مدینة الفاضلة**..) شیوە خەیالێکە گەڵالە کرا  - بەلام بابزانین لەو دورگە خەیالیەش شوێنی ئافرەت چۆن دەبیت ؟ جهانبینە مارکسییەگەورەکانیش باوەریان وایە جیاوازی هەیە لەنیوان ئافرەت و پیاولە بوارەکانی کۆمەلایەتی،مەدەنی بایولوجی .. هەتا دەرونیش ، شیوعیەتیش سیستەمیکی کۆمەلایەتیە تەنها کیشەکانی زادەی کۆمەلایەتی پی چارەسەر دەکریت، ئەدی چۆن چارەی جیاوازی بایولوجی یەکانی دەکات ؟ چۆن چارەی جیاوازی نیوان جوان و ناشیرین دەکەن ؟چۆن چۆن..؟ بابلێین بە (جادوو) هەموو چارەسەریەك کرا ،باشە چۆن چارەسەری ئەو مەیلەی ئادەمیزاد دەکەن کە ئافرەتیکی جوان بازاری گەرم ترە لەیەکی ناشیرین؟ ئایا ناکۆکی لەپیناوی رووناداات ؟ خۆ (دکمال مزهر ) لەکتێبی (ئافرەت لەمیژوودا ) تووشی ئەو ناکۆکیە بووە

لایەنگری ئەو ڕێبازەیە و کەچی دان بەو مەیلە دەهێنی ، بۆ وەلام بانەریتێکی کۆنی بابلیەکانتان بۆنەقل کەین ( [50]) کە (دکتۆرە نوال السعداوی ) خۆشی نەقلی کردووە ،بۆ هەموو ئەوانەش کەداوای هاتنە دەرەوەی ئافرەت وەك پیاو دەکەن بەسەربەستی موتلەق بیری لی بکەنەوەو پێکی ببەستن و سەرنجی ئەنجامەکەی بدەن — دیارە نەریتێك هەبووە لەناویان — کەهەرکچێك لەژیانی دا دەبوایە بچێتە یەکێ لەپەرستگا و چاوەرێ ی پیاوێکی بکردبایەو لەگەلی رابواردایە ....، بەلام چۆن ئەو ئەرکە ئاینیە بەرێوەدەچوو؟ کەگرنگیشە بۆئیمە، لێرەدا کچە جوانەکانی بەخێرایی و بی داوکەوتن دوستیان بۆ پەیدا دەبوو، کەچی ناشیرینەکان بەسال دەبوایە چاوەرێیان بکردبایە ،ئەوەیە سەرەنجامەکەی، بەلام بەداخەوە هەرنوسەرێك هەلدەستی و هەردەنووسی بی مەسئولیەت — ناپرسی ئاخۆ لەسەربەستی جنسی موتلەقدا کێ بەرپرسیارە لەرێك خستنی و چارەسەری ئەو کیشانە، بە تایبەتی کیشەی شەرانگیزی ئادەمیزادی لاسار ، بە تایبەتی لە شیوعیەت خۆ حکومەت و یاسانیە  لەکاتیکا ئادەمیزاد خۆشی ئیمکانیات و سروشت و تەبیعاتیان جیایە لەرووی هیزی عەقل وتوانای لەش وماسولکە ولەهونەر.. ،هەیە دەنگ خۆشە و هەیە وەرزشکارە ... ئەوانە هەموو تایبەتمەندی (**افضلية**) و جیاوازی کۆمەلایەتی دەروست دەکاتەوە ، لەوەوە (فرۆید) کەباشترین هیرش کەریان بوو لە تەوەری (علم نفس) وەردەگەرێتەوەو لە کتێبی(**قلق فی الحضارة**) دەلیت: ئەو مەسەلانەی یەکسانی ئافرەت وپیاو خەیالن نایەتەدی ،چونکە (شەرانگیزی لەناوغەریزەکانی ئادەمیزادا خۆی مەلاس داوە ) . ئەو غەریزانەی ئادەمیزدە( کە مارکسیزم دانی پیادەنین )بوونەتە هۆی پەیدابوونی مولکیەت و خیزان و ناکۆکیو..، ئەو غەریزانە خۆ هەر دەمێنێن، مادام لەکاتی(وەحشیەتدا -هەروەك خۆیان ناویان ناوە  )ئادەمیزاد قایل نەبووە هاوسەرەکەی لەگەل یەکی بیێگانە رابوێری ئایا ئەو بیرە لەگەلّ پێشکەوتنی کۆمەل پتەو تر نابێ ؟ ئەوە بەشێك نیە لە سروشتە بنچینەییەکانی ئادەمیزاد کەپێی دەلێن (فیترە) ؟ ئەو نووسەرە یان هەلگری ئەو باوەرە با کەمێك بیر بکاتەوە بەهێمنی، ئایا ئەگەرێك هەیە بۆ هیچ سەردەمێك بتوانێت خوی ئیقناع بکات هاوسەرەکەی(پیاو یان ژن) بێ لێپێچانەوە چی بکات.

---

[50] – لەوانە  باوکی مێژوو هیرۆ دتس — مورتەزا موتەهریش  لەکتیبی (االحجاب) نەقلی کردوە .

بۆیە ئەگەر هەتا بە (جادوویەك) یش هەموو كۆمەل هەلبوەشیتەوە، هەموو ئەو خەیالانەش بیتەدی بەتەبیعاتەكانیشەوە ئینجا خیزان خۆ هەر شانەیەكی بی ئیشی كۆمەلایەتی نیە ، بەلكو چەندین فەرمانی دیار و نادیاری هەیە ،وەك ئەنسرۆ پۆلۆچیەكان لەهەموان زیاتر (لیڤی ستراوس) و (مالینوسكی ) دەریان خستوە ، بەرپرسیارە لەكۆمەلیك خسوسیاتی ئابووری و ئەنسرۆبۆلۆجی و كۆمەلایەتی و ئەخلاقی ... فرمانی بایۆلوجی و فسیۆلوجی و هەتا تەندروستیشی هەیە، خۆ هەر بەر چاویشە كەخیزان بەرپرسیارە لەگواستنەوەی شارستانی لەنەوەوە بۆ نەوەكانی داهاتوو،واتە بەنەبوونی خیزان كۆمەل دەگەرێتەوە سەر شارستانیەتی دارستان . هەروەها خیزان دەوریكی گرنگی لەپەروەردە هەیە ، لەراسیتدا سەرانی ماركسیزم لەمەسەلەی خیزان دا دوودلیەكی قولّیان لی هەست پیّ دەكریت، لەلایەك بەگوێرەی یاسا گشتیەكانی دیالكتیك و (حەتمیەتی تاریخی) ئەوا لەگەل نەمانی مولكیەی تایبەتی خیزانیش دەبی نەمینی ،كەچی لەزۆر شوینی تر نكولی لەوە دەكەن و دەلین خیزان دەمینیت، زەق ترین وەلام بۆ ئەو پرسیارە ئاخۆ خیزان دەمینیت یان نا ؟ ئەوا لە (مانیفیستە كە ) و (نصوص مختارە — انجلس) دا دەلیت **(فان تنظیم الشیوعی لایدخل مشاعیة النساء بل العكس سیزیلها)** ،دیارە ئەوە ناكۆكە لەگەل لایەكی تری هەمان وەلامی (ئەنجلس) لەكتیبی (اصل العائله ...) لەقوناغی شیوعیەت دەلیت (.. هەرچیەكی بنیات نراوە لەسەر مولكیەتی تایبەتی نامێنێت -.. ماهو سلبی سیزول )، ئەنجلسیش و شیوعیەت بەگشتی خیزانی پی سلبی یە، وەك لەروونكردنەوەیەكی لەسەر تێبینە یەكی (مۆرگان )لەبارەی ووشەی (هیتاریە) دەلیت (مەبەستی مورگان لە (هیتاریە) ئەو پەیوەندیە قاجاغەیە لەنیوان ژن و پیاویكی ناشەرعی ... ئەو پەیوەندیەش هەرلە گەشەكردن دایەو بەرەو گەوادیەكی زەق دەروا لەژیر سایەی خیزانداریی یەك مێردی)[٥١].بەو شێوەیە بەروونی لەوەی دوای دەردەكەویّ یەك مێردی وخیزانیش سەلبیەتەكانی زادەی مولكیەتە و هەلدەوەشیتەوە كەلەو ووتەیەی ئەنجلس راستەو خۆی دەردەكەوی كەدەلیت: (... بۆ سەربەستی ئافرەت یەكەم مەرجی پیویستە هەموو جنسی مێینە بچێتە ناوپیسەسازی گشتی)، دیارە ئەو مەرجەش لەپێشدا پیویست بەوە دەكات كەخێزانیش هەلوەشێتەوە كە یەكەكی ئابووریە ([٥٢])،

[٥١] لە راستیدا ئەسلی هیتاریە ئەو نەریتە بوو لە سەردەمی یۆنانیەكان كە ئافرەتە زۆر جوان وشارستانیەكان تایبەت دەكران بۆ ئاشقایەتی لەگەل چینی ئۆرستوكرات و دەسەڵاتداروفەیلەسوف و زانایانی ئەو سەردەم .

[٥٢] - نصوص مختارە — تعلیق جانابا ص ٣٢٢

بۆیە لەدوا بەرەنجام دەتوانین بلێین ڕای مارکسیزم بۆ کێشەی ئافرەت و چارەسەریەکەی چەسپاو یەك وەلام نیە — **سێ چارەسەری بێ ڕوون کردنەوەو بێ مسئولیەتی داوە** :یەکیان بە هەلوەشانەوەی خیزان ، دووەمیان مانی خیزان بەسەرکردایەتی هاوبەش پیاو ژن، سێیەمیان بەدەرچوونی ئافرەت لەبەرپرسیاری ئیش و کاری ناو مال بۆ دەرەوە — ئیستا دەتوانین بەوەرگرتنی ( پەلەیەك -عەینە) بۆ هەر سێ بار و دۆخی کۆمەلایەتی لەهاوشیوەیدا لەواقیعدا وەرگرین، لەبەر تاقیگەدا بیتوێژینەوە. لەیەکەم دۆخ دا بەنەمانی خیزان و سەربەستی جنسی و (زواج جماعی) ئەوەتا لە (مەلهەکان ) نمونەیەکە دەتوانین کۆمەلێکی بێ خیزانی لی بتویژینەوە بەشێوەیەکی ئەکادیمی ، لەپیش ئەوەی ئەنجامە مەحالەکانی کۆمەلایەتی و شارستانیەتی و ئەخلاقی باس بکەین  کە ئەوە دۆخێکی شازەو کۆمەلگە لە هیچ قۆناغێك گشتاندنی قەبوول نیە ،ئەوەتا کارکەری تەندروستی (لەوانەش نەخۆشی ئایدز) بەسەرمانا وەك چەکوچێکی پۆلاین دەیسەپێنی کەمەلهەکان داخەین ،جائەگەر هەموو کۆمەل وابیت دەبی چ کارەساتیکی تەندروستی و کۆمەلایەتی وەك بۆمب بتەقێتەوە، سەرباری ئەوەش زانای دەروونناسی (هنری مین) دەلیت ئەو تێکەلیەو (زواج جماعی) دەبێتە هۆی نەزۆکی و کۆتایی هاتنی کۆمەلیش ،ئینجا ئەو دۆخە واتە (زاوج جماعی) وبێ قەدەغەییە ئەگەر مەحالیش نەبیت لایەکی ژیانی ئادەمیزاد هەلدەتەکێنێت ،چونکە (فرۆید) بە (لاارادی ) دەلیت ئافرەت لە زواج جماعی تام لە پروسەی جنسی ناکات ، بە پیچەوانەوە ئەزیەتە ([٥٣]) .

لەدۆخی دووەمیش بۆ بەیەکسانی هاوبەشی ئافرەت  و پیاو لەبەرێوە بردنی خیزان .... ئەوا نەلەسروشت و لەژیان و نەلە گەردونیش تاکە نمونەیەك نیە دوو ناوەند هەبیت بۆیەك سیستەم ، بەیەکسانی دەسەلاتی هەبیت، ئەوەتا لەکوردستان باشترین نمونە هەیە کەحکومەتەکە بەنیوە بە دووناوەند بەرێوە دەچوو چەند نا ئارام و نەگونجاو بوو.

دۆخی سێیەم — کەلە راستیدا ئەوە رای سوسیالیستەکانە، قۆناغی سوشیالیستیە لەگەل سەرمایەداری یەك دەگرێتەوە لەوێ باسی دەکەین کە ئەنجامەکانی بەچی  دەگات.

دەمێنی خالێکی تر باس بکەین کە دەلێن پەیوەندی نێوان ژن و میرد  جەنگە لەسەرەتای میژووەوە ...، باشە ئەگەر جەنگە و مل ملانی یە بۆ پینج گۆرانکاری میژوویی روویداو وەك

---

[٥٣] - نظرية جنسية  ص١٢٠(لەوەلامی ئەی بۆ وادەکەن ؟ دەلیت بۆ پارە)

خۆیان دەڵین ئەو جەنگە وەرنەگەرا بەلایەك ؟ خۆ هەرکامێك سەرکەوێ هەردەبی لایەك سەرکەوی ئەوا کۆمەل کۆتایی پێدێ ، جاناشزانرێ لەسەر چ بنچینەیەك ئافرەت بەپرۆلیتاریاو پیاویش بە پرجوازی دادەنریت ؟خۆ ئەو دابەشیانە لەمارکسیزم دا لەسەر بنچینەی ئیش و بەرهەمە، ئەوەتا پیاوەکە بەرهەم هێنەرەو ئافرەتەکە مشەخۆرە بەو حیسابە بیت ،واتە هەر تەواو پیچەوانەیە، ئافرەتەکە بووە زۆر دارو برجوازی ! ... نەخێر ئەو مونتەلەقانە بنچینەکانیان هەلەن بۆیە تووشی (**منتاقظة – ثارا دۆکس)ی** وادەبین ،(**مثل الكلمة الخبيثة كشجرة الخبيثة.....**، لە بەر سەرنەکەوتنی ئەو تیۆرە گەورانە ئیستا زاراوەی (جەندر)بەکاردێت لە جیاتی (بزوتنەوەی ئافرەتان) بە مانای یەکسانی بەلاّم دوور لەو بڕوایەی کە ناکۆکی لەنێوان ژن ومێرد هەبێت .

بەو شێوە چارەسەری مارکسیەت بۆ ئافرەت لە خەیال و مەحالدایە ،ئینجا ئەگەر بشێتە دی چارەسەریەکی دەردەسەری وناخۆشیە ،هەر چارەسەر نیە .

با بزانین سەرەنجامی پیادەکردنی سۆشیالیستی وشیوعیەت لەو ولاّتانی شیعی چۆن بوە ؟دوای پەیرەوی شیوعیەت لە چین لە ١٩٤٩ ەوە،ئینجا شۆڕشی فەرهەنگی دوای هەمووئەوانە لە ئامارێکی مانگی ٢٠٠٤/٣دەرکەوت بە هۆی پرۆسەی( تحديد النسل) ٤٠ملیۆن کوڕ زیادی کردوە، کە پێچەوانەی هەمو ئاماری جیهانە کە مێینە زیاترن لە نێرینە ،ئەوەش بە هۆی ئەوەی بە نازورو لە بارچوون کوڕەکان دەهێلنەوەو کچەکانیش لە باردەبەن ..ئەوەش هەمان نەفامی سەردەمی کۆنە بەرامبەر ئافرەت دەکرێ بە شێوەیەکی مۆدیرنانە ،لە کاتێکا لینین لە سالی ١٩٢٠ەوە جاڕی یەکسانی ژن وپیاوی لە سۆڤیەت دا، بۆ ماوەی٧٠ سالیش لە مادەی ١٢٢ و١٢٣ی دەستوری سۆفیەتی داکۆکی لە یەکسانی نێرو مێ کرابوو[٥٤]، کەچی کار گەیشتۆتە ئەوەی دیاردەی پۆشاك لەوولاّتانی پێشووی سۆڤیەتیش ئەوەندە زۆر بێت دەسەلاّتداران لە دژی بوەستن ،هەروەك لە ڕاپۆرتی وەفدی ئافرەتانی ئۆزبەکستان لە کۆنگرەی پکین بەناوی ( ئافرەتان لە دوای سۆشیالیستی ) هاتبوو سکالاّیان لە حکومەت ئەوە بوو کە زۆری لە ئافرەتان دەکرێ هەتا پۆشاك وسەرپۆش فڕێ بدەن وئازادی خودیان لێ قۆرخ دەکەن ،ئەوجۆرە قۆرخ کردنە ئیستا پەڕیوەتەوە بەشێك لە وولاّتانی ئەورووپیش لەوانە فرنسا ئەلمانیا بریتانیا ..

[٥٤] بڕوانە : القانون والإشتراكية ص٣٥

# بەشی دووەم

## کیشەی ئافرەت لەڕوانگەی سەرمایەداری

لەراستیدا سەرمایەداری مانای کۆمەلگای سەرمایەداری نانوێنی، بەلکو تەنیا لایەنی ئابوورییەکەی دەنوێننێت ،دیموکراسیش لایەنی سیاسی و لیبرالیش لایەنی کۆمەلایەتی ، بریتیشە لە شەبەنگێك هێل و بیرو بۆچون (لبرالیەت لەبۆچووندا ) بە پیچەوانەی مارکسیزم و ئیسلام قاوغ و چیوەی دارشتنەکەی بی سنورە ، بۆیە دەبوایە بلێین ئافرەت لەروانگەی (لیبرال – دیمکراتیدا ) بەلام هەروەك وا باو بووە واش لەسەری دەرۆین .

**ئاکارە بنچینە ییەکانی سەرمایەداری**

ناسینەوەی ئەو سیستەمە لەبنچینەکەی دێت کەشارستانیەکەی لەدواشیێ کردنەوەدا شارستانیەکی مادیە ، پەیوەندی خەلکی خۆ بە خۆو لەپەیوەندی نێو دەولەتیشدا لەسەر بنچینەی مەبدەئی بەرژەوەندی بنیات نراوە، لەهەموو روویەکەوە:کۆمەلایەتی – فکری –سیاسی -ئەخلاقی هەتا دبلوماسیش ، ئایدولوژیەتی مارکسیەتیش لەکاردانەوەی ئەو ئاکارانەی سەرمایەداری پەیدا بوو و گەشەی کرد، بۆیە هەرلەو ڕوەوە( واتە لە بارەی کاریگەری مادی بە سەر مرۆڤایەتی ) سەرمایەداری و سوشیالیستی ومارکسی یەك دەگرنەوە ،یەك بۆچوونیان هەیە ،هەر بەنمونە سەرنج بدە بۆچوونەکانی نوێنەرانی هەردوولا کە داکۆکی لەسەر رۆلی کاری ئابووری دەکەن وەك کارگەریکی یەك لاکەرەوە لەژیانی ئادەمیزادا ، ئی دی ئەوەی تر هەرچی هەبیت لەپەیوەندی دیلی ئەو کارکەرەیە . ئەوەی ناوی نراوە (ئەخلاقی کۆمەلایەتی ) کە ئەوا ئەنجلس بیێ پیێچ و پەنادەلیت (هیچ شتیك وەك ئەخلاق نسبی نیە) ،فرۆیدیش دەلیت (دوورترین پەیوەندی ئادەمیزاد ئەخلاقە)، (راسل ) یش دەلیت –بەرژەوەندی شەخسی ئەخلاق دیاری دەکات ،دیارە ئەوەمان بەنمونە بۆ ئەو سەردەمە هینا ئەگینا بەتیکرا مدرسەکانی سەرمایەداری و ئایدولۆجی مارکسیزم لەمادیەتی پەیوەندی کۆمەل ریکن ، بۆ مەسەلەی دیراسە کردنی ئیمە گرنگ ترین خاسیەت ئەوەیە – بوونی سەربەستی بی سنور لەو سیستەمدا – دیارە هەر ئەوەشە بنچینەی لیبرال

دیموکراتی – کەتیایدا هەموکەس سەربەستە هەر چونێك وەك شەخسی دەژین  چ دەلیت چ دەکات و چۆن مال پەیدا دەکات تەنیا ئەوە نەبێ زیانی مادی نەبیت بۆ خەلکی تر، بە راستەو خۆی بنچینەکەشی بریتیە لە بازاری ئازادوسەربەست ،کە ئەوەش بەدەوری خۆی لە بازرگانی سەربەست و منافەسەی سەربەست و بازار و ئیحتیکارو زێدە بایی و (ربا- سو) و نەبوونی مولکیەی گشتی کەرتی بی دەست تیوەردانی دەولەت خۆی دەنوێنێت ،لەژیر سایەی ئەو سەربەستیە فەلسفەی سەرمایەداری چارەسەریەکانی دەداتە دەست .  دەروازەی رای جیا جیا دەکاتەوە بۆ چارەسەری هەرکیشەیەك – جا پەرلەمان و هەلبژاردن و مەسەلەی مافی مرۆڤ و ... هەروەها سەربەستی چارەی خۆنووسی شەخسی ئافرەت وەك تۆمارکراوە لە فەرهەنگەکانیان کەبریتیە لە یەکسانی پیاو و ئافرەت لەمافو ئەرکدا – جا ئەو یەکسانیە لەرووی میرات و هاوسەری هەلبژاردنو لیك جیابوونەوە و هاوبەش و سەربەستی لەپێوەندی و گۆرین  .... هتد، ئەوە لەرووی ( احوال شخصی) هەروەها لەرووی حقوقی و سیاسی و ئابووری و زانستی و سەربەستی  کار و پەیدا کردن چارەسەری گشتی ( Genaral solution) سەرمایەداریە ، بە کێشەی ئافرەتیشەوە، دەبێ بزانین چارەسەری گشتی مانای چیە واتە هەرچارەسەریەکی تر کە لایەنەکانی تری کیشەی ئافرەت دەگریتەوە دەبیت لەسەر ئەو بنچینەیە بیت- واتە ( استنباط) .

**چارەسەریەکانی**

وەك پیشانمادا چارەسەری گشتی کێشەی ئافرەت لەروانگەی فەلسفەو شارستانیەتی سەرمایەداری لەچوار چیوەی سەربەستی شەخسی دەدۆزیتەوە ، یان وەك دەلین دیموکراتی هەلگری هەموو چارەسەرێکە هەروەك لەراپۆرتی سیاسی یەکەم ودوەمی کۆنگرەی (ی – ن- ك ) یش هاتووە دەلین (دیموکراتی دەرمانی هەموو دەردیکە ) . جا لە بەر ئەوەی سەربەستی لە سەرمایەداری مانای سەربەستی لەبیرو بۆ چوونیش دەگرتەوە ،بۆیە ئەو سەربەستیە تاکە چارەسەریەکی نەداوە بەلکو کۆمەلیك چارەسەری داوە کە هەول دەدەین لە سێ مدرسە کورتیان بکەینەوە

١- **مدرسەی لیبرالیەکان:** لەو مدرسە بەکۆمەلیك بۆچوون و چارەسەری بی قەیدو شەرت باس دەکەین، بەزۆری لیرەدا داکۆکی لەسەر هاتنەدەرەوەی ئافرەت دەکەن لە کەلتورو نەریتی کۆن و بەشداری بەرهەم و بەریوەبەردنی دنیای سیاسەت و حوکم و راگەیاندن و هونەر ... هتد دەکەن . یەکیك لەو بارەیەوە (فۆری ) دەلیت (پیش کەوتنی هەرمیللەتێك بە پێش کەوتنی

ئافرەتانیان دەپیورێ )* ،کەم زۆر هەندیکیشیان بەلای ئەسلی مەسەلەکەدا چووینە ، لەمیژوویان کۆلیتەوە لەوانە (ویل دیوراتت ) کیشەی ئافرەتی لەنوقوستانی فسیولوجی و جەستەیی دۆزیتەوەو هەروەها لە(هەلخەلەتاندنی لەلایەن شەیتانەوە یەکەم جار ... ) ئەوە هۆیتی وەك لە(ئنجیل) هاتوە: (ئافرەت ئەو کاتی هەستی بە نوقوستانی خۆی کرد کە لەوەختی بیێ نویژیدا لیێ ی قەدەغە کرا لەپیاو نزیك بیتەوە ) [٥٥]، وەدەلین ئەوە سەرەتای عەیبەیەو بەسوك سەیرکردنی ئافرەت بووە، بۆیە چارەسەری ئەو نوقوستانیە لەسەر بەستی پیێ دانی ئافرەت بیێ هیچ قەدەغەیەك کلیلی دەرباز بوونی ئافرەتە . دیارە بۆ سەربەستی دانە ئافرەت و هاتنە دەرەوەیان لە زیندانی خێزان هەندێ سەرەنجامی سەلبی دەبیێت،چۆن بێنە نیێو پیاوان ؟ئەوان بیێ هیێز ترن ..چاوچنۆکیان لەگەل دەکریێ ...دوور نیە پەیوەندی جنسی قاچاغ دروست بیێت، چارەسەری جیا جیا دراوە بۆ ئەوەش ، چارەی فەیلسەسوفی ئینگلیزی ( براتراند راسل) لەهەمووان سەیرترە، لەدوای تەقەلایەکی زۆر هاتۆتە سەر ئەو پیشنیارە شیێوە میلیانەودەلیێت دەرچوونی ئافرەت لەسەرەتادا گوایە وەك ئەو ویێنە رووت و (خیلاعی)یانە کە خەلك تاماوەیەك بەقەرەبالغی سەیری دەکەن، پاشان ئاسایی دەبیتەوە ، بۆ ئافرەتیش هەروایە، لەسەرەتادا هەندیێك نارێکی و ئەنجامی خراپی دەبیێت ،پاشان ئاسایی دەبیێت، هەروەها دەلیت پیش کەوتنی زانست و تەکنیك زۆر کیشەی خیێزانداری و کۆمەلایەتی لەو بارەیەوە چارەسەر دەکات ، مەسەلەی سەربەستی ئافرەت لەپەیوەندی قاجاغ لەگەل پیاویکی بیگانە زۆر بەسانای ئیستا چارەسەردەبیت و دەلیێت :با ئەو پەیوەندیە هەر هەبیێت خۆ کیێشەی منالی (بیژی) پەیدا ناکات وەك رووداوەکەی (بیکاسۆ)[٥٦]، چونکە ئیستا (حەبی منع الحمل ) هەیە، پیشنیارەکەی راسل ئەوەیە دەلیت بابۆ پەیوەندیە قاجاغەکە (حەبەکە) بەکار بهینن و بۆ میێردە ئەسلیەکەشی بامنالی لیێ ببیت، ئەو بانگیشە ئیستا جار جار لەکوردستانیش دەگوتریتەوە،سەرجەم لە شارستانی ڕۆژئاواو سەرمایەداری ئەوەندە گویێ بە پیرۆزی خیێزان نادەن ،هەرچەندە هەندیێکیان لەو دواییە جاریێکی تر لە دەستورو ڕیێکەوتنە

---

* ئەو ڕایە لە بنچینەدا بۆ ئیبن ڕوشد دەگەڕیتەوە .

[٥٥] دوای هەموو ئەوانە بەدەقی ئایەتی ئنجیلی تۆمار دەکەین .

[٥٦] – بیکاسۆ دوومندالی ناشەرعی هەبوو (بالوما ) وبرایەکەی (کلود) کە لە (فرانسوار چیلو) بوون بی بەش کران لە سامانەکەی بیکاسۆ .

نێودەولەتی وجاڕنامە جهانیەکانیان پاراستنی خێزانیان وەك ئەرکی کۆمەلاّیەتی ویاسایی تۆمارکردوە ، هەرچی (لستر ورد) ە دەلیت لە پیشان میرد کردن بەپیچەوانەی ئیستا بوو، پیاو لەلایەن ژنەوە هەلدەبژیرا هەروەك ئیستاش لەخێلی (ئویمپیای) رۆژهەلاتی ئەفریقی و ئوگەنداو هەندێ شوێنی تر هەرماوە ، جا ئەگەر کۆمەل بەشیوەیەکی مودیرنی بگیرێنەوە و ئافرەت بتوانی ئەو سەربەستیە وەرگریتەوە ئەوا مافە زەوت کراوەکەی وەردەگرێتەوە . هەروەها زانایانی (تەتەور) (مارگریت میت ، دۆپۆمیری ، شوارتز ، مورگان ،.. دەلین بەستنەوەی ئافرەت بەلێپرساوی ناومال لە چوارچێوەی سیستەمی خیزان جگە لەتەشەنکردنی بەخیرایی (بەدڕەوشتی— بغاء ) زیاتر هیچ نابەخشی، بۆیە پیویستە ئافرەت سەربەست بکریت لەو کۆت و زەنجیرەی پەیوەستی خیزان، لەسەر هەمان تراز (یوهان باخۆنن) (چۆن لوپوك ) (چۆن ماکلینین ) ئەوانەش بەرای جیا جیا لەهۆی پەیدابوونی خێزانیان کۆلیتەوە و دۆزیویانەوە کە لەمولکیەو جەنگ وسیستەمی خێل و .... پەیدابوون، واش پیشنیار دەکەن کە بەلابردنی ئەو هۆیانە ئافرەت رزگار دەبیت . نوسەر و زانایانی نوێش بەتایبەتی لە جیهانی سێیەم لەو سەردەمەدا راو بۆ چوونی لیبرالی هەیە هەر بە نمونە: لە زیا کۆك ئەلب (هونەرمەندی تورکی کوردیشە لە بنچەدا) هودا شەعراوی ،قاسم ئەمین[57] تا دەگاتە د.سلوی خماش ، نوسەری بنگلادیشی (تەسلیمە نسرین) هەندێکیش لەوولاتی خۆمان (هاوری خەجۆ) سکرتیری (ئالای رزگاری-پێشوو) ئەوانە داوای کۆرانکاری و سەربەستی ئافرەت دەکەن، ئەو گورانکاریەی لەنێو نەریتی کۆمەل هەتا شریعەتی ئیسلامیش بکرێت کە بگونجین لەگەل سەربەستی ئافرەت و شارستانیەتی هاوچەرخ .

لەگەل ئەوانەش کۆمەلێك رای زۆر جیاو سەلبی بەرامبەر ئافرەت هەبوە کە گوزارش لە بێ ڕێزی ئافرەت دەکا لەلای ئەو شارستانیەوە بەتایبەتی (ئەوروپا)، ،تا ئەو ڕادەیە دان بەوە نانین کە ئافرەت ئادەمیزادە لەوانەش وا هەندێکیان بە بەلگەوە نەقل دەکەین لەسەر زمانی نەزان و خەلکانی ئاسایی نیە، بەلکو زاناو هونەرمەندو فەیلوسفەکانی یانە:-

**رۆسۆ — ئافرەت پرچی درێژە بەلام بیری کورتە . ئەوە رای فرۆیدیشە**

**ڤۆلیتر :- ئافرەت لەریوی فیلبازترە**

[57] بە یەکەم داکۆکی کەری وولاتانی عەرەب دادەنرێت کتێبیکیشی هەیە بەناوی (تحریر المرأە ) لە بنەچەدا ئەویش کوردە .

**شکسپیر – ئەی بێ هیزکە ناوت ئافرەتە – (چاو برسیتی ئافرەت لەهیچ رادەیەك راناوەستی – ئەگەر زێڕی سەر زەوی هەموو بدەیتێ چاو دەبرێتە گەنجینەی ئاسمان)**

**فریدریك نیتچە : ئەرۆی بۆلای ئافرەت قامچیت لەبیر نەچیت**

**ئەمیل یۆنیتش (١٩١١) – ژنان باوەریان وایە ئەگەر راستیان ووت وەکو ئەوەی رووت بن هەنری دورینیە ١٩١٧- هەمان رای هەیە ...**

ئینجالەوێشەوە بۆ لای خۆمان ، کۆمەلیك راو سەرنجی خراپی تری بەربلاوە لەناو کۆمەلی ئیمە شدا وەك : ئافرەت ئەقلی نیە هەستی هەیە – نوقستانە – زەعیفەیە – ئافرەت ئافرەتە ([58])

**٢-مدرسەی دەروونناسەکان :**

هەروەك مارکسیزم پێی وابوو هەموو پەیوەندیەکانی کۆمەل لەبنچەدا پەیوەندی پیویستیەکانی مادی یە ( واتە بەرژەوەندی ) ،ئەوا فرۆیدیش وەك هێلێکی فکری پێی وایە هەموو ئەو پەیوەندیانە لەبنەچەدا پەیوەندی جنسین (واتە بەرژەوەندی جنسی)، بە ئابووریشەوە و هەتا پەیوەندی خۆشەویستی دایك بۆ مندالەکەش لەو بارەیەوە فرۆید دەلیت (پالنەری جنسی بنچینە یەکەمی زۆر بەی خۆشەویستیەکانە ) ([59]) ، دەلین: بەلام هەندێك لەو پەیوەندیانە سەربەخۆیان وەرگرتووە لەئەنجامی ئالۆزی و تیکەلی پەیوەندی کۆمەلایەتی ([60]) ،ئەگینا هەموو پەیوەندیەکانی نێوان ئادەمیزاد لە کۆتایدا لە پیویستی جنسیەوە هەلدەقولی ، لەو بارەیەوە ، سامی عبداللە سەرجەم ئەو رایانەی کوشیوەو دەلیت :(ژیانی جنسی وامان لی دەکات بەرهەم بهینین – خیزان پیك بینین – عاتیفەمان بەرامبەر بە جنس و خەلکی تر هەتا هەموو ئادەمیزاد هەبێت ، بەو شیوەیە زانستی ئەخلاق – کۆمەلایەتی – جوانی – هونەر – ئاین ... رەگ و ریشەی هەرهەمووی لەناو جنس دەدۆزیەوە)[61] ،بە پێی چارەسەری مدرسەی فرۆید رزگارکردنی کۆمەل لەو هەموو کۆت و زنجیرە دا لەڕزگارکردنی ئافرەت دەدۆزیتەوە ،رزگارکردنی ئافرەتیش لە رزگارکردنی دامێنی دەدۆزیتەوە

---

[58] – تیبینی : لەهەلسەنگاندنەکان ئەو سەرەنجامە شێ بکەوە کەراست نیە ئەوەی راستیشە فگری نیە بەلکو لە هۆیە کۆمەلایەتیەکان پەیدابوون

[59] – نظرية الجنسية ص ١٤٠

[60] – ص ١٤٤

[61] نشاطة الجنسى ص ١٢

کەلەبەردەستی یەکێك نەبێت بەناوی مارەیی وتاك مێردی و ..بۆیە داوا دەکا هەموو ئەو کۆت وزنجیرانە هەلتەکیٚ و سەربەستی بدرێتی ، دەلێت: (رزگاری جنسی بنچینەی رزگاری کۆمەلایەتیە بە هەموو پاشکۆیەکانیەوە) ...،واتە ئەگەر دامێنی ئافرەت بەرەڵاکرا ئەوا ئافرەت وکۆمەل پێکەوە رزگاریان دەبێت ،دەیەویٚ بلیٚ هەمو کێشەکانی جیهان لەوێیە،جەنگی جیهانی وفلستین وکوردستان و هەموی.

دیارە ئەو مدرسەیە هەر نووسەرو قوتابی نیە بەلکو زانا و فەیلە سوف و لایەنگریش هەیە، ئەوەتا (شۆبنهاور) دەلیت (الغريزة الجنسية هي توكيد الأكبر لإرادة الحياة[٦٢]) ، لەسەر ئەو بنچینەیە ئەو مدرسەیە پێی وایە سەربەستی ئادەمیزاد بەگشتی و ئافرەتیش بەتایبەتی یەکجاری بەوە بەرەلا دەبیت کەسەربەستیە جنسیەکەی لەزیندانی فەرهەنگ و نەریتی کۆمەل وئاین ویاسای نەگونجاو رزگار بکریت ،لە پێش هەموویانەوە مەسەلەی (عەیبە) لەو بارەیەوە شاعیری کورد فایق بی کەس دەلیت:( یەکەم دووژمنی سەرکەوتن و گەورەترین سوپەری کۆنەرپەرستی عەیبەیە )، بۆیە زۆربەی رایە کلاسیکیەکان و ئیستای رەوشەنبیرانی کورد بەشیعر و نوسین تیٚ ئالاون ووایان زانیە ئەگەر ئەوە نەلێی مانای پێش کەوتن نادا [٦٣]، فرۆیدیش دەلیت (ئەونەریت ودەستورو فەرهەنگە کۆمەڵایەتیانەی لەسەر عەیبە وشەرمە دروست بوە گەورەترین گوشاری دروست دەکات لەسەر سەربەستی ئادەمیزاد بە نێرو مێیەوە )، زیاتر لەوە (عدنان عبدالرحیم ) روونی دەکاتەوە و دەلیت (ئەودەزگا کۆمەلایەتیانەی وەك خیزان . دەسەلات . پیاوەتی . ئەخلاق .. ئەوانە داپلۆسینەرو کپ کەرەوەی سەربەستی ئادەمیزادن ([٦٤])، دیارە بەشی هەرە زۆری ئەو داپلۆسینەش بەر ئافرەت کەوتووە مادام لاواز ترین ئەلقەی کۆمەڵایەتین ، بە هەلتەکانی ئەو گوشارو داپلۆسینەی جنسی بەیەکجاری ئافرەتیش دێتە ریز پیاو ، بەلام لەهەمان کاتدا (فرۆید) دانی بەمەترسیەکی تریش ناوەو بە ئاشکرا دەلێت (هەتا کارکەری جنسی لەپەیوەندیەکانی ئادەمیزاد دا بەهیزتر بیت پەیوەندی مرۆڤانە کەمتر دەبیت )، بەلام ئەوەی پیٚ گرنگ نیەو دەگەڕێتەوە سەر ڕایەکانی( نیتچە و پلۆنۆس و مارکس وهۆبز

---

[٦٢] كامل فواد –الفرد في فلسفة شوبنهاور ص٩٢

[٦٣] لە بەلگەنامەی بریتانی Fo.370/671,secret Ref.c/s/3لە ١٩٣٨/٤/٢٦ کە گوزارش لە نامەی ج س اولسن دەکا وباس لەوە دەکا کە بەشێك لەکوردەکان کە خۆیان بە عەلمانی ناوزەد دەکەن کە چاویان بە ئێمە دەکەویٚ مەشروب دەخۆنەوە وئافرەتی سفور پیشان دەدەن تا ئێمە پێیان بلێین پێش کەوتونە .

[٦٤] – فرۆید والطبيعة اللاانسانية ص ٧٨

و..) دەلێت: ئەوە سروشتی ئادەمیزادە (لاواز ترین پەیوەندی لەنیوان خەلکان هەرگیز پەیوەندی مرۆڤایەتیە ) ([٦٥])، واتە لەو کاتی کێشەی ئافرەت چارەسەر دەبیٚ کە مرۆڤایەتی هەلدەتەکیٚ ، سەرنج بدە گەیشتۆتە چ فەوزایەك زۆربەری نووسین و بانگێشەکانی ئێستای عەلمانی کوردیش بەو ئەنجامە ناکۆك و بی سەرو بەرانە دەگات ئەگەر کەمێك لیٚ ی قول ببیەوە. بۆیە فرۆید هەولێکی تری داوە بۆدۆزینەوەی بنچینەك کە بەبریارو یاسا یەکسانی نێرو میٚ گوزارش نەکریٚ، بەلکو بنچینەیەکی بایۆلۆجی تۆکمەی وابیٚت دەمەتەقیٚ هەلنەگری ،بەلاٚم پێش ئەوەی ئەو گەلاٚلە پێش کەش بکات ڕوو بەڕووی دووکێشەی کوشندە بووە ، بەقەناعەتی خۆی دەبێتە جیاوازی نیوان عەقلی ئافرەت وعەقلی پیاوە بەو شێوەی خوارەوە:

یەکەمیان – عەقلیەتی ئافرەت سەرقالی (مندال بوونە ) ،زۆربەی مێشکی پەکی بەوە کەوتووەو ناتوانی بپرژێتە سەر بوارەکانی تر،یان هەربنچینەیەکی سایکۆلۆژی بۆعەقلیەتی ئافرەت دادەریژی وەك خۆی دەلیت هۆی لێك جیابوونی نەفسیەتی ئافرەت و پیاو لەژیانی (تناسلی) دا سەری هەلداوە، کەبەدەوری خۆی کار لە( نیوەمیشکی تەرخان کراو دەکات و ئافرەت لەباریکی عەقلی جیا لەپیاو دەردەخا)([٦٦]) .

دوەمیان – ئەو جیاوازیە چەندایەتیەی لەقەبارە و سەنگی میشکی ئافرەت و پیاو هەیە ... نێوەراستی جیاوازیەکە دەکاتە ١٤٠٠ گم پیاو – ١١٣٠گم ئافرەت یەکسانە بە ٢٧٠ گم جیاوازی ([٦٧]) ،کۆمەلێك لەزانایانی نەفسانی وەك (بیل) – (ڕۆلف مارتن) ئینجا فرۆیدیش تۆماریان کردووە کە ئەو جیاوازیە لەقەبارەو کێشی مێشکی پیاو ژن ناگەڕێتەوە بۆ هۆیە کۆمەلاٚیەتیەکان، یان بۆ سەردەمێکی میژوویی ، بەلکو (وەك دەلێن )گەراون بەناو پاشکەو تووترین هۆزەکان بۆیان دەرکەوتووە کە ئەو جیاوازییە هەر هەبووە و هەر دەشمێنیٚ ،ئەوەشیان کردۆتە بنچینەیەك بۆ لاوازی عەقلی ئافرەت ،ئەو تێڕوانینە زۆر کۆنە لە ئەدەبیاتی یۆنانی و لە (رسالە السیاسە )ی ئەرستۆ وتەورات و ئینجیل و ئەو باسە هەیە ، بەو هۆیانە فەیلەسوف و قەشەی بەناو بانگ تومائەکوینی دەلێ ئافرەت نوقستان وپەراوێزی دروست کراوە ،شۆبنهاوەریش لە کتێبی (کلمات عن المرأە) دەلیٚ خۆ عەقلی ئافرەت بە قەد عەقلی پیاو نیە ئیتر بۆ ئەو زولمە لە پیاو دەکریٚ وبەئەندازەی پیاو مافی

---

[٦٥] - نظرية الجنسية ص١٣٨

[٦٦] – نظرية الجنسية ص ٩٣

[٦٧] – نظرية الجنسية ص٢٢٧

هەبێ ، لە بەشێك لە زانایانی ئیسلامیش ئافرەت بە (ناقصات العقل )هەژمار دەكا ، زۆربەی سەردەمەكان ئەو تێڕوانینە بۆ ئافرەت هەبوە بەتايبەتی لە ئەوروپا ،بۆیە فرۆید و زۆر لەزانایانی سەردەم لەهەل و مەرجی عەقلی و كۆمەلایەتی زەمینەی یەكسانیان نەدۆزیتەوە، وەك بی ئومێدیەك بەدوای هۆكارێكی لاوازی دەگمەنی وەك (یەكسانی هێزی گەشەكردنی توانای هەردوو ناوكی هێلكوكەی ئافرەت و سپێرمی پیاو) گەراون وەك لە ص١٧ كتیبەكە دەلیت (... هەردوولا (واتە سپیرم و هیلكوكە ) بەیەك قەبارەتێكەل دەبن كەرەنگە ئەوە بەلگەی كۆمەلایەتیمان بداتە دەست بۆیەكسانی مافی كۆمەلایەتیان )!... وابزانم ئەو ئەنجامەی پیێ ی گەیشتووە هیچ هەلوەستەی ناوی خۆی وەلامیشە بۆ خۆی .

**٣-چارەسەری شوشیالیزمەكان ولیبرال دیموكراسی**

پیشەكی دەبی ئەوە روون بكەینەوە كە چەندین جۆر سوشیالیستی هەیە، لە روانگەی ماركسی بێجگە لە (سوشیالستی زانستی ) ئەوی ترهەمووی یان روویەكن لەسەرمایداری یان هەرخەیالیە بەسوشیال دیمكراتیەوەش ، لەو بەشەدا چارەسەری كێشەی ئافرەت لەچوارچێوەی مانەوەی خیزانە ، بیێ گوێدانە قۆناغی میژوویی، ئەوچارسەریە لە گەوهەردا جیایە لەگەل چارەسەری شیوعیەتكە بینیمان، هەرلەبەر ئەوەی چارەسەریەكان هەمان چارەسەری سەرمایەدارین بۆیە لەوبەشە سوشیالیستی زانستیشمان دانا . سوشیالیستەكان پێیان وایە لەئەنجامی دابەش كردنی ئیش لە مێژوودا كێشەی ئافرەت دروست بوو،بە جۆرێك بەركەوتنی ئیشی ناومال بۆ ئافرەت و پیاویش بۆ ئیشی دەرەوە ئەوا سەرەتایی زولم و كەوتنی مافی ئافرەتە ، ، بۆیە لەئامانجەكانیان دا داوادەكەن كە ئافرەت هەموو كۆسپێكی لەپێش هەلگیریێ و بێتە دەرەوە، لە گرێبەستی (مارەیی)بۆ گرێبەستی تەوافوقی یان دەماو دەست ومەتعەو بازاڕی ، لەبەرپرسیاری ئیشی ناومال بۆ دەرەوە، بۆ ئەوەی هەردوولا (ئافرەت و پیاو) لەپایەی بەرهەم هێنان یەكسان بن، كە بنچینەشە بۆ هەموو یەكسانیەكانی تر، بە پێچەوانەی ئەوانە معمر قەزافی لە (كتاب الأخضر) باس لە چارەی ئابوری سۆشیالیستی دەكا بەلاَم چوونە دەرەوەی ئافرەت لە چوارچێوەی خێزان بە زولم لە ئافرەت لە قەلەم دەدا [٦٨]،هەرچەندە هەموو هێلە سوشیالیستەكان لەگەل بۆچوونی جیا جیا لەمەڕ پەیدابوونی ئەسلی كیشەكەن بەلاَم هەر هەمووی لەچاسەریەكانیان دا لە جەوهەردا دەگەڕێتەوە سەر

---

[٦٨] كتاب الأخضر ص١٤٧

چارەسەری سەرمایەداری- کە سەربەستیە،کەواتە بۆ ئەوەی وورد تر لەچارەسەری سەرمایەداریانە بگەین پێویستە هەلوەستە لەسەر فەلسەفەی سەربەستی بکەین .

**پرسی سەربەستی و چارەسەری گشتی:** فلسفەی (سەربەستی ڕەها- موتلەق) زادەی بیری بێ مەسئولیەتی فەیلەسوفە دوورکوژی نزیك خەسارەکانە، بەنج کەرە، هەلخەلەتێنەرێکە دەتباتەوە دنیای ئاژەل کەیاسای دەریاو دارستانی لێ پەیرەو دەبێ،بەهێز سەربەستە لە قووتدانی بێ هێز،لە باشترین دۆخیدا بە ناڕاستەوخۆ خوێنت دەمژی، کەرامەتت دەدزی ..ئەوە سەربەستیە دوور کوژیەکەی ئەو گوندەی عەولەمەیە ،ڕەوشەنبیری لای خۆمان بە ئاسودەی باسی عەولەمە وەك گوندێك دەکا ،نازانی باسی ئەوە بکا کەلە نێو ئەو گوندە چ باسە ؟ئایا هەمو وەك یەکن ؟سەربەستی مانای چیە لەوێ؟ بەکورتی لەو گوندە سەروو وخواروو هەیە ،سپی وڕەش هەیە ،تێر وبرسی ،دواکەوتەو پێش کەوتە ،ژێردەستەو سەردەستە ..هەیە ..ئەوانە لەئەنجامی فلسفەی سەربەستی ڕەها دروست بووینە ،لە ڕاپۆرتی نەتەوەیەکگرتوەکانی سالی ١٩٩٨ ودوایش لە کۆنگرەی جوهانسبۆرگ ئەوڕاستیەی خوارەوە لەوگوندە عەولەمیە لە ژێر سایەی سەربەستی سەری هەلداوە و تیایدا هاتوە : خەلکی سەروو(کەدەکاتە ئەوروپا و ئەمریکا) ٢٠٪ی دانیشتوانی جهان پێك دەهێنن کەچی لە ٨٠٪ی داهاتی جهان دەخۆن ،خەلکی خواروو(کەدەکاتە ئەمریکای خواروو ئەفریقاو بەش هەرە زۆری ئاسیا ٨٠٪ی دانیشتوانی جهان پێك دەهێنن کەچی ٢٠٪ی داهاتی جیهانیان بەر دەکەوێ ،ئەوەی هەرە زیان مەندیش دەبێت ئافرەتە مادام دوا ئەلقەی لاوازی لە زنجیرەی ئەو گوندە پێك دەهێنێ ، بەکورتی سەربەستی موتلەق سەرەتایی کۆمەلێك دەردە، هەموو چەوساندنەوەو دەردەسەریەکانی کۆمەل لەبێ سنوری پەیدا دەبیت، (لەوانەش بی سنوری سەربەستی )،بۆیە هیچ سیستەمیك لەو بوونەوەرە نابینی موتلەق سەربەستی بیت، خۆ ئەگەر یەك ( گەردیلە -زەڕە) سەربەستی تەواوی خۆی وەرگرێت ژیانی سەر زەوی تێك و پێك دەدات، با سەرنج بدەین داتلێشانی ناوکی لەژێر یاساو شریعەتدا دەبنە مەزن ترین پرۆژەی خزمەتی بەشەریەت، کەچی هەمان داتلێشان بە بێ قەیدوشەرت دەبتە بۆمبی ناوکی وێرانمان دەکات، ئەوجیاوازیە سادەیە لەنێوان کارەساتی بۆمبی ناوکی و پرۆژەی ناوکی خزمەت گوزاریە ، هەروەك بۆ هەموو شتیك سنورو رادەی خۆی هەیە، هاوسەنگی ئەو سروشتەمان دەپاریزی وەك: رادەی پلەی گەرمی ، رادەی شی ، ، ریژەی توخمەکان ... لەسروشت ، لەناو لەشی ئادەمیزادیش سنورو هاوسەنگی هەمان فرمانیان هەیە ، تێك چوونی ئەو هاوسەنگ و سنورە لە

لای سروشت گەورەترین کارەساتی سروشتی وەك زریان وگڕکان ولافاو .. پەیدا دەکات،لەنێوکۆمەل کارەساتی کۆمەلایەتی وەك برسیتی و چەوسانەوەو دابەش بوون و جەنگ و داگیر کردن و نەخۆشی ... پەیدا دەکات ، تەنانەت تێك چوون و ڕەت بوونی لە سنوری سروشتی سەربەستی دەبێتە دەرد بۆ خودی تاکەکەش ،بێجگە لەوەی سەربەستی خەلکی تر داگیر دەکا ئەوا زولم لەخۆش دەکات ،چونکە دەبتە دیلی ئارەزووەکانی ،دیلی گەدەو پارە و سێکس وتەلارو ...، جا با هەر خۆی بە سەربەست و سەربەرز بزانیت وەك (جۆرج جەداق ) گوتەنی ، ئەو ئارەزوانەی دەبێتە بەدیلی عەقلی بۆ کێی بویّ لێی دەخوڕی ،لە کۆتایدا لەعەژمەتا دەبتە دوودیلی و زالمایەتیکیش،یەکەمیان دیلی ئارەزوەکانی ،دوەمیش بەرامبەر دەسەلاّتداری گەورە ، لە دۆخی سێیەمیشدا دەبێتە زۆرداری لەوانەیلە خۆی بیّ هێز ترن- ئەوەش زالمایەتیەکەیتی ،واتە ئەو جۆرانە زالم ومەزلومن، لەو ئەنجامانەدا نەوەیەکی بەرژەوەندی پەرستی هیچ نەزان وا بەرێوەیە کە جگە (لەخۆم) « جیل الأنا The Me generation»[٦٩] هیچی تر نازانیت، ئەگەر ئەوە سەرەنجامی پێدانی سەربەستی بیّ سنور بێت بەهەمان شێوە بۆ شیوعەتیش قۆرخ کردنی هەموو سەربەستیەکانی ئادەمیزاد وەك (الزائد کالناقص) هەمان ئەنجامی سەلبی هەیە ،ئەگەر سەرمایەداری سەربەستی تاك بیّ سنوردەکا لەسەر حسابی سەربەستی کۆمەل وشیوعەت وسۆشیالیستیش سەربەستی کۆمەل زیاد دەکا لەسەر حسابی سەربەستی تاك ئەوا جهانی سێیەم سەربەستی تاك وکۆمەل بۆ دەسەلاّت قۆرخ دەکا ،سەربەستی وئازادی ژن وپیاو تیایدا قۆرخ دەبیّ ئینجا لە دۆخی وادا جارێکی تریش ژن دەچەوسێتەوە بەدەست پیاوی زۆردار ..چارەنوسی ئافرەت ئاوا دەبیّ، لەگەل زۆر سەرەنجامی خراتری (سەربەستی بیّ سنور و( زۆر سنورکراو) کە بوار نیە هەموی باس بکەین،کەواتە دەبێت سەربەستی سنوری ستاندەری خۆی هەبیت ، بۆیە ئیستا خۆشیان لیّ ی پەشیمانن لە مادەی لە جارنامەی (مافی مرۆڤ ) ودەزگای نەتەوەیەکگرتوەکان و ڕێکەوتننامە نێو دەولەتی و دەستورەکان سنوریان دانا ، جارێکی تر گەڕانەوە سەر پابەندی بە ئاین کە پێشوو تر بە ناوی ( بەعەلمانی کردن وئازادی) لێی دوور کەوتبوونەوەو زیانیان بەر کەوتبوو، هەر بەنمونە ناوو مادەی دەستوری ئەو وولاّتانە دەهێنین کە گەڕاینەوە سەر ئاین : لەدەستوری یۆنان لەمادەی(١)و(٤٧) باس لە پابەندی ئاینیەوە دەکەن بۆ کۆمەلگەکەیان ، دانمارك: هەردوو مادەی (١، ٢)، نەرویج: مادەی(١٢)، سوید: مادەی(٤)، کولومبیا: مادەی(٥٤)،

---

[٦٩] – ئەوە لەتازە ترین نووسیندا هاتووە بەناوی (تەنیا خۆم) .

کورسیکا: مادەی(٦٦)، سلفادور: مادەی(١٢)، اسبانیا: مادەی(٦)، برتغال: مادەی(٢٤)، بارکوای: مادەی(٣)، أرجنتين: مادەی(٢).. لە هەندێ وولاّت لایان بوویتە مەرج کەسەرۆك وپادشاکانیان سەر بەئاین یان مەزهەبەکەش بێت لەوانە: لەدەستوری سوێدی مادەی(٤) ، مادەی(٩) دەستوری ئیسپانی[٧٠]، **بەو شێوەیە** سەربەستی بیٚ سنور بە دەردو بەلاّ هەژمار کرا و هەر بەو شێوەش هەمو ئەو چارەسەریانەی بۆکێشەی ئافرەت دارژرا هەلوەشایەوە، وەك لە بەشەکانی داهاتوو زیاتر بۆمان دەردەکویٚ ، بەو جۆرەش بازدەدەینە سەر گرفتە سەرەکیەکانی سیستەمی ژیانی سەرمایەداری .

## گیرو گرفتەکانی سەرمایە داری بەگشتی

زۆر بەکورتی وپوختی باسێکی سەرپێی ئەو لایەنانەی دەکەین کە پەیوەستە بەبابەتەکەمان (کێشە ئافرەت) دەکەین:

**یەکەم- لەتیۆرەکان** : پێش هەموو شتێك چارەسەری ستاندەری هەرکێشەیەك چ زاستی چ کۆمەلاّیەتی راستەقینە وەك وەلاّمی بیرکاریە ، تاکە یەك وەلامی(uneaq= وحيد) ڕاست هەیە و بەس ،وەلاّمی ٣+٤یەکسانە بە ٧ ، وەلاّمی تریشی هەیە دەتوانی بلّێی ٩ ،١٥، ٦/٨..وەلاّمن بەلاّم وەلاّمی هەلّەو زیادەیە ،هەروەها چارەسەری کێشەی بەدادگەری یەك چارەسەری ڕاستەقینەی هەیە بەتەنها ،باقیەکەی تر چارەسەری هەلەن. بۆیە ئەو کۆمەلە چارەسەریەی سەرمایەداری دەیدات (uneaq=وحيد)نیە، هەردەمیش لەگۆراندایە،باشترین بەلگەیە کە هێشتا چارەسەریەکەی نەدۆزیتەوە ،لەگەل ئەوانەی خوارەوەش:

١- سەرجەم ئەو زانایانەی ویستویانە لەو قەیرانە میژووییانە بکۆلّنەوە هەلساون بەوەرگرتنی (پەلّەیەك -عەینەیەك)ولەسەری دا (تەعمیم) یان کردووە، یەکسەر تووشی دوو هەلەی کوشندە بووینە ، أ-هەلساون گەراون بەدوای دواکەوتووترین ناوچەوکۆمەلگە تویّژینەوەکانیان لەسەر هێلێك کردوووە، وایان زانیە دواکەوتووترین مانای نزیك ترینە لەچاخەکانی کۆن .

ب — ئەوان روانگە کۆنەکانی رۆمی(کە لەخۆیان زیاتر خەلکی تریان پیٚ بەربەر بوو) پێوەر و تەرازوەکانی خۆیان پیٚ تەرازوی گشتی بوە* ،ئەورویپان کردۆتە روانگەی هەموو کۆمەل و

[٧٠] بۆ زیاتر بروانە : الإسلام والعلمانية ... ص٢٢ هەروەها أ.د. وهبة الزحيلي- فقه الإسلامي وأدلته- ط٤ / ٢٠٠٤م ، دار الفكر المعاصر- ج٨ ص٦٣٥٦-٦٣٥٨

* ئەو دەردە لەنێو زۆربەی سیستەمە کۆنەپەرستەکانی جاران هەبوە ، بە غەیرە مەسیحی دەوترا (ئەسنی) ،بە غەیرە یەهودی دەوترا (جویم) یان ئومەمی ،بە غەیرە رۆمی ویۆنانی دەووترا بەربەر ، بە غەیرە ئەمەوی دەوترا (مەوالي یان علوج)،بە زانای

میژوو، بۆیە واسەرچیغ و دەستەرۆ بووینە . هەرچی دیراساتیان هەیە بەهەلە دا چووینەو تەمەنیکی کورتی هەبووە ،وایان زانیە کۆمەلگەی جیهانی (غەیرە ئەورووپی )مانای کۆمەلگەی کۆنەو ئەو توێژینەوانەیان کردوە .

٢- نیوەی چارەسەری هەرکێشەیەك لەکۆمەل بریتی یە لە(ئەخلاق)- جا ئەگەر بەرژەوەندی مادی بوو بەپیوەر ئەوسا (راستە ئەخلاق دەبتە نسبی) و (دوورترین پەیوەندی مرۆڤایەتیە)، ئەو کاتە هەرگیز هەتا ئەگەر یاسای راست و دروستیش دابرژیت ئەگەر ئەو ئادەمیزادەی پیادەی دەکات خۆی نەگەینرابێتە ئەو پلە هەست بەمەسئولیەتیکی گەورەی مەبەدەئی نەکات ئەوا بەنهێنی هەموو شتێك دەکات، کە هەرگیز رێی لێناگیرێت و ئەو دادگەریەش هەرگیز نایە تەدی هەتا : ا – یاسایەکی ووردوو بەعەیار ، ب – کۆمەلگایەکی بە ئەخلاق و بروا نەیەتە دی .

دووەم -لە واقیعدا

**هەلسەنگاندنێکی خێرایی مەدرسەکان :**

لە بەشەکانی ڕابووردوو تەنها ڕاڤەی ئەو ڕاو بۆچوونانەمان کرد هەلمان نەسەنگاندن ،لێرەدا هەلوەستەیەك لەو بارەیەوە دەکەین لە دیموکراسی دەست پیێ دەکەین کە بەشی هەرە گرنگی ئەو مەدرەسەیە :

دیمکراتی دەرمانیش بێت دەرمانی هەموو دەرد نیە وەك بەو دەقە لەبەرنامەی لایەنە کوردستانیەکان هاتووە ،هەموو کەس بۆی هەیە چۆن بیر بکاتەوە چ عقیدەو بروایەك هەلدەبژیریت، بۆی هەیە چ بلێ، بەلام بۆی نیە هەر چ بکات . ئایا هیچ سیستەمیك هەیە بێ رێك خستن و سنور (زەوابت) لەو سروشتەدا ؟هەتا لەسیستەمە کۆمەلایەتیە خۆرِسکە کانیش؟.. ،ئینجا خۆ "دیمکراتی" قوناغێکی کۆمەلایەتی نیە تەمەنی ٢٠ سەدە زیاترە ، خۆی ریبازی کۆمەلایەتی و سیاسی نیە بەلکو پەیمانێکی سیاسیە، وەك تاقیگە کێ لێی دەردەچێ و چ

غەیرە عەرەب دەووترا(شعوبی)، بەغەیرە براهمای هندۆسی دەوترا مەنبوز،بە غەیرە لاتین وئیسپان دەووترا (مۆر)... لەناو عەشایری کوردیش بە غەیرە عەشیرەتی خۆی دەوترا بێگانە ،هەریەکە لەوانە وای دەزانی ئەو دنیایە فراوانە بریتیە لەوان ،ئەورووپاش لەو دواییە وای بەسەرهات و خۆی بە سۆپەرمان ومرۆڤی پێشکەوتو و خەلکی تری ئەفریقی ودانیشتوانی ڕەسەنی ئەمریکی وئوسترالی بە لۆیەرمان و مرۆڤی کۆنە وەسف دەکرد و مێژوو واقعی جیهانی لەو ڕوانگە تەسکەی ئەورووپا لێك دەدایەوە دووچاری کۆمەلێك هەلەی مەزن بوویەوە یەکێ لەوانە ئەو بابەتەی ئیستامان .

ڕێبازێك گونجاو تر بێت لەڕێی پرۆسەی دیمکراتیەوە دەردەکەوێ تەواو ، ئێمە لەو مونتەلقەوە مەدرسەکان هەلدەسەنگینین یەکە یەکە.

**١ -مدرسەی لیبرال دیمکراتەکان:** لەراستیدا لێرە هەندێك لە خواستە باشەکانی ئافرەت داوا کراوە ،بەلام چۆنیەتی هێنانەدی گرنگە،بەگشتی چارەسەریەکان بۆهەر کیشەیەك لە (تەشخیصی) دەست پی دەکات،ئینجا دەردو دەرمانی بۆ دیاری دەکریٚ، جالیرەدا لەرایەکەی (ویل دیوراتت) دەست پی دەکەین کەپیٚ ی وایە مافی ئافرەت لەهەست بەلاوازی خۆکردنی لە(بی نوێژی) ڕا دەست پی دەکات، ئەوەش لە بنچینەدا لە کتێبی موقەدەس سەرچاوەی گرتوە کەتیایدا هاتوە : (وأية امرأة كان بها سيلان، أي سيلان دم من جسدها، تبقى سبعة أيام في نجاسة طمثها. وكل من لمسها يكون نجسا حتى المساء. وكل ما تضجع عليه في طمثها يكون نجسا. وكل ما تجلس عيه يكون نجسا. وكل من مس مضجعها يغسل ثيابه ويستحم بالماء، ويكون نجسا حتى المساء[٧١]، ئەوەیان کاتی بەئاقاری راستی دەچێت کە لە پرێکا ئافرەت ئەو بی نوێژیەی (اکتساب) کردبێت بە هۆیەوە لە دایك سالاری کەوتبێت ، لەکاتێکا دەزانین لەوەتەی ئافرەت هەیە و هەتا هەتایەش ئەو دۆخەی هەر دەمێنی، کەواتە تیۆری (ویل دیورانت) دەگاتە ئەنجامێك کە هەر لەیەکەم کلپەی ژیانەوە ئافرەت چەوساوەتەوە، هەر واش دەمینیت، واتە ئافرەت فاکتەری خۆرسکی چەوسانەوەی خۆی لەگەل خۆی هەلگرتووە ، تەواو بیٚ چارەیە .

ئەوە (تشخیص)ەکەیە، واتە دەرمانی نیە ، هەرچی ڕایەکانی (راسلە) هەرچەندە خراپترین چارەسەری داوە،دوای خۆشی لە هەموو ئەو ڕاو بۆچونانەی لە کتێبێکی تر بەناوی (الف باء النسبية )[٧٢] پشێمان بوویتەوە، خۆ مەسەلەی خێزان (عائلە) هەرمەسەلەی جنسیەکە نیە تا بە (حەبی مەنع) چارەسەری بکرێت، ئەو چارەسەریە گشتیەی لەو مدرسەیە هاتووە زۆربیٚ مەسئولەیەتە ،وەك وەلامەکەی لەچارەسەری ئیسلامی لە بەشی داهاتوو دیاردەکەویت ، کەئەو جۆرە سەربەستیەی ئافرەت چۆن دەردێکی سەرباری تری بۆ زیاد دەکات، هەروەها لەمدرسەی فرۆیدش وەلامەکەی بینرا، جا ئەو نمونەیەی (لیستەر وورد ) یش هیناویەتەوە لەسەر خێل (ئویامبیا) دەبا بەجورئەتەوە وەلامی ئەوەش بداتەوە ئاخۆ دۆخی ئافرەتان لەویٚ چۆنە ؟ ئەوانە و

---

[٧١] سفر اللاويين ١٥/١٩-٢٢

[٧٢] بۆ زیاتر بروانە : براتراند راسل-**الف باء النسبية** لە ص١٤٣- بەدواوە باس لە سەرەنجامە فلسفیەکانی تیۆری نسبی دەکا ودەلیٚ هەموو بیرو بۆچونەکانی گۆڕیوین .

نووسەرانی خۆشمان بەچاکی نەیان توانیوە کێشەی ئافرەت دەست نیشان بکەن ،ئاخۆ چەندی هۆیە سروشتیەکانەو چەندی سیستەمی ئەو کۆمەلایەتی وچەندە یاسا لێی بەرپرسیارە .. بۆیە شلم کوێرم رەخنەکانیان راوەشاندووە بەرەو تاریکی، نازانین لەگەل کێیتی؟ لەهەندێکیان رەخنەیان لەسروشت گرتووە ، هەندێك لەبایولوجی و هەندێکیشیان ئایین وکارتەکانیشیان تێکەل کردوە تیایدا تاوانباری ڕاستەقینە بزرە ،ڕاستەکەی ئەوەیە کۆمەلی بێ دادگەری لیّ ی بەرپرسیارە ، ئەوگۆتانەی نەریتی ڕۆژئاواو ڕۆژهەلات و جهانی سێیەمیش لەبارەی ئافرەت دەیلێن دروست نیە ،بۆیەئافرەت ئادەمیزادە نەك ڕێوی و گورگ، زالم وزۆردار گورگن چ پیاو بێت چ ئافرەت — ئەقلیشی کورت نیە ،ئەوەی دواکەوتوە ئەقلی کورتە جاچ پیاوبێت یان ئافرەت — چاویشی برسی نیە بەلکو برجوازی چاوبرسیە، قامچیش بۆ پیاو ئافرەتی خراپە نەك تەنها بۆ ئافرەت ..بۆیە ئەو مدرسەیە وورد نین ،هەر ئەسلەن لەو مدرسە گرنگی بە تاك بەگشتی نادرێت  تاگرنگی بەتاکی ئافرەت بدرێت ،لەو مدرسەیە و کۆمەلگەی رۆژ ئاواش واقعەکەی وایە بەرژەوەندی مادی تایبەت لەسەرووی  بەرژەوەندی گشتیە،، بۆیە دەبینین لقی لاگرنگە نەك ئەسل ، چارەسەری نەك خۆپارستن ، کەمالیات نەك (زەروریات) ،سانەویات نەك (اولیات) ،سەتحی نەك بنەرەتی، کەمایەتی نەك زۆرایەتی ، شکلی نەك جەوهەری، ..ئیتر مافی ئافرەت شوێنی لەو هاوکێشەیە لەکیّ یە ، لە ١٤/دیسمبر/١٩٦١وە بڕیاری ژ :١٥١٤ی خولی١٥ی نەتەوەیەکگرتوەکان دەرچوە، تیایدا  چەسپاندنی یەکسانی ژن وپیاوی بە مافی چارەنوسی گەلان بەستەوە ،جیّ بە جیّ نەکراوە کەسیش بە دواشی داناچیّ ، لە مادەی ١٢٢ و١٢٣دەستوری سۆڤیەتی جاران بڕیاڕی یەکسانی ئافرەت وپیاو دراوە، زۆربەی دەستورەکانی جارانی ئەوروپا ئەو داوایەی لیّ هاتبو، کەچی ئیستا بەدەگمەن دەستورێکی رۆژئاوا دەبینی ئەو داکۆکیە بە هێزە لە مافی ئافرەت بکرێت ،بۆ یەك ووشەش ناوی ئافرەت لە دەستوری ئەمریکا نەهاتوە[٧٣] ،دەستوری فرنساش باسی ماف ویەکسانی ئافرەتی تیا نیە [٧٤] کە ئەوانە سەرمەشقی ڕۆژئاوان،لەنێو سەرمەشقی دیموکراسی عەرەبی دەبینین دەستوری لبنانیش ئەو باسەی تیانیە [٧٥] بەو شێوەیە ئەوانەی پێشوو بانگێشەی

[٧٣] دەستوری ئەمریکا لە ٧مادە پێك هاتوە، لە ١٧٨٧/٩/١٧ دەرچوە .

[٧٤] دەستوری فرنساپێك هاتوە لە ٩٢ مادە لە ٤/ئوکتوبەر/١٩٥٨ دەرچوە .

[٧٥] دەستوری لبنان پێك هاتو لە ١٠٢ مادە ،بە پێی یاسای دەستوری ژ:١٨ لە ١٩٩٠/٩/٢١ دەرچوە

مافی ئافرەتانیان دەکرد وازیان هێناوە ،بۆ دەست نیشانی دەردەکەش دیارە شکستی هێناوە وەك لەسەروش ووتمان دەرمانەکەشی دەرناچێ وەك دەرنەچووە .

**٢ -مەدرەسەی فرۆید** ، چەند تیبینی یەك:

ا- فرۆیدش وەك مارکس هەریەکەیان لەروانگەی پسپۆریەکەیان کەیەکەمیان بایولوجی و دووەمیان ئابووری ناسی بوو ویستویانە کۆمەلی پیێ بناسن ، ویستویانە بەبەفاکتەرێك هەمەمووجم و جۆلی کۆمەل لیك بدەنەوەو...بە خێرایی شکستیان هێنا.

ب-ئەگەر بەووردی تیبینی رایەکانی فرۆید بکەین ،ئەوا(جنس) بەپالنەری میژوو و پیش کەوتنی کۆمەل و پەیدابوونی خیزانیش دادەنی ، زۆریش دەمەقالی لەسەر کراوە ،بەلام یەك پرسیار : خۆ هەموو ئاژەلیش پالنەری جنسی هەیە بۆ خێزان و پیش کەوتن و شارستانیان نیە ؟!

ج-رایەکانی فرۆید تێك ناکەتەوە لەگەل زۆربەی رایەکانی (فەیلەسوفانی تەتەوری) و (مارکسیەکان) و هەتا ووجودیەکانیش ... بەڕای فرۆید پەیدا بوونی خیزان لە (پیاو سالاری) دەستی پی کردووە .

د-ئەو کۆمەلەی کەپیاوەتی و عەیبە و راستگۆیی و بەزەیی و هاوکاری مرۆڤایەتی و یاساو حوکم و ... هتد تیا نەمیێت وەك فرۆیدو تەیارە بەناو مۆدیرنەکان داوای دەکەن ،لەو کۆمەلەدا بۆچوونەکەی فرۆیدی لێ دیتەدی کەدەلێت (پەیوەندی مرۆڤایەتی هەرگیز لاوازترین پەیوەندیە لەنێو ئەو کۆمەلگەدا ) ،لەوەیٚ بەهێز بیٚ هێز قووت دەدات زۆر کەم دەبات، گەورە بچوك هەلدەلوشی ...جا نازانریٚ لەو جەنگلستانە ئافرەت بە چ ڕزگاری دەبیت؟

ع- هەرگیز ئەوە راست نیە کەئافرەت بیٚ عەقل بێت لەبەر سەرقالی بە زاوزیٚ ، یان لەبەر کەمی کێشی میشکی وەك فرۆید وبەشێك لە دەروونناسەکان بانگێشەی بۆ دەکەن وپێش تریش لەلایەن ئینجیل وتەورات وبوزی ویۆنانی وچینی وبەشێك لە فیقهی ئیسلامی وای بۆچووینە ، ئەو بۆ چوونانە کەم کردنەوەی نرخی ئادەمیزادە بە گشتی و ئافرەتیش بە تایبەتی ، خۆ پلەی چالاکی عەقلی ئادەمیزاد ناکەوێتە سەر قەبارەی میشك ،ئەگەر وا بوایە دەبوایە ئادەمیزادە سەرگەورەکان هەموو زانا بوونایە – زیاتر لەوە عەقل ئەو هێزە مەعنەویە نامادیەیە کە بەتەنها مێشك لێی بەرپرسیار نیە، خۆ بەکتریا مێشکی نیە و کۆئەندامی دەماریش نیە کەچی ئەقلی هەیە؟ مێشك وعەقل وەك درەختو بەر نیە ،یان وەك پەنکریاس

وئەنزیم بێت ،واتە عەقل تەنها زادەی مێشك نیە تا قەبارەی مێشك بەو شێوە یە كاریگەری لەسەر پایەو هێزی عەقل وبیركردنەوە هەبێ ،بۆیە كەمی كێشی میشكی ئافرەت كاریگەری لەسەر بیرتیژی و بیركۆلی ئافرەت ناكا .

ق- لاواز ترین پاساووچارەسەر كە لە ئاستی نێو دەولەتی دراوە ئەو گەلالەیەی سیگمۆند فرۆیدە كەدەڵێ :مادام سپیرم و هیلكۆكە بەیەك قەبارە تیكەلی یەك دەبن ئەوا دەبتە هۆی ئەوەی ئافرەت وپیاو یەكسان بن،بەوە یەكسان نابن ،مەرجیش نیە یەكسانی دادگەری بێت ومەرجیش نیە یەكسانی چارەسەری كێشەی ئافرەت بكا، یەكسانی لەگەل چ جۆرە پیاوێك ؟لەگەل سەروو یان خواروو ،ڕەش یان سپی ،داگیركەر یان داگیركراو،زالم یان مەزلوم...خۆ پیاو یەك پۆل نین .

**٣- مدرسەی سۆسیالیزمەكان .... چەند تیبینی یەك**

ا-بەشی زۆری تی بینیەكان لەسەر شیوعیەت دەرەنجامەكەی بۆ (سۆشیالستی زانستی)یشە بۆیە دووبارەی ناوێ .

ب- هەندی لەو هێلە سوشیالیستانە هەر خەیالین(كە پێیان دەلێن سۆشیالیستی تۆباوی)، هەندێكیشیان هەر بەشێكن لەڕایەكانی سەرمایەداری ، واتە ناتوانین بە (شەبەنگ-مەنزومە)ناویان ببەین ،چونكە زۆر لێك دوورن ،تەنانەت (سوشیال دیمكراتیش)كەجاران گوایە لە سۆشیالیستی زانستی(ماركسی) نزیك بووە سەرجەم ٢٨ جیاوازی بنچینەیی هەبوە، ئیستا زۆر نزیك بوویتەوە لە سیستەمی سەرمایەداری ،جارانیش ئەو گومانەی لەسەر بوو بۆیە لەلایەن (انجلسی) و (لینین) وستالین بە دو وروناوزەد كراون .

ج- بائەو چارەسەریە ئەستەمانەی لەو مەدرەسانە دراوە سەبارەت بە كێشەی ئافرەت بە خەیالیش بێت تەقەلای پەیڕەوی بكەین ، بەهۆی هەلگێرانەوەی دابەش كردنی (ئیش و كار) ، واتە ئیشی دەرەوە بدرێت بەئافرەت ،ئەوا نمونەمان زۆرە كە ئافرەت لەقۆناغی كشتوكالی ئیشی دەرەوەیان دەكرد، خۆئیستاش لە زۆر شوێن دۆخی وا هەیە، لای خۆشمان هۆزی دۆمەكانی هەر ئافرەتە ئیش دەكات پیاو دادەنیشن ، بەگشتیش بیوەژنەكان خۆیان سەرۆك خیزانن ...، كەچی هیچی چارەسەری نیەو بەلكو زیاتر چەوسانەوەی ئافرەتە .

د- هەروەها لێرەش داوای سەربەستی ئافرەت دوورلەهەموو كۆت و زنجیریك دەكات كەخالی هاوبەشی هەموو مدرسەكانە ،بۆیە بەكورتی وا ئەنجامە خراپەكانی سەربەستی جنسی و كۆمەلایەتی

بەکورتی تۆمار دەکەین کەچۆن چارەنوسی ئافرەت وێران دەبێو تەنیا کۆمەلە دڕندەیەکمان بۆ دروست دەکات:

١- پەیوەستی خیزان شلوق دەکات و ڕەنگە هەر هەلی بوەشێنیتەوە کە ئەویش بەدەوری خۆی کۆمەلیك ئەنجامی ترسناکی تری دەبیت.

٢ – جوانەکان داگیر دەکرێن لەلایەن دەسەلاتدارەکان و ناشیرینەکانیش دەمێننەوە .

٣ – ئافرەتە بە تەمەنەکان (پیرێژن) و پەك کەوتوەکان و ئافرەت لەکاتی عوزر وەك منال بوون بی نویژی کیّ لیّ ی بەرپرسیارە دەبیت و چارەنووسێکی ڕەش چاوەڕوانیان دەبیت .

٤ – مندال بی سەرپەرشتی و بی پەروەردە و بی عەقل و لە کۆتایدا کۆمەلە مرۆڤێکی دڕندەت بۆ بەرهەم دێنیّ .

٥ – پیش کەوتنی شارستانی رادەوستی و دوایش دەمرێت .

٦ – پرۆسەی بەرهەم هێنان زۆر کز دەبێت و کارەساتی ئابووری دەروست دەکات .

٧ – کۆمەلێك کارەساتی تری فکری وکۆمەلایەتی وئیداری وفەرهەنگی وشارستانیو ئابوری ... هەتا تەندروستیش دروست دەکات، ئەوەتا نەخۆشی ئایدز یەك لەو کارەستانەیە .

## گرفتی ئافرەت لەسەرمایەداری ئیستادا

**واقعەکەی** : ، لەو سەردەمە سەر مەشقی جیهانە، هەر چۆنێك بێت لە جیهانی موسولمان نشین چاکترە ،مەسەلەی سەرمایەداری وەك شیوعیەت نەبوو، چونکە شیوعیەت نەهاتەدی ، بەلام سەرمایەداری ئەوەیە کە چەند سەدەیەکە وادەبینین لە واری جێبە جێکردن دایە،لەوەی چاکتری پیّ نیە ،ڕەنگە خراپتر وەك کارل مارکس لیّی پێش بینی کردووە لە کتێبی (نظرية بؤس المتزايد)، مارکسیەت لەهەناوی عەیب وعاری سەرمایە داری پەیدابوو . ئیستاش لەدوای ئەو شکستە گەوەرەیەی شیوعیەت لەو هەلبژاردنانەی دەکریّ و بەرێوەیە میللەتانی ناوسەرمایەداری بەبازنەیی هەرجارەی ڕوو لەیەکیّ لەو خولگانەی: شوعیەت – سۆشیالیستەکان – لیبرالیەکان ... دەکەن ،بیّ ئەوەی یەکێکیان روو لەزیادی بێت،ئەوەش دوو بەلگەی بەهێز دەدات: یەکەمیان –نەبوونی بەدیلێکە جاریّ بۆ سەرمایەداری ، دووەمیان – خودی سەرمایەداری نەخۆشیە نەك چارەسەری . ئەوسەربەستیە جنسیە

بێ سنورە لاسەنگیەکی تری خستۆتە سەر دەردەکانی ئافرەت، بۆیە مارکسیزم یان هەرفلسفەیەکی تر بەخێرایی گەشە دەسەنێ ،وا گیرو گرفتە کوشندەکانی کۆمەلایەتی وئابووری وئەخلاقی ناو سەرمایەداری زۆر بەخیرایی بەدوای بەدیل و چارەسەر دەگەرێ لەدەرەوەی ئەو فلسفانەی کە تاقی کراوەتەوە . ئێستا هیچ کەس هەتا بێ زانیاریەکانیش جورئەتی ئەوەی نیە بلێ ئەوەیە نمونەی مافی ئافرەت لەشارستانیەتی سەرمایەداری، کەواتە ئافرەت لەکێشەو مەینەت دایە ، خۆ پیاویش وەك چین وەك رەگەز و نەتەوە و .... دەچەوسێتەوە چ جای ئافرەت، کیشوەریك بەدەستی کیشوەریك دەچەوسیتەوە ،ئەوان خەلکی دنیای سێیەم و رۆژ هەلاتیان پی ئادەمیزادی تەواو نیە ، بەلام بەداخەوە زۆر خەلکی رۆشنبرەکانیشمان زۆر بەچاو حوکم دەدەن نەك بەعەقل ،بەو سەربەستیە هەلدەخەلەتین کە مینێکی زلە لەژێر مرۆڤایەتی ، بەشی هەرە زۆری کێشەی ئافرەت و بەندایەتی و چەوسانەوەکەی شاردراوەتەوە .لەرووی ئابووری گەورەترین دزی بەرەسمی دەکرین لەرێی (ربا وزێدە بایی وزیادەو نەبوونی ئابووریەکی ڕاستەقینە لە سیستەمی سەرمایەداری کە سیستەمی بانکەکان پەیرەوی دەکەن)) لەڕاستیدا ئەوە سیستەمی سەرمایەداریە کێشەی ئابوری بەشەریەتی پێ چارەسەر نابێ ودەیداتە پاڵ زیادی ژمارەی دانیشتوان ،تەنانەت هاتنەوە کایەی تیۆری نەفامی (وأد الأطفال) یان تیۆری مالتۆس لە هەناوی قەیرانەکانی سەرمایەداریەوە هەڵدەقولێتەوە،ئەگینا(بە پێی ئابوورییناسان) ئەو زەمینەی ئێمە دەتوانێ ژیانێکی بەختەوەروتێر بۆ ١٤ملیار مرۆڤ(کە دەکاتە دوو قاتی دانیشتوانی ئیستا) ئامادە بکا لە ژێر سایەی سیستەمی دادگەری ،بۆیە چارەی سەرمایەداری بۆ تەواوی بەشەریەت سەقەت وبێ بەرپرسیارەتیە چ جای بۆئافرەت. هەتا لەرووی شەخسیش هەر بەرووکەش سەربەستن، ئەگینا وەك (رۆسۆ-لە عقد الاجتماعی) و (گارودی – لە اساطیر امؤسسة.. ) گوتەنی لەهەموولایەك بەکۆت و زەنجیر پێچراون ، (محمد باقر صدر) یش دەلێت ئەو جۆرە سەربەستیە بە پێچەوانەی بەندایەتی خودا کە بە بەندایەتی دەست پێ دەکات بەسەربەستی کۆتایی دێت بەلام لە سەرمایەداری بەسەربەستی دەست پی دەکات بە بەندایەتی هەموو لایەك کۆتایی دێت [٧٦]، جا یان بەندەی ئادەمیزادی یان دەزگایەك یان هەر چ نەبێت بەندەی یەکێك لەئارەزووەکانیەتی ...، بۆیە ئەو جۆرە سەربەستیە نەخۆشیە وەك ڤایرۆسی بلاو دەبیتەوە و رێکخستن تێك دەدات ، بنەماکانی رژیم و مرۆڤایەتی هەلدەتەکێنی، هەر بۆیەش زۆر پیویستە بەرگری لی بکریت ، لە ڕاستیدا جوانی ئەو

[٧٦] محمد باقر الصدر -الإنسان والمشكلة الإجتماعية ص٨٦

ئازادی وسەربەستیەی لە دنیای سەرمایەداری هەیە لە چاو ناشرینی ودیکتاتۆریەتی سیستەمی سیاسی جیهانی عەرەبی و هەندێ وولاّتانی موسولمان نشین جوان دەردەکەوێ ،ئەوەی ئێمەهیوای بۆ دەخوازین نەئەو نمونانەی دەسەلاّتدارانی عەرەبە نەئەوەی کوردە ،نەمێژووی سیاسی ئەمەوی وعەباسیشە ،بەلکو بەتەرازووی ئەو دادگەریەیە کە هەمو لایەك بانگێشەی بۆ دەکەن ،لە چاو ئەوە سەرمایەداری ناشرینە ،ئازادیەکەی سەلامەت نیە ، ئیستا بەنمونەیەك لەسەربەستی چۆن میللەتێکی بی دیل دەکرێت و لەقازانجی بالا دەستتان دایە ...لە فلستین هەرکەسێ مولکی خۆی هەیە و بەوپی یە سەربەستە چی لیّ بکات ، بەو شێوەیە یهودیەکانی لێیان دەکرین و .... ئەو پرۆسەیە بەرەبەرە دەبتە هۆی ژیر دەست کردنی هەموو خەلکی فلستین کە لەسەرەتادا بەسەر بەستی دەستی پی کرد بە بەندایەتی و داگیر کردن کۆتایی هات ، داگیرکەرانی کورد بەتایبەتی لە عیراقی سەردەمی حزبی بەعس بەو ئازادیە تەعریبیان نەدەکرد کوردیان لەسەر مال ومولکی خۆ دەردەکرد و عەرەبیان دەهێنا شوێنی ،واتە ئەگەر لە فلستین بە ئازادی سەرمایەدرانە پرۆسەکە دەستی پیّ دەکرد وبە داگیرکاری ودیلی کۆتایی دەهات ئەوا لێرە بە سۆشیالیستانە و بە زۆری و دیلی دەستی پیّ دەکرد هەربەدیلیش کۆتایی دەهات ،ئەوانەی بەو بەدکاریانەش هەلدەستان هەر دیلی یەکێکی تر دەبوون ، هەموو ئەو مەسەلانە وەك مسەلەی فەرموودەی (پیغمبەر دخ ) لەبارەی سەربەستی و پاپورەکەیە چۆن لەدوا ئەنجامدا سەربەستی ڕەها دەبتە هۆی نقوم بوونی پاپۆرەکە . واتە سەربەستی رەهای ئاوا کۆمەل لەکۆمەلایەتی نقوم دەکاتە ناو ئاژەلایەتی، کەتیایدا زۆر دارو بەهێزو چەوسینەران بالا دەستن .

هەرچی مەسەلەی ئەنجامە واقیعەکانن بەپێچەوانەی بۆ چوونەکانە .. نایەکسانی لەکۆمەلگای سەرمایەداری کە لە ڕێی ئەو جۆرە ئازادیە دێتە دی زۆر زیاترە لەجیهانی سێ یەم ،باباسی سەربەستی شەخسی نەکەین کەبینیمان تەنانەت (کیشەی محجبات) دەنگی دایەوە و قەدەغەی کچە محەجەبەکانیان دەکرد لەزۆربەی قوتابخانەکانی ئەورویی هەروەك لە تونس وتورکیاش واباوە ، ئێمە باسی سەرەنجام و هێلە گشتیەکان دەکەین، بابزانین لەرووی سیاسیەوە لەهەموو ئەورویا دا ئیستا ٢٠٠٩-١١-٢١ چەند سەرۆکی حکومەت ئافرەت هەیە ؟زۆر کەم هەبوە ، کەچی لەجیهانی سێ یەم لەتورکیاو پاکستان وسریلانکا و بنگلادیش وهند و چەند شوێنیکی تر لی ی بووە ،وا لێشی دەبێ، ئینجائەنجومەنەکانیش: لەسودان ٢٧ ئەندامی (پەرلەمان) ئافرەتە،دامەزرێنەری بەرنامەی ناوکی ئێرانی ئافرەتە، لەرووی زانست و رەوشنبیریەوە هەرئەو سەربەستیە بیّ سنورە وای لەئافرەتان کردووە

بی بەرنامەبن و هیچ زانایەکیان لیٚ هەل نەکەویٚ* ، (س .فرۆید) خۆی وبەشی زۆری زانایانی ئیستایان دانیان پیا هیٚناوە کە ئەو کۆمەلگەیە بەرە و نەزانیەکی سەرخۆشکەر بەریوەن، ئەرکیان تەسك کراوەتەوە تەنیا بۆ رابواردن ،لەئامارێکی سەرسوڕهینەر لەسالی ١٩٩٤ لەبریتانیا دەرکەوت لە ٦٠٪ ی نەوەی نویٚ نازانن (مارگریت تاتشر) لەسەرۆکایەتی وەزیران ماوە یان نا ؟ ئەمریکا و وولاتانی ئەورپاش لەئاماری وا بەردەوام ئەو رەوتە دەردەخا،وا نەوەیەکی بیٚ ئاگای مادی خۆ پەرستی لی وەبەرهەم دیٚت ،وەك لەتازەترین تویٚژینەوەهەر هەموویان دانیان پی هیناوە[77]، کەچی لەجیهانی سیٚیەم لەڕووی فکرو زانست ئافرەتان لەگەشەسەندنیٚکی خیرا دان ، بۆیە وا چاوەروان دەکریٚت پیشرەوایەتی شارستانیەت لەدەست رۆژئاوا وەرگیریٚتەوە بەم زووانە . لەکۆمەلگای سەرمایەداریدا ئافرەت تا ئیستاش شەخسیەتیٚکی سەربەخۆی نیە، ئەوەتا هەرکە میٚردی کرد بەکیانە وە دەتویٚتەوە لە فەرهەنگ وڕەچەلەکی پیاوەکەی ،سەرنج بدە (نانسی کینیس رونیس) ئەو ئافرەتە بووە خیزانی (روونالد ریگان) یەکسەر بووە (نانسی ریٚگان)، بەو شیٚوەیەش (دانیال میتران) و..هتد[78] ،باهەرچەندە ئافرەتەکەش زیرەك بیٚت، ئیٚمە نامانەویٚ لیٚرەوە دوور و قوولی بکەین ئەگینا تا دویٚنی لەئەورووپا دەمەقالی لەسەر ئەوە بوو ئایا ئافرەت ئادەمیزادە و تەواو روح لەبەرە یان نا[79] ؟ دادگایی لەسەرە یان نا ؟ نەك هەر کنیٚسە ئەو هەلویٚستەی هەبیٚت ، بەلکو سەرجەم شارستانی ئەورویپا وابوە ، دوعایەك هەیە لەلایەن حاخامی الیهودی ( الرابی ) — پیٚش نویٚژ دەیلیٚن **: یا ربّ أشكرك لأنك ما خلقتني إمرأة**،ئەوەش سەرچاوەکەی لەتەورات وئینجیل وەردەگرت کەپاش کەمیٚکی تر باسیان دەکەین ، ئەوەش هەمان دوعایەکەی یۆنانیەکانە کەدەیان **ووت سوپاس بۆ خوا کە نەیکردووینە ئافرەت ،لە چینیش بە هەمان مانا سرود هەیە**،لە ٣٠ شویٚن ئنجیل باسی ئافرەت ولقەکانی کردوە ،ئەوەندەش لە تەورات ولە٤شویٚنمیش لە (مەزمورەکانی داود)باس کراوە[80] ،هەموئەوانە نەریت

---

* جگە لە ماری کۆری(١٨٦٧-١٩٣٤) کە ئەویش بە ڕیٚکەوت ئەو دۆزینەوەی بۆ دەرکەوت.

[77] – کتابەکەی بەناوی (هەرمن) لەلەندەن دەرچووە .

[78] ئەو فەرهەنگە دەگەڕیٚتەوە بۆ ئاینی مەسیحی ویەهودی وشارستانی یۆنانیش ،بە پیٚچەوانەوە ئاینی ئیسلام تاکە ئاینە کە مندال بەناوی دایکیەتی وکەسیٚتی سەربەخۆیشی هەیە .

[79] رۆمانی کۆن ڕایان وابوو ئافرەت تەواو روح لەبەر نیە .،ئەوەش لە بنچینەدا لەڕایەکەی کنیٚسەی یۆنانی ئەو سەردەم دەهات کە پیٚیان وابوو ئافرەت کیانیٚکی بیٚ روحە ولە رۆژی دوای لیٚپرسینەوەی نیە .

[80] مەزمورەکانی داود بریتین لە ١٥٠ مەزمور ،دەقی ئەو مەزمورانە لە (الکتاب المقدس ط١،دارالکتب المقدسة فی الشرق الأوسط ص٤٢١-٤٧١ بخویٚنەوە .

وقسەی نەستەقی بۆ ئەو میلەتانە بە جێ هێشتوە، هەر بۆ پشكنین سەرنجێكی بە خێرایی بدەینەوە پەندەكانیان لەسەر ئافرەت، هەلبەتە پەندیش وەك (علم المتحجرات) بریتیە لەتۆمارگای فەرهەنگی مێژوویی ئەو میللەتە،پێشووتر چەندێكمان لێ باس كرد، بەنمونەو بۆ بەراورد هەندێكیان لەبارەی ئافرەت وا تومارەدەكەین:

| | |
|---|---|
| +ئافرەت شەیتانی دڵە | رۆمانی |
| +سوپاسی خوا كە یۆنانیم بەربەر نیم،ئازادم بەندەنیم،پیاوم ئافرەت نیم | یۆنانی |
| +مار چاترە لە ئافرەت | هند |
| +لەودنیایە لە ئافرەت كەم تر نیە . | سرودێكی چینی |
| +ژنان فێری گریان دەبن بۆ ئەوەی درۆ بكەن | رۆمانی . |
| + ئاگرودەردو بەڵاومارو دوپشك لە ئافرەت باشترە | هندی |
| +مادام ئافرەت هاتە ناومان شەیتانیش هات | بوزی |
| + باوەر بەسەگی نووستوو، بەجولەكەی سوێند خۆر، بەژنی گریاو مەكە | پۆلەندی |
| + ژن ... شەیتانی پیاوە | ئەلمانی . |
| +ژن لەیەك كاتدا ١٠٠ رای هەیە | روسی |
| +ژن و پارە پیاو ون دەكەن | فرنسی . |
| +لەمالی دەولەمەند ئەسپ بكرە لەمالی هەژار ژن | ئیتالی . |
| +شەیتان نازانی ژنان لەكوی چەقۆ تیژ دەكەن | لاتینی . |
| +چارەی سوتاو مارو دوپشك دەكرێ بەڵام چارەی ئافرەتی بەد ڕەوشت ناكرێ | ئەدەبیاتی مسیحی |
| +ئەگەر شەیتان نەیتوانی بڕواتە جیگایەك ژن دەنێری | چینی . |
| +ئافرەت فریشتەشیان هەلخەلەتاند . | ولیام باركلی |

هەندێكی تر وەك عربیەكەی خۆی بلاو دەكەینەوە بە چاك وبەخراپ باسی ئافرەتیان كردوە :

| | |
|---|---|
| + الدنيا متاع , وخير متاعها المرأة الصالحة | رَسُولُ اللَّهِ (صَ) |
| + النساء حبائل الشيطان | مثل عربي |
| +الصدق في نظر المرأة كالكذب والكذب كالصدق | البوذية |
| +المرأة نحلة رائعة , تعشق الزهور , وتعطيك العسل , ولكنها قد تلسعك! | دنماركي |
| +المرأة كائن طويل الشعر قصير التفكير | جان جاك روسو |
| +أكثر النساء زينة , أكثرهن نزقاً وخفة عقل | شكسبير |

أعظم امرأة هي التي تعلمنا كيف نحب ونحن نكره
+وكيف نضحك ونحن نبكي , وكيف نصبر ونحن نتعذب سقراط
+ مجد المرأة جمالها , ومجد الرجل قوته نمساوي

+النساء كالمصيدة جعلن لإغواء وفتنة الرجال وهذا الإغواء هو الذي يعمي أفكار العالم -البوذية
+تزوج المرأة لا وجهها! مثل ألماني
+خير مايقتني الرجل زوجة وفية مثل أسباني
+غيرة المرأة مفتاح طلاقها جرير
+متى ابتعدت الدجاجة والمرأة عن البيت ضاعتا مثل أسباني
+المرأة تشبه السيف الحاد أنديرا غاندي
+المرأة والبغل يطيعان بعد المداعبة مثل أسباني
+المال والنساء يفضلن الأغبياء مثل ألماني
+دموع المرأة تساوي كثيراً وتكلفها قليلاً مثل أسباني
+ إن الوباء والموت والجحيم والسم والأفاعي والنار خير من المرأة شرائع الهند القديمة
+من كانت له امرأة كان له عدو مثل أسباني
+ذل قوم أسندوا أمرهم إلى امرأة مثل عربي
+ينسى الحسون التغريد ولاتنسى المرأة الكلام مثل أسباني
+حيث تلمك المرأة يكون الشرير رئيس الوزراء مثل ألماني
+من يملك امرأة يملك جميع النساء , ومن يملك جميع النساء لايملك امرأة مثل أسباني
+اختر زوجتك بعين شيخ , واختر حصانك بعين شاب مثل أرمني
+من يثق بالنساء يكتب على الثلج مثل ألماني

فەیلەسوفەکان:

- المرأة في نظري، خليط من الأشكال والألوان . . "بيكاسو"
- المرأة كالإعلان يحقق غايته بالتكرار . "دورانت"
- المرأة كالعقرب تشُق طريقها في الحياة . . بأن تلدغ من يقف في طريقها . "أناتول فرانس"

- المرأة . . زهرة الربيع . . فتنة الدنيا . . روح الحياة . . "أنينا أوين"
- المرأة أبهج شيء في الحياة . . "كونفوشيوس"
- المرأة . . تاج الخليقة . . "هردر"
- المرأة . . مثل الرقة والكمال . . "فولتير"
- المرأة شعر الخالق . . والرجل نثره . . "نابليون"
- المرأة . . هي المرض . . "أبقراط"
- المرأة كتاب مفكك الأوراق، غلافه خير منه . . فلا عجب إذا فضّل الرجل قراءته ليلاً "ماريشال"
- المرأة . . مخلوقة ساعة . . "دانتي"
- المرأة . . مصدر كل شر . . "سقراط"
- المرأة تبقى كطفل كل حياتها . . "شوبنهاور"
- المرأة كوكب يستنير به الرجل، ومن غيرها يبيت الرجل في الظلام . . "شكسبير"
- المرأة كالوردة . . تستدرج الرجل بأريجها لتلسعه بأشواكها . . "أرسطو"
- المرأة مثل القطة . . تحيا بتسعة أرواح . . "جون هيود"
- المرأة الصالحة لا يعدلها شيء . . لأنها عون على أمر الدنيا والآخرة . . "عبدالله بن المقفع"
- المرأة تترقب الرجل . . ولكن كما تترقب العنكبوت الذبابة . . "برناردشو"
- المرأة . . آخر شيء تصل إليه الحضارة . . "جورج مريديث"
- المرأة هي الجزء العصبي من المجموع الانساني .. والرجل هو الجزء العضلي منه "هالي"
- المرأة كالغصن الرطب . . تميل الى كل جانب مع الرياح، ولكنها لا تنكسر في العاصفة "زواتلي"

ئەگەر بەنموونە و ئامار بە ماهیە و واقعی سەرمایەداری دا بچین تەواو نابیت ،لە توێژینەوەیەکی (ئەنجلس) لە کتێبیکی (بە ئینکلیزیە تەرجەمەی عربیش نەکراوە )ئاماری زۆر خەمباری دۆخی ئافرەت باس دەکاو دەڵێ : بەزۆری ڕۆژانە ١٦سەعات ئیشیان بە کچی گەنج دەکرد جاریش وابوە ٢٠ سەعاتیش ئیشیان پێکردوون ،ئەو ڕادە لە بریتانیا ٢٢ سەعات ئیشیان بە تۆبزی پێکردوون تەنها دووسەعاتیان مەولەتی حەسانەوەونوستن بوە[٨١]. لەرووی پایەو نرخی ئافرەتەوە زیاتر وەك کاڵا بەکاردەهێنرێت ، پەرلەمانی ئینگلیزی بڕیارێکی دەرکرد تیایدا لە ئافرەت قەدەغە کرا ئینجیل بخوێنی لەبەر (بێ نرخی ئافرەت) ، تا سالی ١٨٠٥ز بۆ هەر کەسێك لە بریتانیا هەبوو کڕین وفرۆشتن بە ئافرەت بکاو ،هەرچەندە لە سیستەمی سەرمایەداری بازاری ئازادە بەڵام بۆ ئافرەت نرخ دیاری کرابوو، نابوایە بە (٦بنسە)ی زیاتربفرۆشرێت،تا سالی ١٨٥٠ ئینجا ئافرەت بە هاووڵاتی هەژمارکرا[٨٢] ، ،ئەوەش ڕەگی قووڵە لە سەردەمی یۆنانی کۆن کۆمەلگە دابەش کرابوو بۆ سەروو وخواروو ،بۆ غەوارەو ئەسلی ،ئەرستوکراس ودیمۆکراس،ئەسنی ومەسیحی ،بەربەر ورۆم ،ئافرەت وپیاو..،دەیان ووت هەموو مرۆڤ لە قوڕە بەڵام چینی ئۆرستوکرات ودەسەڵات قوڕەکەیان زیوی بوە ،هەرچی جوتیارو چینەکانی تری خواروو قوڕەکەیان بە مس وئاسن تێکەڵاوکرابوو[٨٣]،ئافرەت لەچینەکانی خوارووبوو،لەگەل غەوارەو هێتیم[٨٤]وهەژاروبەندە حیساب کراوە.

هەرچی ئەو سەربەستی جنسیەشە کەلەسیستەمی سەرمایەداری باو دەگرێ پەیوەستی خیزان و بەزەیی وعاتیفەو مرۆڤایەتی زۆر لاواز کردووە ،بە هەزاران گیرو گرفتی سەرسورهێنەری لی پەیدا دەبیت ، لە ئامارێکی رەسمی تازە دا لەسالی ١٩٩٤ بلاو کرایەو دەرکەوت سالانە تەنها لەبریتانیا ٩٨ هەزار مندال لەمالەوە یاخی دەبن ،بێ خاوەن بەرەو چارەنوسێکی بەد خوویی دەرۆن ، لە ئامارەکانی ٢٠٠٥ و٢٠٠٦ دەرکەوت مندالی بیژی ئەوەندە زیادی کردوە خەریکە نیوەی کۆمەلگەی فرنسی پێك دەهێنن ،هەندێ ئاماری تری جۆر بە جۆر هەلدەبژێرین کە لە یەك سال ڕوویداوە:

[81] Fredreck Engls - the condition of working class in England P235-236

[٨٢] لە مێژووی ئەوروپا لە سەردەمی یۆنانیەکان ورۆمانی و تا ئەو بەرواره ئافرەت بە هاووڵاتی هەژمار نەدەکرا .

[٨٣] بڕوانە :جمهورية افلاتون ص٧٦

[٨٤] لە مەزموری داود ژ:٩٤ ئاوا باسی هێتیم وبێگانەو ئافرەت بەیەك پۆل دەکا .

لە بریتانیا: ٥٠٪ی ئافرەتانی کوژراو بەدەست هاوسەرانیان بوە ،٢٥٪ئافرەتانیان دووچاری لێدان دەبنەوە ،سێ یەکی پرۆسەی هاوسەریەتیان دەبتەتەلاق .

لە ئیسپانیا : ٩٣٪کچانیان حەبی (منع الحمل)بەکار دەهێنن ،لە یەك سالدا ٥٠٠٠٠٠لێدان ڕوویداوە ،لەو فەترە ٥٤ ئافرەت کوژراون لەلایەن هاوسەرانیان یان لەلایەن ئەوانەی پەیوەندی جنسی ناشەرعیان هەیە .

ئەمریکا :ڕۆژانە ١٩٠٠کچ بە جۆراودەست درێژیان دەکرێتە سەر ،٦٠٪ی هاوسەری دەبێتە تەلاق ،زیاتر لە نیو ملیۆن لە باربردنی کۆرپەلە ڕوودەدا ،٣٠٪یان لەوانە لەلایەن کچانی تەمەن کەمتر لە ٢٠ سالی بوە ،٨ملیۆن بیوەژن هەیە ،سالآنە ٥٢٠٠٠دەست درێژی جنسی (تەواو) دەکریتە سەریان ،یەك ملیۆن لەشفرۆش هەیە . هەروەها CNNی ئەمریکی چەند ئامارێکی جیا جیای لە بارەی لەشفرۆشی بلاوکردەوە ،دەرکەوت سالآنە ٢ ملیۆن ئافرەت و مندال وەك بەندەی پێشوو دەفرۆشرێن بۆ کاری لەشفرۆشی ،نرخی ئافرەتە رۆژهەلاتی و مەکسیکی و ئەوروپای ڕۆژهەلاتی بە نرخی ١٦٠٠٠$ دەکرێ ودەفرۆشرێ ،سالآنە ٢٠٠٠کچی نیپالی لە هند دەفرۆشرێن،لە چینیش بە هۆی سیاسەتی ڕادە دانان بۆ زاوزێ دیاردەیەکی سەیر سەری هەلداوە ،هەر ئافرەتێك دەبێ یەك مندالی ببێت ،بە هۆی (نازور) وادەکەن کچەکان لە بار بچن وکوڕەکان دەهێلنەوە بەو هۆیەوە لە مانگی ٣/٢٠٠٤ ئامارێك بلاو کرایەوە دەرکەوت ٤٠ ملیۆن کوڕ زیادی کردوە ئەوەش پێچەوانەی هەمو جیهانە کە بەسروشتی خۆی ڕێژەی ئافرەت زیاترە ،ئەوەش هەر جۆرێکی مۆدێرنی (وأد البنات)ە ،هەر بەو بۆنەیەوە یەکێ لەو(١١) پێشنیارە زانستیانەی مەدرەسەی سەرمایەداری بۆ کەم کردنەوەی دانیشتوان بریتیە لە (وأد الأطفال)[٨٥]، ئەو جۆرە ئامارانە لە جیهانی موسولمانشینیش زۆر ترسناکترە بەلآم نەکراوە ...هتد .

تێکرایی ڕەوتەکە بەرەو هەلدێرانە ،لەجیاتی پەیوەندی مرۆڤانە وەك (فرۆید) گوتەنی پەیوەندی جنسی و (راسل) گوتەنی پەیوەندی (بەرژەوەندی) جێی گرتەوە... ئەو دوو فاکتەرەش هەربە قسەی خۆیان هەمان ئەو دووغەریزەیە کە کۆمەلگای نەفامی وعەوامی سەرەتایی پی دەناسرێتەوە ، سەرەرای ئەوەی کۆمەلگاو سیستەمی رۆژئاوا لەو سەردەمە پێش ڕەون و لە ئێمەمانان پێشکەوتوترن ،کەچی بە پێی ستاندەر پێشکەوتن ناشێت بلیت کۆمەلگای سەرمایەداری پیش کەوتووە، وەك

---

[٨٥] بڕوانە: د یونس حمادی علی- مبادیء علم الدیمغرافیا ص١٣٦ ئەو کتێبە پرۆگرامی زانکۆی عیراقیش بووە تیایدا (وأدالأطفال)وەك چارەسەر خوێندراوە .

زۆربەی نووسەران و ڕەوشەنبیرانی لای خۆمان پیٚ ی هەلخەلەتاون، دەیان کەن بەسەر مەشق و مرجعی گفت و ڕەفتاریان ،بەلکو تەنها لەڕووی تەکنیك وشارستانی پێش کەوتوون ،جاری وەك (د.سولیڤان) گوتەنی لایەنی مرۆڤایەتی و ئەخلاقی فکری و کومەلایەتیان زۆر بەجێماوە ، کەئەوانە بنچینەی ژیانن نەك تەلارو ڕابواردن ... ،ئنجا ئەوسەربەستی جنسیە هەر موزاعەفاتی مرۆڤایەتی و ئەخلاقی بە تەنهایی نیە ئەوەتا شۆرشی ئایدز وەك نەخۆشیەکی کوشندە لێیان هەلساوە ،تا نەیانخاتە سەرسکەی عەدالەتی جنسی ناوەستیٚ ، هەڕەشە لەتێکرای شارستانی سەرمایەداری دەکات ، لەفاکتەری دووەمیشدا ئافرەت لەو سەربەستیەدا بەنج کراوە و بوویتە دیلی پەیوەندیەکان مادی (هەروەك کۆمەلی نەفامی سەرەتایی و سەردەمی هوزایەتیە تاریکستانیەکان )بەو رووکارە پەروەدە دەبن کە ئافرەت موعجیب بێت بە پیاوانی برجوازی دەولەمەند و لی پرسراوانی حکومی و عسکری و هونەرمەندان و پیاو ناودارەکانی،ڕووداوەکەی مۆنیکا وکلینتۆن لەو سۆنگەیە بوو ئەگینا مۆنیکای تەمەن ٢٣سال چیدابوو لە پیاوێکی ٥٢ سالە ...، ئەوەش هەرهەمان سیفەتی کۆمەلی نەفامی بوو کەماهیەتەکەی ئەوە بوو ئافرەت موعجیب ببوو بە ئازایەتی و بەتێنی و هەبوونی و کورە سەرەك هوزەکان و ناو دارەکان ...، کە لەهەردوو قوناغدا سیمای چەوسانەوەی کۆمەل (بەئافرەت و پیاوە) بریتیە لەئیستغلال و خۆسەپاندن ،بەتایبەت ئافرەت چارەنووسی لیٚ ی هەرگیز شومە .

## ئایا ئافرەت و پیاو یەکسان دەکرین ؟ یان بووینە ؟

داوای یەکسانی کردنی کۆمەلگە بەگشتی کۆنە ،بەلاّم یەکەم بەلگەنامە بەردەست بێت داوای یەکسانی ژن وپیاوی کردبیٚ ،لە جاڕنامەکەی(مافی ئافرەتان لە ١٧٩١)ی (ئۆلیمپ دی جۆجیە) کە پێك هاتبوو لە ١٧ مادە ،لە مادەی یەکەمدا داوای یەکسانی دەکرد[٨٦]، لەدوایدا بەرە بەرە ئەو یەکسانیە داوا کرا وڕاپەڕینی لە پێناو کراوە ،یادی ٨ی ئاداری ١٩٠٩ یەکێکە لەو تەقەلایانە

[٨٦] دەقی مادەکە بە عربی ئەوەیە : المادة (١) ((أن المرأة ولدت حرة, وتحيا حياة مساوية لرجل في الحقوق, ويجب أن يقوم التميز الاجتماعي فقط على المنفعة العامة)).

لەدوای شۆرشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧سەرکردەی سۆڤیەتی لینین جاڕی یەکسانی ژن وپیاوی دا،،لە هەموی گرنگ تر لە لقی (ب) مادەی (١٣)ی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان داکۆکیەکی بەڕاشکاوانە لە یەکسانی ژن وپیاو دەکا ،دەقی مادەکە:(إنماء التعاون الدولی فی المیادین الإقتصادیة والإجتماعیة والثقافیة والتعلیمیة والصحیة والإعانة علی تحقیق حقوق الإنسان والحریات الأساسیة للناس کافة بلا تمیز بینهم فی الجنس او اللغة اوالدین ولا تفریق بین الرجال والنساء )[٨٧] ،دوای به پێی بڕیاڕی (ژ:١٥١٤ –خولی ١٥ ی سالی ١٩٦١) گرێدرا بە مافی چارەنوسی گەلان ، لە مادەی (٢) و(١٦)ی جارنامەی مافی مرۆڤیش داکۆکی لەو یەکسانیە کراوە ، لە ڕێکەوتنامە نێو دەولەتیەکانیش داکۆکی لە یەکسانی کرایەوە ڕێکەوتنی (قەلاچۆی جیاوازی دژی ئافرەت –سیداو) لە ١٩٧٩ ،دوای ڕێکەوتنی (دەرکێشانی توندو تیژی دژ بە ئافرەت )لە١٩٨٣ .. تا دەگاتەکۆنگرەکانی مکسیکۆ لە ١٩٧٥ وە کۆبنهاگن لە١٩٨٠ و وپکین لە ١٩٩٥.. لە هەموان توند تد تر ڕێکەوتنامەی سیداوە[٨٨] کە داکۆکیەکی زۆر بەتوندی لەیەکسانی ودابەشی دەسەلات لەنێوان ئافرەت وپیاو دەکا لەنێو یەك خێزانیش، ،دوای لە زۆربەی دەستورەکانی وولاتانی جیهان تۆمار کرا ، دوای هاتە نێو دەستوری وولاتانی ئیسلام نشین ،لەوانە دەستوری میسر (مادەی ١٦)،دەستوری بەحرەین –مادەی(٥)و زۆر وولاتی تریش .

لە مادەی(١)ی ڕێکەوتنی سیداو باس لە هاوتایی تەواوی پیاو ژن دەکا[٨٩] ،ئەوەش ڕێ خۆش کەر بوو بۆ سەر هەلدانی زاراوەی جەندر،دوای لە سالانی ١٩٨٠ بەفەرمی زاراوەی جندر[٩٠] لە جیاتی جیایی نەژادی(نێر ومێ) هاتە کایەوە کە گوزارشی لە یەکسانی دەکرد،نەك هەر لە ڕووی مرۆیی بەلکو لە ڕوەکانی سیاسی وفکری وکۆمەلایەتی ویاسایی وفەرهەنگی ،یەکەم جار زاراوەی (جندەر)

---

[٨٧] بڕوانە :دەقی (میثاق امم المتحدة ) لە ١٩ بەندو ١١١ مادە پێك هاتوە .

[٨٨] ڕێکەوتنامەی سیداو کورت کراوەی(ڕزگاربوون لە هەموو جۆرە جیاوازیەك لە دژی ئافرەت) لەسالی ١٩٧٩گرێدرا دوای لە٢٨/کانونی یەکەم/١٩٧٩لەلایەن نەتەوە یەکگرتوەکان بە کۆی دەنگی ١٣٠ وولات لایەنگیری و١٠ش دژ پەیرەو کرا،پێك هاتوە لە ٣٠ مادە ،ئەوەی لێی دەخوێندرێتەوە بریتیەلە:١-داکۆکیەکی پەرەگر لە یەکسانی ٢-گوێ بەسەرەنجام وڕێکخستنی خێزان نادات ٣- دان بەوە نانێ کە سەرەك خێزان وبەرپرسی یەکەم هەبێت ..لەگەل هەندێ خالی تریش

[٨٩] بڕوانە: اتفاقیة القضاء علی جمیع اشکال التمیز ضد المرأة- سیداو لە ص٣ باس لەو (هاوتایە-تماثل)دەکا هەرچەندە خودی مادەی یەك بەڕوونی باس لەو (تماثل)ناکا ،چونکە (هاوتا-تماثل)بناغەی جندرە .

[٩٠] جەندر وشەیەکی ئینگلیزی ڕەچەلەك لاتینیە ،یەکەم جار(ئان ئۆکلی) لە هەشتاکانی سەدەی ٢٠ بەکاری هێنا بە مانای ڕۆلی نێر ومێ لە کۆمەلگە بێ گوێ دانە جیاوازیە بایۆلۆجیەکان .

لەکۆنگرەی (دانیشتوانی -١٩٩٤)ی قاهیرە هاتە نێو جیهانی ئیسلامی لە بڕگەی ١٩ی مادەی ٤ی بەلگەنامەکە دەڵێ تێکشکاندنی هەمو جۆرە جیاوازیەکی جندری نێوان نێر ومێ ، هەروەها لەمادەی (٢)ی جارنامەی مافی مرۆڤ وپێك هێنانی لیژنەیەك لە نەتەوەیەکگرتوەکان لە ٧/٧ ١٩٥٤ بۆ بەرجەستەی یەکسانی ،لە بەرامبەریشدا تەقەلای زۆر دراوە بۆ سەلماندنی بوونی جیاوازی تا ئەو ڕادەیە (جۆن گرای)کتێبێکی نوسی بە ئەدرێسی (پیاو لە مریخ وئافرەتیش لە زوهرە )[91]... ،بابزانین ئەو یەکسانیانەی بەو توندیەی داواکراوە چەندە لۆژیکیە ؟

هەروەك چۆن لە پەیوەندی بیرکاری نێوان هەردووبڕی دیاری نەکراوی (أ )و (ب) دا ولە نێوان هەموو دووتەنێك سێ دۆخی لەپێشە : یان أ <ب یان أ> ب یان أ یەکسانە بە ب ، بە هەمان شێوە لە چوارچێوەی خێزانیشدا سێ دۆخ لەپێش پەیوەندی ژن ومێردە سەبارەت بە بەڕێوەبردن ١-یان دەبێ ئافرەتەکە سەرۆك خێزان بێت (کە بە نیمچە دایك سالاری ناو دەبرێت) ٢- یان پیاوەکە (بەباوك سالاری) ٣-یان بە پەنجا بە پەنجا و یەکسانی..بەکورتی لەگەل ئەو بابەتەی خوارەوە شێیان دەکەینەوە :

ئێمە لەشێ کردنەوەی هێلە گشتیەکانی سەرمایەداری بۆمان دەرکەوت ئەویەکسانیە نایەتەدی ، بەلام ئەگەر بەگریمان (فەرەزیە) هاتەدی ،بزانین چارەنووسی خێزان وباقی بناغە کۆمەلایەتیە کانی تر چی بەسەر دیت ؟ چونکە مدرسەکان (فرۆیدی و سۆشیالیزمەکان و لیبرالیەکان و مدرسەکانی تریش) و بەرنامەی سەرجەم حیزبە عەلمانیە کوردستانیەکان و زۆربەی نووسەرانیش بێ لێك دانەوە یەکسەر داوای یەکسانی دەکات لەماف وئەرك ودەسەلات و بەرهەم و ... هتد، جاری بابزانین لە سروشتدا هیچ سیستەمێك هەیە دووناوەندی هەبیت ؟بابزانین هیچ یەکسانیەك لەو گەردوونە بەئاسۆیی وبە ستونی ،بە پانیی وبە دریژی دەدۆزیەوە ؟ ئایا دەشێت ئەو گەردوونە بەدوو تەوجیهو دووجۆرە یاسای(مەرکەزیەت) بەڕێوەبچێت ؟،بیری لێ بکەوە چی بەسەر دیت؟ وەك قورئانی پیرۆز وەلامی وەها پرسیارێکی دەداتەوە: (لوكان فيها الة إلا الله لفسدتا ــ الأنبياء -٢٢)، ئایا هەر لەکۆمەلەی خۆری خۆمان ئەگەر دوو خۆر بەهەموو سیفەتەکانیانەوە (جەندرانە)هەبوایە چیمان بەسەر دەهات؟ بە پێچەوانەی هەموو ئەو بۆ چوونانە سونەتی ئەو گەردوونە بەسروشت و ژیان و کۆمەل و فکریشەوە بەهەرەمی دروست بووە، واتە مەرکەزیەتی تیایە نەك یەکسانی ...، سەرکردەی(خۆر= رۆژ) بۆ

[91] ئەو کتێبە لە سالی ١٩٩٢ دەرچوو ،پێك هاتبوو لە ١٣ بەش ،تەرجەمەی دەیان زمان کراوە .

کۆمەڵەی خۆر ،عەقل بۆلەش، ناوك بۆ شانە ،سەرۆك بۆ دەولەت ،.. لەکۆمەڵیشدا بەرێکەوت نیە کە (امم المتحدە un) دروست بووە ،، لەگەل ئەو هەموو سەلبیانەشی بەلکو بەرهەمی ئەو یاسا گەردوونیەیە ، بەلام گەشەسەندنی وتێك چرژانی پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکان بە پێویستیەوە هینایانە بەرهەم . جائیستا ئەگەر چاومان لەو جیاوازیە قولانەی ئافرەت و پیاو پۆشی و دامانننا بەیەکسانی خیزان بەریوەدەبەن ...سەرنج بدە... ئایا هەر هەموو یەکتر تەلاق نادەن و بنەماکانی کۆمەل تێك و پێك ناچێت ؟... خۆ ئێمە ئەزموونێکی ناسکی پەنجا — بە — پەنجامان لە حکومەتی کوردستان بینی، کە تەمەنی تەنیا چەند رۆژێك بوو بوە شەڕی برا کوژی وتا ئیستا دەردەکانی دەچێژین ،واتە مەحال دەرچوو ئەو جۆرە گەلاٌلەیە ، باهەر چەند زەرووریش بیت ، خۆ هەندە زەحمەت نیە با نووسەرێك مونەزیری حزبێك ئەو فەرەزیە بەکردەوە بسەلمێنی، خۆ ئەگەر راستی و داد گەری تیایە بۆشەرم لەم ئەزموونە دەکەن باپیشانمان دەن ،ئیمە هەندی نمونەی واقیعمان لەبەر دەستدایە کە ئافرەت و پیاو لەیەك لەرووەکانی (لەرووی کار) جێیان گۆریوەتەوە لەو جیهانەدا وەك هەندی تیرەی نامۆ لە شارستانی سەردەم  لەرۆژ ئاوای ئەفریقاو لەهەندی شوینی ئاسیاو لای خۆشمان کە پی یان دەلێن (هۆزی قەرج) کە ئەوانە ژنەکانیان مالداری دەکەن، بەلام ئەو سیستمە وای لی کردوون پاش بکەون و دابڕێن و گەرۆك بن و شەخسیەتێکی کۆمەلایەتی بەهیزیان نەبێت. ئینجا ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە ئەو یەکسانیە دووبارە چەوسانەوەیەکی تری سەربارە بۆ ئافرەت ،بە حوکمی جیایی توانای سروشتی ئافرەت وپیاو بێجگە لە هێزی عەقلی هەموو هێزەکانی تری ئافرەت وپیاو لێك جیایە ،ئەوەش ئەرك پسپۆریو ماف وبەرهەمی جیا جیا دروست دەکا ،  لەباری وادا ئەرکی یەکسانیان پی بسپێری ئەوا ئافرەتەکە بار قورس تر دەبیت ،هەرپیّ ی ناکریت چونکە سالانە بگرە مانگانە دۆخی تایبەتی روو بەرووی دەبیت کەپەکی لە کاردەکەویت، لەسروشتدا لەنیو خیزانی خۆردا ئایا مانگ کاری رۆژی پی هەلدەسوری ؟ لەنیو خیزانی گەردیلە ئایا پرۆتۆنی پالکەوتوو لەناو ناووك فەرمانی ئەلەکترونی زیرەکی پیّ بەرێوە دەچێت؟ ئایا مێشك ئیشی قاچی پی دەکرێت ؟ ئایا دەستی چەپە ئەرکی دەستی ڕاستی پی دەکرێت ...نەخیر، لەو یەکسانی کردنا — ئەوا هەریەکە لەمانگ — پرۆتۆن - مێشك - دەستی چەپەی- ئافرەت مەغدور دەبن . کەواتە تەقەلای بەیەکسانی کردنی پیاو و ئافرەت پیویستە وەك مەحالەکەی (اللادقە) لەفیزیا کە لە سەردەستی (هایزنبرك) هاتە دی ،یان وەك مەحالەکەی (توالد الذاتی) کەلەسەر دەستی (باستۆر) چەسپا، هاوتای ئەومەحالانەش لە

یەکسانی پیاو ئافرەت بێتەدی و کۆتایی پی بێت کە زیاتر لەچەندین سەدەیە باسی لێوە دەکرێت ،ڕەنگە زانایانی ئیسلامی پێش هەموان ئەو داوایەیان بەرز کردبێتەوە ، (ابن رشید ) یەکێ لەوانە داوای ئەویەکسانیەی کردووە ،ئەو داوایەی سەدەی ١٩ لە کاردانەوەی ئەدەبیاتی یۆنانی هەلس وکەوتی کنێسەو بەشێك لە فەقیهە ئیسلامیەکان بوو ، چونگە ئەرستۆ(٣٨٤-٣٢٢ پ ز)و ئەفلاتونیش(٤٢٧-٢٤٧ پ ز) دژ بە یەکسانی بوون نەك سەبارەت بە ئافرەت بەلکو دەیان ووت : هەندێ مرۆڤ بۆ بەندەوخزمەتکار وهەندێکیش بۆ خزمەتپێکراوی دروست بووینە ،بەشێك لە قوڕی زیوی وبەشێکیش لە قوڕی تەنەکەیی دروست کراون ،بۆیە مرۆڤ وەك دانەکانی شانە یەکسان نینە هەروەك لە فەرمودە وا هاتوە **(الناس سواسية كأسنان المشط)** ،ئەوەی فەرمودەو ئیبن روشدو ئەزمونەکانی سەردەمی ئیسلامی ڕاستەقینە مانای یەکسانی ئەوە نەبوە پیاو ئافرەتیش یەکسان بکا کە ناکرێ ،لەوەوە ئەوانەی گوایە داوای مافی ئافرەت دەکەن هەمویان تێکەڵ کردبوو،ئەوەی ڕەگەزپەرستی یۆنانی و یەهودی ومەسیحی وهندۆکی وئەو تێڕوانینە تایبەتیەی ئاینی ئیسلامیش کە پێی وایە مافی ئافرەت لە یەکسانی نایەتە دی .

ئەوەی داوای ئەو یەکسانیە دەکات با جارێ (مانگ و رۆژ) یەکسان بکات (پرۆتۆن و ئەلەکترۆن ) (دل و میشك ) (ناوك و سایتۆ پلازم) (سەرۆك کۆمارو وەزیریك ).. یەکسان بکات ،یان هەرە ئاسانەکەی با بۆیەکسان کردن وابکەن بەلایەن کەمەوە پیاو دووگیان بێت و زاوزی بکا ، لەجیاتی ئافرەت ئنجا دەتوانین پەیامی دایکایەتی و باوکایەتی یەکسان بکەین ،لە ڕاستیدا نەك لە نێوان ئافرەت وپیاو هەر لەو گەردوونە دووشتی جیای یەکسان نابینیەوە ،تەنانەت ئاینشتاین بەوەش نەوەستا دەلێ هەتا لە بیرکاریش (أ) و (ب) یەکسان نابن مەگەر أ هەر خودی ب بێت .

جا ئافرەتینە ئەو داواکاریانە دروشمی رازاوەی بێ مەسئوولیەتە، تێنەگەیشتنە و تەنیا هەلخەلەتاندنەو بەس: کەواتە ئەگەر چارەسەر لە یەکسانی نەبێت ئەدی لە چیە ؟ وەڵامەکەی ئامادەیە لە دادگەریە ، یەکسانی ودادگەری لێك جیان کە لەپەرەگرافی داهاتوو باسی دەکەین ،کە دەبینین خودی نایە کسانیەکە داد گەریە نەك یەکسانیەکە .

❊❊ ❊❊ ❊❊ ❊❊

**پوختەی** سەرەنجامی ئەزمونی عەلمانی(سەرمایەداری وسۆشیالیستی ) لەبارەی کێشەی ئافرەت

١-شکستی شیوعیەتو سۆشیالیستی زانستی بەگشتی بە تیڕوانینەکانیان سەبارەت بە ئافرەت وخێزانیشەوە

٢-کەم بونەوەی بانگێشەی مافەی ئافرەت لە هەردوو دنیای سەرمایەداری وسۆشیالیستی پێشووش

٣-جارێکی تریش گەڕانەوە و لە دەستورەکانیان باس لە پارێزگاری دەزگای خێزان (بەناوی اسرە — عائلە..)دەکەن وجۆرێك لە مافی سەروەری یاساییشی پێ دەدرێ

٤-ئەوەندە گرنگی بە سیستەم وئاسایشی خێزانی نادەن ،پێیان وانیە یەکێ لە ڕەگەکانی ئاسایشی نەتەوەیی ئاسایشی خێزانە .

٥-مافی ئافرەت زیاتر شێوازی ئازادی جنسی ویاخی بوون لەواقع لە شێوەی دروشمەکەی باکۆنین(تحطيم كل ما هو الواقع خير) پەیڕەو دەکەن .

٦-لەبەشێك لە وولاتانی ڕۆژهەلاتی مافی ئافرەت دەروازەیەکە بۆ ڕاکێشانیان بۆ داوی ئارەزووبازانەی پیاوی برجوازی ودەسەلاتدار.

## بەشی سێیەم

## ئافرەت لەئایندا- چارەسەری ئافرەت لەئیسلام

**چەند تێ بینیەك:** لەپێشدا دەبێ ئەوە ڕوون بکەینەوە کە ئەوانەی وا لە خوارەوە باسی دەکەین بە ڕوانگەی ئیسلامە، هەروەك لەمەدرەسەکانی تر هەریەکە وەکو خۆی بەبێ لایەنی وئەکادیمیانە دەنوسینەوە تا خوێنەر ئازاد بێت لە هەلبژاردنی ڕاستی لە کام لایە .

بەشی هەرە زۆر لەنوسین وبەرهەمەکانی زاناو تویژەوان بەتایبەتی زانایانی رۆژ ئاواو روشەنبیرە کلاسیکیەکانی لای خۆشمان لەبنەماو ئامانجەکانی ئاینی ئیسلام نەگەیشتون ،بۆیە لەئەنجامی بەراوردو شیٚ کردنەوەی هەلویٚستی ئیسلامدا توشی هەلەی چەواشە بووینە لەتەعمیم کردندا . کە بەکورتی چەند خالیٚك تایبەت بەباتەکەمان دەست نیشان دەکەین ،لەوانە:

١- ناوەرۆکی ئاینی ئیسلامیان وەك ئاینەکانی تر حیساب کردووە .

٢- ئیسلام بە تەرازووی هەلسوکەووتی موسلمانان هەلدەسەنگیٚنن ئەوەش کوشندەترین هەلەیە.

٣- چارەسەری کیٚشەی ئافرەت وەك وا باوە بەستویانەوە بەسەردەم و گۆرانکاری ،پیٚشیان وایە (دادپەروەریو ئەخلاق ویاساوراستیەکان..)نسبین ولە قۆناغیٚك بۆقۆناغیٚکی تر جیاوازی هەیە ،ئەو تیٚڕوانینەش لەگەل ئیسلام و زانستیشا ناگونجیٚ.

٤- هەرچەندەنووسەرو روشەنبیرو سیاسەتمدارانی خۆمان نزیك ترن لەسەرچاوەی ئیسلام ،کەچی بەچاوی زانایانی رۆژ ئاوا دەڕواننە ناوەرۆکەکانی ئیسلام، کە بەهەلەو چەواشە لیٚ ی تیگەیشتون .

٥- تیٚکەلیەکی کوشندە لەنیٚوان ئاین ونەریت ،هەلس وکەوتی خەلیفەکان ودەقەکان دەکریٚ، میٚژووی موسولمان وئیسلام ئاویٚتە دەکریٚ ،ئینجا ئاینە جۆربە جۆرەکانیش تیٚکەل دەکریٚن ،زۆر لەومەفهومانەی کەباون لەبارەی ئیسلام بەهەلە پیٚی وەنوسیٚنراوە ، ئیسلام رژیٚمیٚکی سەرتاپای ژیانە جیایە لەگەل ئاینەکانی تری مەسیحی و یهودی بوزی ....، هەتا سەرمایە داری و شیوعیەتیش، هەریەکە یاساو بەرنامەی خۆی لەرووی فکری و کۆمەلایەتی و ئابووری و (احوال الشخصیە)و ئەخلاق و حوکم و ... هەیە بەجیا ، هەروەها شریعەتی ئیسلام لیٚك جیا ناکریتەوە (هەندیٚکی وەرگری وهەندیٚکیشی فریٚ دەی) ، تەرهیمیش ناکریٚت لەگەل ریٚبازو دەستورەکانی تر.

## کیشەی کۆمەلایەتیەکان لەروانگەی ئیسلام

لەئیسلامدا کیٚشەکانی ئادەمیزاد تەنها کیٚشەی ئابوری یان جنسی یان نەژادی یان هەرفاکتەریٚکی تری تاقانەی دەرەکی یان ناوەکی نیە ،بەلکو تیٚکەلیٚکە لەهەموان ، سەرچاوەکەشی دەگەریٚتەوە بۆ عەقل چبە ئیجابی چ بە سەلبی ، بە هۆی پەیامەوە کاریگەری ئەوفاکتەرانە خۆبەخۆ وا رِیٚك دەخا کە مرۆڤیٚکی ئیجابی لیٚ بیٚتە دی ،ئەو دۆخە لە زاراوەی

ئاینی پێی دەوترێ (فیترە) ،یان بە مانایەکی تر ڕێکخستنی کاریگەری ئەو فاکتەرانە هەریەکە لەسنوری خۆی هیچ کامیان شابالی خۆی بەسەر فاکتەرەکانی تر دانەکێشی ،چونگە دەبتە هۆی شابال کێشان بەسەر مرۆڤەکەو لە ئەنجاما مرۆڤێکی سەلبیمان پێش کەش دەکا ،، تێکرای مرۆڤە ئیجابیەکان و یاسایەکی بە عەیار (ستاندەر) دووئامرازی هەرە بەهێزی هێنانەدی دادگەرین ، دادگەری بەمانای چۆن سنورەکانی ئەو ڤاکتەرانەی نێو زاتی مرۆڤ بە عەیار ڕێکخرا ئاواش سنورە کۆمەلایەتی وئابوری وسیاسی وفەرهەنگی بە عەیار ڕێك بجرێ ، ترازانی سنورەکان لەشوێنی خۆی ئەوا کیشەیە لەروانگەی ئیسلام ،دەقاودەق مانا سادەکەشی ئەوەیە دادگەری نیە لەو رووە،جابا هەر بارودۆخەکە ئارام بێت یان خەلکەکە رازی بن،وولاتەکە تەکنۆلۆجیدارە ... ئەوانە پیوانەنین ، بۆیە ئەو داد گەریە بەوە دێتەدی کەوا هەموو سنورو پەیوەندیەکانی – ماف و ئەرك – بێنەوە عەیار ، کۆمەلگایەکی نمونەی کەتیایدا تاکەکان نەزۆردار و نەزۆر لێکراوی لی دروست دەبیت ( لاظالم ولامظلوم) ،ئەو پرۆسە گرنگەش لەدووتەوەرەوە دیتە دی بە پیچەوانەی زۆربەی مدرسەکانی تر کەتەنها دان بە تەوەری یەکەم دەنێن، هەلبەتە بەریگەی تایبەتی خۆی تەوەرەکان بریتین لە:

١- کۆمەلە یاسایەکی رێك و پێکی بەعەیار و داد پەروەرانە کەشریعەتی ئیسلامە .

٢- بەپەروەردەی بیرو باوەر و ئەخلاقی تاکەکانی ئەو کۆمەلە ... کە لەراستیدا یاسای کۆمەلایەتی بێ نوختەی دووەم لە ویژدان دادەبڕی و بە (یاسای کوێر) ناو دەبرێت، هەرچەندە ئیستا چەپە نوێیەکانیش لەدوای شکستی شوعیەتی جیهانی هاتنەوە سەر هەمان تێراوانیی ئیسلام و نوختەی دووەم وەك ئی یەکەم بە پیویست دەزانن، هەر بەنموونە با سەرنج بدەینە ئەو رایەی (ئاپۆ):{ئیمە دروشمی (سۆشیالیزم بینا دەکەین ئینجا مرۆڤ چاك دەکەین) دەگۆڕین بەدروشمی پیچەوانە ( هەلدەستین بەبنیاتکردنی مرۆڤی کە سۆشیالیزم بنیات دەنێت پیش ئەوەی بینای سوشیالیزم بەخۆی بکەین) }([٩٢]) ،هەربۆیەش بەگشتی هەردەمێك لەناو هەر کۆمەلگایەك یەکێ لەو دوو نوختە یان هەردووکیان بزر بێت ئەوا کۆمەل دابەش دەبیت بۆ کۆمەلێك چین و توێژ و دەستەی جیا جیاو جەمسەری جیا جیا کە سەرەکیەکان : چەوسینەرو چەوساوەیە ، جا لەهەر روویەکی: کۆمەلایەتی- ئابووری – نەژادی –

[٩٢] - عبداللە ئوجەلان- هەلبژاردە ص ٣٢

نەتەوایەتی – چینیایەتی – دەرونی بێت ،دیارە لەو داترازانەی عەیاری پەیوەندیەکانیش ئافرەت یەکێکە لەو بەشە کۆمەلایەتیە کەتوشی چەوسانەوەو بارگرانی دەبیت، نەك لەبەر (حەیز)وەك (دیورایت) دەیلی یان لەبەر (بەرپرسیەتیەکەی) ئابووری ناومال وەك (ئەنجلس) دەیلیَ و نەلەبەر ئەوەشە کە بوە دەرپەڕاندنی ئادەم و نە... ، واتە مادام یاسای دادپەروەری نەبیَت ئەوا یەکسەر یاسای هیَز (کەیاسای دارستانە) جیَ ی دەگریتەوە،تیایدا : بەهیزو زۆرو گەورە بیَ هیزو کەم و بچوك قووت دەدات، دیارە ئافرەتیش لەململانیَیەك لەسەر بنچینەی هیَز زەرەریەتی، ئەو ئەنجامەی ئیستا پیَی گەیشتین ( واتە پیَکوەبەستنی کیَشەکان بەگشتی بەدادگەریەوە لیَك جیانەکردنەوەی) وای لە زۆربیریارو نوسەرو توێژەرەری بەرگریکەر لەمافی ئافرەت کردوە بیَنەوە سەر ئەو ڕاستیە، باسەرنج بدەینە ئەو رایەی (د.نوال سعداوی) بچینە ناو بابە تیَك و دەلیَت مەسەلەی رزگاری ئافرەت مەسەلەیەکی سیاسیەو بەشیَکەلە کیَشەی کۆمەل([٩٣]) .

**<u>شیَ کردنەوەی کیشەی ئافرەت</u> : (کیشەی ئافرەت بەشیَکە لەکیشەی گشتی)**

ئایاکیَشەی ئافرەت کیشەیەکی سەربەخۆیە یان بەشیَکە لەکیشەی گشتی ئادەمیزاد ؟

ئایا جار وانیە پیاویش بەدەست ئافرەت دەچەوسیَتەوە ؟ یاخود ئافرەت بەدەست دەچەوسیتەوە ؟ یاخود کۆمەلیَك یان چینیك یان نەتەوەو توێژیك بە ئافرەت و پیاوەوە بەدەست چینیَکی تر بەئافرەت و پیاوەو دەچەوسینەوە؟

لەکۆنگرەی پکینی ١٩٩٥ کۆمەلیَك لەو ڕاستیانە خرانە ڕوو، وەفدی فلستینی دکتۆرە ئیسلاح جاد بە ناونیشانی( **الحركة النسوية في فلسطين المعاصرة**) باسی لەوە کردبوو کە لەلایەك داگیرکاری چەوسانەوەی گشتیە لەلایەکیش ڕیَکخراوە جیاجیاکانی حکومی وناحکومی ئافرەتانیان پارچە پارچە کردوە ،..ئەوە دەردی ئافرەتی کوردیشە، هەرلە هەمان کۆنگرەدا سەرۆکی وەفدی ئیَرانی دکتۆرە مەعسومە و وەفدی پاکستانی (نەجات خان )مافی ئافرەتانیان بەندکردبوو بەوەی کە ئافرەتانی سەروو ورۆژئاوا ڕیَ لە وولاَتانی خۆیان بگرن جیهان بە نیَرو میَیەوە ئەوەندە نەچەوسیَننەوە .

---

[٩٣] - الأنثى هي اصل – ص١٧

یەکێ لە نوسەرەکانی ئێرەش بە واقعیانە تر بەو شیوەیە چوویتە ناو ئەو بابە تەو دەڵێ : لەکاتێکا زۆر داریە کە لە کاتی مارەکردنی ئافرەت رای لێ وەرناگیرێ ئەوا بەهەمان ئەندازە ئەو کوڕەی بە زۆر کچێکی لێ مارە دەکرێت زۆر داریە ..، زۆر راستە وزیاتریش لەوە کێ چەوسێنەرە کاتی کچێکی جوان کوڕێکی ژیرو هەژار دەداتە لاو کورێکی لاساری دەولەمەند هەلەدەبژیری ، ئێستا سەرنج بدە ئایا خیزانێکی بورژوازی چەوسێنەر لەرووی چینایەتی هەرتەنیا پیاوەکە چەوسینەرە یان خیزانەکە وتاکەکانی خیزانەکە بەئافرەتەکانیشیانەوە ، کاتی گەلێك ژێردەست دەکرێت ئایا چەوسینەران تەنیا پیاون ؟ ئایا چەوساوەکانیش ژن و پیاو نین ؟ ئایا میلەتانی کوردو فەلەستین وباسك وکشمیرو چاچانی ...لە لایەن ژن وپیاوی داگیرکەرەکانیاندا ناچەوسێتەوە ؟ئایا لەدەرەبەگیدا ئەوەندەی ئاغەژن حوکمی بەسەرئەو جووتیارانە دەدا هیچ دیکتاتۆرێکی ئەو سەردەمە کردوویەتی؟ ئەدی ئەوەش چەوساندنەوەی پیاو بەدەست ئافرەت نیە ، هەتا ئافرەتی کەوگیر بەدەست ئایاچەوسێنەرو ناداد گەر نیە کاتێ خواردنی باش بۆ کوڕان و خراپەکانیش بۆ کچان دیاری دەکا؟ ئەی سپیەکان بە ژن و پیاوە ڕەشە کانیان بەژن و پیاوە بەندە نەکردبوو؟ ناوی ئافرەتانی تاوانبارانی وەك بیلان بلاگزیچ لەتاوانەکانی سرب بەرامبەر بۆسنیەکان ناوی لە گرتوەکانی دادگای لاهای بوو ،دکتۆرە هودا سالح مهدی حماش ناوی لە ٥٥ تاوانبارەکەی عیراق بوو ،رێکخراوەئافرەتیەکانی ئەو سەردەمەش بەشداری دەکا لە تاوان ،(اتحاد النساء)ی عیراقی بەعس و (اتحاد النساء)ی کوردستانی بەعسیش پێکەوە شان بەشانی پیاوە تاوانبارەکان لە خزمەتی ئەنفال بوون دژ بەکورد.

ئەوە لەبارەی ئەلقە کۆمەلایەتیەکان کە تیایدا ئافرەت وەك پیاو دابەش بووە بۆ چەوسینەرو چەوساوە، هەرچی لەناو چوار چێوەی یەك خیزانیشە هەر دەمێك (سنور و رێکخستن...واتە رژیم ) تێك بچێت ئەو چینەی کەم دەسەلاتن پتر لێ ی زیان بەخشن ،بۆیە لە تێکچوونی ئەوعەیارە ئافرەت بەگشتی زەرەرمەندەو مافی سروشتی خۆی لێ زەوت دەکرێت و دیکتاتۆریانە رەفتاریان لەگەل دەکرێت ، ئەرك و ماف و دەسەلات و ووزەو تواناو ئەرکیان بەنارێکی بۆ دابەش دەکرێت ، بەلام ئەوە مانای ئەوە نیە سەرتاسەری بێت ،هەرپیاو ئافرەت بچەوسێنیتەوە،بەلکو پێچەوانەش لەگینە ،فۆرمێکی فراوانتر هەیە کەتیایدا دەتوانین بلێین مادام **پیاو بچەوسێتەوە حەتمەن ئافرەتیش دەچەوسێتەوە ،مادام ئافرەتیش چەوساوە حەتمەن پیاویش دەچەوسێتەوە** ، نازانین بۆ نووسەرەکان ئەوەش ناخەنە ڕوو کە لە ناو چەندین خیزاندا هەیە پیاوەکە دیلی ئافرەتەکەیە ،ئەوەتا لە (لامارتین )

ڕەنگ دەداتەوەو دەلێت: (ئەی ئافرەت پیاو مەملەکەتتە) ، (گاڤارن)یش دەلێت :(ئەوکاتەی ژنێکت هەیە واتە تۆ هی ئەوی)، وەچەندین ناز ناوو پەندی لەسەرە ،لەکوردستان پێی دەووترێ (ئۆمەر)، ئینجا ئەو فەیلەسوفو نووسەرانە بۆ کێشەکە و ئەسلەکەی نادۆزنەوە ئایا ئافرەت خۆشەویست ترە یان پیاو ... لەوەی گەرێ هۆی چیە ... بەلام لەوە بکۆلەوە کە ئەوە واقیعێکە، ئایا ئەگەر تەنگەبەریەکی گەورە یان بچوکی ڕۆژانە هاتە پێش ئافرەتەکەیارمەتی وکۆمەکی زیاتری بۆ ئامادەیە، بەلام پیاوەکە دەمری لەبرسان ، لەدائیرە — لەسەفەر — لەهەر تەنگژەیەك — لەهەر شوینێك تا ئافرەتێکی جوان هەبێت ئیش بۆ پیاو ناکریت ، ئەوە نەك هەر لەناو کۆمەلگای پاریزراو (**محافظة**) ،هەر بەنمونە سەرنج بدە وەسفی (سلامە موسی) بۆ ئافرەتانی پاریس بە (لاارادی) دەلێت: (لەهەرشوێنێك ئیشێکیان هەبیت هەموو پیاوەکان لەخزمەتینە وەك پەرستن وایە)([٩٤])، بەراستی تەواوە پیاو مەملەکەتەکەیتی ،ئایا ئەوەش جۆرە چەوسانەوەو ئەفزەلیەت نیە ؟ ئەوانەی پێیان وایە کێشەی ئافرەت لە قۆناغیکی کۆمەلایەتی درەنگ و لەدابەش کردنی کار وەك (ئەنجلس) دەلێت یان نوقستانیکی بایولوجی هەیە وەك فرۆید و جەماعەتەکەی دەیلێت ... بۆ هەموو ئەوانە زۆر لەنووسەرانی خۆشمان ئەگەر ئەوە ڕاست بوایە و ئافرەت کێشەیەکی سەربەخۆو چەوسانەوەیەکی بەتەنهایی بەدەست پیاوە هەبوایە ئەوا لەمیژوودا تاکە بزوتنەوەیەکی ئافرەتانمان دەبینی دژی پیاو،یان شۆرشێکی سپارتاکۆسیانەمان دەبینی،یان حزبێکی ئافرەتی پەتیمان دەبینی ... یان لەرووی گەشەسەندنی میژووییەوە دەبوایە ئافرەتان زمانێکی تایبەتیان هەبوایە وەك میللەتیك ... پرسیاری تر زۆرە . بەکورتی (خلاصە) کیشەی ئافرەت بەشیکە لەکێشەو گیرو گرفتەکانی کۆمەلایەتی و جیا نیە ،لەو دۆخانە پەیدا دەبیت کە داد گەری نیە،ئەو کاتیش هەموو هەموو دەچەوسێننەوەو تیایدا ئافرەت لەهەموان زیاتر دەچەوسێتەوە بەدەست: چینایەتی،نەژادی،خێلەکی،کۆمەلایەتی،بەدەست پیاو نەریتی نێرینەیی ،تەنانەت بەدەست ئافرەتیشەوە دەچەوسێتەوە ...بابزانین چارەی چیە؟

## پاساو ودادگەری لەنێو خێزان

هەموو ئەو خوو نەریتانەی کەئافرەت بەنووقستانی دادەنیت لەئەسلدا دەگەرێتەوە بۆ نەبوونی داد گەری، نەبوونی دادگەریە پلەی جیاجیا بۆ کورو زاواو کچ و بووك خەسوو و ..دروست دەبێت،

[٩٤] – بروانة: سلامة موسا –مقالات ممنوعة صَ١٣٤ .

داد گەری هەبیت شەرو شۆرو زۆرداری نابێت تا بلێ ی بریا کورم هەبیت لەجیاتی کچ ، ئەوە نامیێنێت لەگەل مژدەی کوڕبوون ڕووخۆشی ولەگەل کچ بوونیش گرژی ،ئەگەر سیستەمی خێلەکی ونەتەوەپەرستی نەبێت نالێی خزمی پشتی و خزمی زگی.. هەموو ئەوانە خوو رەوشت ونەریتی نەفامیە، رەگو ریشەی شەرمی نەفامیەکانی کۆن نوێ لەبوونی کچ لەوەیە، ئیستاش هەروا هەرِەتیەتی ،وا دەبینین کە چۆن بەمزگێنەیەوە خەبەری کوڕ بوون دەدەن و بەساردی و شەرمەوە خەبەری کچ بوون دەگەیەنن ،ئەوەنەك لەلای خەلکێکی عەوام تەنانەت خودی پزیشك مژدانەی کوڕت زیاتر لێ وەردەگرێ لە کچ،بە هەمانشێوە سزاو پاداش بۆ ئافرەت نادادگەری وپێچەوانەی ئاینە ، قورئانی پیرۆز زۆر بەتووندی بە گژ ئەو نەفامیە دا چوویتەوە، لەئیسلامدا کچ و کوڕ ئادەمیزادن،مادام بێجگە لەپەیوەستی مرۆڤایەتی هەموو پەیوەستەکانی تر سانەوین—پی ناسو هولسەنگاندنی بروارای ودادگەری تەواویش بوون لە چینی جیاو نەتەوەو عەشیرەتی جیاو ڕەش وسپی نیە بەلکو ئەوەیە (ان اکرمکم عنداللە اتقاکم) واتە ئەو کەسەی (ئافرەت یان پیاو)لەلای خوا بەرێزە کە زیاتر پابەندی دادگەریە.

کەواتە بۆ هەموو ئەو مەسەلانەو مەسەلەی ناوەوەی خیزانیش پیویستە یاسایەکی کۆمەلایەتی بەعەیار وپەروەردەو ڕەوشتیکی تەواو هەبێت، دەبیت دەولەت چاودیری بەرپرسیاری لەو یاساو پەروەدە ئەخلاقیە بکات ، ئیستا لەجاری گەردوونی مافی مرۆڤ ئەو داوایە هاتووە بۆیە خیزان نابیت بە تەنها بەناوی (هەرکەسی سەربەستە چۆن دەژی ، سەرەك خیزان چ بکات ...) نەخیر ئەوەیە تەوەریك لەزۆرداری . تەوەرەکەی تریش نەفامی بی ویژدانی بەد رووەشتی سەرەك خیزان لێ بەرپرسیارە ، ئەوکاتە داد گەری لەناو خیزان و کۆمەلیش نابیت ، بۆیە تەنیا شریعەتی ئیسلام ئەو یاساو رژیمانەی بۆ ناو خیزان داناوەو هەلسوکەوتی پی دەکریت . لەناو مدرسەکانی تر تەشریعاتێکی وا نیە جگە لەبانگەوازیەکی بی مەسئولیەت و دەلین بایەکسان بن بەلام چۆن؟ وەلامی نیە . تەتبیقی نیە ،خۆشیان نای کەن تا ئەزمونیك بێنن ،ئیستا بەرە بەرە دێینە سەر هەنگاوەکانی داد گەری لەناوخیزان .

پێش هەموشتێك چارەسەریەکانی ئیسلام بۆکێشەی ئافرەت لە چوارچێوەی پارێزگاری لە خێزانە ،لەوەوە لەگەل باقی مەدرەسەکانی عەلمانیەت بە لیبرالی وسۆشیالیستی وشیوعیەتەوە ناکۆکە ،کاتێ ئەوان لە چارەسەریەکانیان ئەوەندە ڕەچاوی بنەماکانی خێزان ناکەن یاخود بە ڕاشکاوانەوە داوای

هەلوەشانەوەی دەکەن ،بۆ هەمو ئەوانە و یەکلاکردنەوەی هەلوەستەیەکی هەمەلایەن لە سەر پاساوو بنەما مەوزوعیەکانی خێزان دەکەین .

بوونی ئافرەت لەناو (موئەسەسەی خیزان) و نەبوونی دوو دنیای زۆر لێك جیایە، لەئیسلام دا (بەپێچەوانەی زۆربەی مدرسە عەلمانیەکان) دەبیٚ خێزان بە پەرژینێکی پیرۆز بپارێزریٚ، ئیتر چارەسەر و تەشریعاتەکانی هەمووی لەسەر بنچینەی خێزانە ، جگە لەوەی کە لە خوارەوە باسی ڕەگە گەردوونیەکانی دەکەین چەندین کارو فرمانی وای هەیە چارەنوسی کۆمەلگە و شارستانی ومانای مرۆیی تەواو دەکا ، تا ژمارەی دانیشتوان وگەشەی کۆمەلیش زیاد بکا زیا تر پێویست دەبێت ،هەر بە نمونە بۆ ڕاددە دانانی دانیشتوان لە (ڕێکخستنی خێزان-Family planning) لە ڕێی بوونی موئەسەسەی خێزان دێتە دی ئەگینا کارەسات ڕوودەدا[٩٥] ، یان دەبیٚ تیۆرەکەی مالتۆس پەیڕەو بکەین و ناوە ناوە جەنگێکی جیهانی هەلگیرسێنین بۆ کەم کردنەوەی دانیشتوان،بۆ هەمو ئەوانەو زۆر لای ترخێزان پێویستیەکی هەرە سەرەکیە،لەسەر ئاین وحزب ودەستوورو دەولەت دەبتە ئەرك هەریەکە بەئاڕستەی خۆی تا کیان وئاسایشی خێزان وەك دەولەتۆکەیەکی بچوك بپارێزن،بە پێکهاتەکانی ناوەوەشی ،واتە باوك باوك ودایك دایك ومنالوکوڕوکچ وهەریەکە لە شوێنی خۆی، لێرەوە بنەماو مەبەستەکانی چەمکی(جەندر) شکست دەهێنیٚ ،چونکەخیزان هەر بەبڕیارێکی کۆمەلایەتی یان ڕێکەوتنێك یان زادەی گەشەی مێژوویی نیە، بەلکو بوونی دەگەڕێتەوە بۆ هۆکارو ڕەچەلەك و ڕەگەسروشتی و بایولوجی و فسیولوجی و کۆمەلایەتی و شارەسستانی و ئابوری سایکولوجی و ...هتد، وەك لە خوارەوە بەووردتر هەلوەستەی لەسەر دەکەین

**<u>پاساوو مقەوەماتە( ڕەگە) گەردوونیەکانی خێزان</u>**

ئیستا دێینە سەر واقیعی خیزان ،کەوەك ووتراوە شانەیەکی بنچینەیی کۆمەلە، تێك چوونی تێك چوونی کۆمەلە ،هەروەك: تەنە سروشتیەکان لەگەردیلە پیك هاتوون ، تەنە بایۆلۆجیەکان (لەشەکان) لەشانەپێك هاتون.. ئاواش کۆمەل لەگەردیلەی خیزانی پیك هاتووە ، دیارە بۆ نەشارەزایەك لە فیزیا یان لە کیمیا نازانی (گەردیلە) چ ڕۆلێکی بنچینەیی دەگێریت لەتەن و لەسروشت و لەبوونەوەر..، ڕەنگە وەك خشتیکی سادەی بینایەك بێتە پێش چاو ، بەلام فیزیازانیك ئەو گرنگیە دەزانیت کە بەئەندازەی هەموو سروشت یاساو رژیم لەنێو گەردیلە

[٩٥] بڕوانە : مبادیءعلم الدیمغرافی –جامعة بغداد ص١٣٥

کاردەکات، هەر (تیۆری کوانتەم) کەنیوەی فیزیای نوێیە بریتیە لەو زانیاریانەی نێوان خولگەو ناوکی گەردیلە کە تیرەکەی دەکاتە (٥٤. 0) ئەنگسترۆم[٩٦] ، بەهەمان شێوە مەسەلەی شانەش بۆ تەنەبایۆلۆجیەکان، ئەو نووسەرو بە ناوزاناو یاسا دارێژەرانە کە دەیانەوێ بەرنامەی کۆمەلایەتی و یەکسانی بهێنە دی بالە گەردیلە ڕا دەست پی بکەن، با یەك یاسا لەوێ بگۆرن ، بەداخەوە ئەو نووسەرانە بارودۆخی ناوخیزان نازانن بەلام زانایەکی کۆمەل ناس دەزانیت کە ڕەگ و ریشەکانی کۆمەلایەتی بەشارستانیەتی ومرۆڤایەتیەکەشیەوە لەناو کیانی خیزان سەر هەلدەدا ، بەچەندین پەیوەست بەیەك بەستراون چەندین فەرمانی دیارو نادیار گرنگ و ئالۆزی هەیە ،ئەوەیان لەلای مدرسە فکری وسیاسی و رەوشنبیرونووسەرەکانیش زۆر کەم بەلای ناوەرۆکی خیزان دا چووینە، هیچ (تەشریعاتیکیان) نیە ، بۆنمونە لەمارکسیەتدا یان لەرێبازی سەرمایەداریدا هیچ یاسایەك نیە پەیوەندی نیوان ژن و مێرد دیاری بکات . ئایا مارکسیزم یان مدرسەی فرۆید یان هەر مەدرەسەیەکی تر چ بۆچوون و بەدیلێکی تریان هەیە بۆ مەسەلەکانی: " مارەکردن " تەلاق – میرات – پەروەردە – مەرکەزیەت- بۆ مولکیەتی هەردوولا بۆ منالەکانیان بۆ دەیان مەسەلەی تر .... ،بەلکو داویانە دەست قەدەر، داویانە دەست بالا دەست لەناو خێزان یان دەستور و فەرهەنگ و نەریتی میللەتێك بەناوی سەربەستی، ئالێرەوە مافی ئافرەت بە کیانەوە نقومی زۆرداری دەبێت ،لەبەرامبەریشدا بۆچارەسەری هەستاون بە قورسترین چارە و بریاریان داوە گوایەئافرەت لە نێو دەزگای خێزان زیندانی ودیلە وتەقەلای ئەوەیان داوە ئەو بناغە گەردوونیە بڕووخێنن ،شلۆق دەبێ بەلاّم ناڕووخێ،چونکە رەگەکانی خێزان تەنها کۆمەلاّیەتی نیە بە بڕیاڕو دانیشتنی پەرلەمان و وەزارەتی ئەوقاف وکۆنگرەی نێو دەولەتی یان بە شۆرشی فەرهەنگی (وەك لە چین ڕوویدا )نایەتە دی ، بەلکو ڕەگەکانی گەردونین ،وەك لەخوارەوە بۆمان دەردەکەوێ .

**ڕەگە سروشتیەکانی خیزان:** بوونی خیزان بە بریارو ویستی ئادەمیزاد نیە . زادەی قوناغێکی گەشەسەندووی کۆمەلایەتیش نیە، بەلکو زیاتر رەگ و ریشەی خیزان قوول بوویتەوە بۆ دەرەوەی هۆیە کۆمەلایەتیەکان، جگە لەوەی (خیزانداری تایبەتی) بەختەوەری و حەسانەوەی تیایە بۆ

[٩٦] ئەوە تیرەی سادە ترین ئەتۆمە کە لە هایرۆجین دێتە دی ،جاریش وایە پێی دەووترێ تیرەی نیلزبۆر .

هەردوولای نێرو مێ ،بۆیە خیزان لەئیسلامدا هەر لەبەرپرسیاریەتی ژن و مێردەکە نیە، بەلکو عەقیدەو کۆمەل و یاساو دەولەتیش لێی بەرپرسیارە، دیارە ئیستا ئەو گرنگیە زەق تر بوویتەوە لەجاری گەردوونی جیهانی لەبەندی (١٦) ی هاتۆتە سەرهەمان راو دەلیت (خیزان یەکەیەکی سروشتی بنەرەتی کۆمەلگایە و مافی ئەوەی هەیە کە لەلایەن کۆمەلگاو دەولەتەوە بپاریزرێن ) ، بۆیە ئەو مدرسە کلاسیك و نووسەرە نوێیانەی خۆشمان واتێگەیشتون کە لەسەردەمێکی مێژوویی خیزان نەبووە و باس لەشارستانیەتی دایك (حضارة الامومة) و (دایك سالاری) دەکەن ، باس لەگەرانەوەی ئەو شارستانیەتە دەکەنەوە ،ئەوا بەهەلەدا چووینە، دیارە ئاینەکان بەگشتی وشریعەتی ئیسلامیش لەسەر بنچینەیەکی قوول بریاری پاراستن وپتەو کردنی پەیوەندییەکانی ناوخێزانی دارشتووە، وەك دیاریشمان کرد پێش ئەوەی یاسای بۆ دابرێژرێ خۆی یەکەم جار بەسروشتی هەیە ،هۆی مانەوەی هەیە، شریعەتی ئیسلامی دایناهێنێ ... جا ئیستا بەکورتی دێینە سەر ( پاساو ومقوماتی خیزان) یان رەگ و ریشەی سروشتیەکانی خیزان بابەتێکی گرنگ بۆ مێژوویی و فلسفی و زانستی و ئابووری و کۆمەلایەتی و بایولوجی ... هتد

١-**رەگە مێژوویەکەی** :هەموو دیراسەت وتوێژینەوە نوێکان دەری دەخەن کەلەگەل یەکەم کلپەی پەیدابوونی ئادەمیزاد لەسەر ئەو زەویە کۆمەل وخیزان بەجمکی پەیدابوون، لەقورئانی پیرۆز و کتابە ئاسمانیەکانی تریش هەرهەمووی باس لە یەکەم خێزانی پێك هاتوو لە (ئادەم و حەوا) دەکەن ،لە ئینجیلیش وا هاتوە : (... **ولكن من بدء الخليقة ذكرا وأنثى خلقهما الله من أجل ذلك يترك الرجل أباه وأمه ويلتصق بامرأته ويكونا الإثنان جسدا واحدا فالذي جمعه الله لا يفرّقه إنسان** )[٩٧] ، ئەو مدرسانەی باس لە (مشاعی وکۆمەلگەی سەرەتایی) و بی خێزانی و بی یاسایی و ئاژەلیەتی ئادەمیزاد دەکەن بێ ئاگان لەراستی مێژوو ،ئەگینا لە هەمو قۆناغەکانی مێژوو کیانی خێزانی هەبوە ،جگە لە شارستانیە ئاینیەکان شارستانیە عەلمنیە کۆنەکانیش هەر وابووینە،لە ئامۆژگاریەکی کۆنی میسری دا داوا دەکا خێزان بپارێزن ،باهەندێکی لێ هەلبژێرین :بەتاح حەتب لە ٢٤٠٠سال پێش زاین ژیاوە دەلێ (ئەی پیاوینە خێزان پێك بهێنن وبەختەوەرو خۆشەویستی دروست بکە ) ،فەیلەسوفێکی تر بە ناوی (ئانی)دەلێت(زۆردار مەبە لە مالەوە مادام هاوسەرەکەت ژیرە )،هەروەها داوای کردوە ڕێزی دایکیش بگیرێ ... لەگەل زۆر ڕاستی تر لەو بارەیەوە .

---

[٩٧] ئینجیل ( مرقص ١٠ — ٥ )

هەرچی مەدرەسەی مادی توندە کارتێکراوبوون بە تیۆری کلاسیکی پەرەسەندن ،ئەگەر تێبینی و سەرنجیان بدەینێ دەبینین هەرزانایەك دەچووە نێو هۆزێکی دوا کەوتوو و نەزەریەکی لەسەر ئەسلی کۆمەل تەعمیم دەکرد، بەتێکرایی وەسفی ئەو ئەلقە وەهمیەیان دەکرد کە لەئاژەلەوە بەرە وئادەمیزاد وەرچەرخاوە، ئەنجلس بەشێکی تایبەتی لەو دیراسەتە هەیە بەناوی (دور العمل فی تحول القرود الی الانسان)، جا ئێستاش تیۆری پەرەسەندن تێك وپێك رووخاوە پیویست بە لیدوانی ناکات ،بەلام ئەگەر ئەو بۆ چوونە کەمێك راست بووایە دەبوایە هەموو مەیموونەکان ببونایە ئادەمیزاد نەك دانەیەك ! ئەو بۆ چوونانە ئیستا دواتروسکایی کوژایەوە بە دۆزینەوەی (ئەندازەی جینەکان ) کەتیایدا دەرچوو " پەرەسەندن و " بازدان و ژینگە و(پیویستی — لامارکی ) و(هەلبژاردنی سروشتی داروینی) ...هیچی ئەسلی نیە ، بەلکو شوێنی جینەکان لەناو کرۆمۆسۆم لەو سیفەتانەو هەر گۆڕانێك بەرپرسیارە، دیارە ناسنامەی بایۆلۆجی هەر نەژادێکیش لەلایەنشوینی جین لەناو کرۆمۆسۆم دیاری دەکرێت ... ئەوەی ئادەمیزاد شوینێکی عەیاری هەیە ، بەهەر بارێك بجزێ ئەوا کۆرپەلەیەکی تێك شێواوی لێ دەردەچێ نەك گەشەسەندوو .

لەلایەکی تر خاوەنی ئەو تیۆرانە دەڵێن دایك یان ئافرەت خواوەند بوو دەپەرسترا ،نەخێر تەنها ئەوەیە ئەگەر پەروەردەی ئاینی زاڵ بێت بەسەر پەروەردەی نەریتی عەشایری ئەوا ڕێزی دایك وئافرەت زۆر گیراوە لە چوارچێوەی پیرۆزی کیانی خێزان ،ئەوە لەلایەك لەلایەکی تر لە کۆنەوە ئەو نەریتەی (تقدیس الماضی- ودونیە) خەست تربوە ،هەروەك لە گفت وگۆیەکەی نێوان پادشای هەرە کۆنی چینی (٤٦٠٠پ ز)لەگەل مامۆستاکەی (چی پۆ)دەڵێ بۆ پێشوو تر تەمەن درێژ و لەش ساغ بووینە ئیستا ئێمە واین [٩٨]، واتە پێشوو تری خۆی پێ باش تربوە لە سەردەمی خۆی ،ئەوە مانای ئەوەیە ئەو وەسفانەی کۆمەلگەی کۆن بە وەحشی وفرەمێردی وبێ ڕژێمی وبێ خێزانی وپەرستنی ژن ودایك سالاری ..هەڵەیە ،ئینجا لە ئاینی دا تا ئیستاش نەسەبی دایك ڕاستەقینەیە نەك باوك،واتە بەدڵنیایی ئەتۆ کوڕی دایکی خۆتی وخالەکانت ڕاستەقینەن ،بەلاّم ئەودڵنیایە ١٠٠٪بۆ باوك ومام وئامۆزا نیە،بۆیەش لە تەلقین بەناوی دایك دەخوێندرێتەوە،بەلاّم ئەوە مانای (دایك سالاری)نیە کە ڕەنگە تەنها ئەو ڤاکتەرە ئاینیە سوڕی پێ کرابێت وئەو جۆرە تیۆرانەی لێ پەیدا بووبێت .

---

[٩٨] هربرت بنسن —العقل والجسم ص١٥ .

کەواتە لەگەڵ بوونی ئادەمیزاد و کۆمەڵ خیزانیش هەر هەبووینە ،هەردەشمینێت، بەم شێوەیە ئەگەر بەبریارو رێکەوتنێکی کۆمەلایەتی سیاسیش بیانەوێ خیزان هەلوەشیننەوە مەحالە .

**٢=رەگە فلسفیەکەی** : هەرچی ناوی شتە لەبوونەوەردا دووسیفەتی گشتی هەیە، یەکەمیان هەمو شتێك پیکهاتوە لەبەشی بچوکتر لەخۆی تابچوکترین بەش ،کە پێی دەلین (یەکە unit)، سادەترین نمونە ئاوە$H_2O$ کەپیکهاتوە لەدوایەکە$H2$،$O2$[٩٩] ، کە پێی دەوترێت گەردیلە (Atom)،ئەوەش خێزانێکە و منالی هەیە لەکچ(ئەلەکترۆن) و کور(پرۆتۆن) و نیوترۆن و کوارك و.. سیفەتی دووەم هەر هەمووی پێك هاتووە لە (جووتە) (دوودژ)( [١٠٠] ) .... ،جاری گەردیلە لەبنچینەدا لەدووبارگەی پیچەوانەن ($e^+$ $p^-$) پیك هاتووە ئەو سیفەتە سەرەتاپایە ،هەموو شیتێك دەگریتەوە، دیارە هەموو خەتە فلسفیەکان رێکن لەسەر ئەو مەسەلەیە، لەکۆنەوە فلسەفەی کۆنفۆشیۆسی چینی دوو دژی بە(یان ئین) گوزارش کردوە،هەتالەمارکسیزمیش،یاسای یەکەمی دیالیکتیك بەناوی (یەکیتی دژەکان)ە، بەلام لەگەل مفهومی ئیسلام بۆ (جووتە) جیاوازن ، هەر بەنمونە لەسروشتەوە ریزیان دەکەین تاژیان و کۆمەل دەبینین هەر هەمووی یەکەی بەجووت جووتن و یەك شتیان پیك هیناوە .

١- مەکان( سەروو- خواروو) و (چەپ – راست ).
٢- زەمان (رابردوو – داهاتوو) .
٣- جولانەوە (خیرا – وەستان ).
٤- ژیان (مردن – بوون)
٥- ڕووداو (مەحال - حەتمی)
٦- گومان (مسۆگەر –هەرگیز) یان (یەقین-مەزەندە)
٧- دۆخ(گەرم – سارد) (شل – پەیت )
٨- چەندایەتی :(گەورە و بچوك ) (بێ پایان و هیچ)
٩- کۆمەل ( هەژار – دەولەمەند) ( زاناو نەزان) ( چاك – خراپ )
١٠-خیزان ( نێر – مێ) ....

[٩٩] – نەمان ووتووە بچوکترین شت ووتومانە بچوکترین یەکە .
[١٠٠] – من كل شيء خلقنا الزوجين .

جا ئێستا سیفەتی ئەو جووتەییە کە بنچینەییە و ئێمە پیویستمان پێیەتی ئەوەیە : هەریەکە لە لایەنێکی (جووتە) ئەوی تر تەواو دەکات بێ یەکتر ناتەواون ،سەرو بی خواروو نابێت، سارد بی گەرم...جیاوازیشیان هەتاهەتایە بێ ئەوەی مانای چەوسانەوەی یەکیان بەدەست ئەوی تر بدات، بەم شێوەیە ئەگەربەبیانۆی جیاوازی وبلێی مادام یەکسان نابن ئەلەکترونەکان لەپرۆتەنەکان جیاکەیتەوە ئەوا نەك هەر ئەلەکترۆن و پرۆتۆن نامینێن بەلکو گەردیلەکەو مادەکەش تێك دەچێت ، بەهەمان شیوە ئەگەر بتەوێ هەردوو جەمسەری خێزان واتە (ژن و پیاو) لەیەکتر جیاکەیتەوە ئەوا نەك هەردووك نامێنێن بەلکو خیزان و کۆمەلیش تێك دەچێت .. رەنگە بلێن وەك گیان لەبەر دەمێنێن .. بەلێ، بەلام ناوی کۆمەل و شارستانی نامێنێت هەروەك (مادەکە)ی نمونەی سەروو ، بۆیە ژن و پیاو جووتە یەکەیەکی کۆمەلن ، خیزانیش ئەو یەکەیەیە کە جووتەی نێرو مێ وەك سیستەمی ئەو بوونەوەرە پێك هاتووە، هەرسیتەمێکی تر دابڕێژی شاز دەبێت لەو بوونەوەرە ،واتە خێزان بەشێکە لە یاسای سروشتی گەردوون .

**٣- رەگە زانستیەکەی :** لەشوێنەکانی تر زۆر باسی ئەو بەشەمان کردووە ، باسی فەرمانە گرنگەکانی خێزانیشمان لەڕووەکانی کۆمەلایەتی و ئەقلی و شارستانی و داهێنانی و (نسل) و پەروەردەو رێکخستن ..کردوە ،هەروەها لەبنچینە سروشتیەکانمان کۆلیوەتەوە، ئەوەی دەمێنێ رەگی بایولوجی و تەندروستیە کە لەسەر ئەو بەشە حیسابن ،لەبەر گرنگی بەجیا باسیان دەکەین .

أ- <u>رەگە بایولوجیەکانی خێزان:</u> جێگەی سەرسورمانە .... بەلام بۆکێ؟ بۆ ئەو کەسەی نەزانی فلسفەوحکمەتی هەر شتێك لەو بوونەوەردا چیە، بۆیە نەزانێك ڕەنگە ناحەق نەبێت ئیعتراز لەئیشی ورد و (متنناهی الدقه) ی یەزدان بگرێت و بلێ ئەرێ ئەو کیسەلە بۆ دروست کراوە ؟ بەلام ئەگەر لەو ژیان و سروشتە قوول بیەوە دەبینی هەر هەمووی تەواو کەری یەکترن، بوونی هەرشتێك فەرمانی پێش چاوو شاراوەی هەیە، کەم وایە لەهەردوولای بگەین ... ئالێرە بە هەڵەدا دەچین و وادەزانین زۆر پارچە و شتوومەکی نێو ئەو بونەوەرە بێ ئامانج و عەبەسی دروست کراون ( أفحسبتم إنما خلقناكم عبثاوأنكم إلينا لاترجعون – سورة٢٣ اية١١٥) لەوەدا ئێمەی ئادەمیزادی نەزان توشی ( پەلەیی – عجل ودەمەتەقێ-جدل) دەبین ،با لێرەدا سەرنج بدەینە (پەردەی کچێتی – غشاء البكارة) ئایا دەزانین فەرمانەکانی چین ؟ ئەوەی دەیزانین ئەوەیە لایەنی بەرچاوەکەیەتی، بەلام یەکێ لەعاملە هەرە بەهێزەکانی پێك هێنانی خیزانە، ڕوون ترین ئەندامی بایولوجیە(جنسیە) کە فەرمان و ئەرکی

کۆمەلایەتیشی هەبێت، هەروەك (زمان) ئەو پارچە گۆشتە تام کەرە روون ترین ئەندامی بایولوجی (ژیانە)یشە کە فەرمانی و ئەرکی مرۆڤایەتیشی هەیە (کەقسەپیٚ کردنە)، بۆ خاوەن بۆچوونەکانی (کۆمەلی بی خیزان) سەرنج بدەن ئەو (پەردەیە) بە سە بۆ تۆماتیکیەتی خیزان ، ئەگەر هەموو لایەنە کۆمەلایەتی و ئابووری و میژووییەکانی خیزان دەستکاری بکریت ئەوا چۆن ئەو عامیلە چارەسەر دەکەن ؟ مەگەر بلین بەهۆی (ئەندازەی جینەکان) کەهەلبەتە ئەوەش ناکریت ، ئەو پەردە سادەیە کە لەبەرچاو وادیارە فەرمانیکی فسیولوجی و ئەخلاقی ساکاری هەبیت، بەلام بەشداری کەریکی بەهیزی کۆمەلایەتیە بۆمانەوەو بەردوامی خیزان ، هەموو تیۆرەکانی پەرەسەندن بە داروینی ولامارکی ومادی وجودی با تەنها بتوانن لەو پەردەیە بکۆلنەوە بۆ هەتا هەتایە ، با تیۆری (زیدە بایی )مارکسیش لەلای خۆی لەگەلیاندا ئەونوختەیە وەلام بداتەوە .ئاخۆ ژیر خانی ئەو گوڕانە گرنگەی کۆمەلایەتی کەسیك بدۆزیتەوە بەمان و نەمانی ئەو پەردەیە ؟ (قیمە)کەی لەکوییە؟ لە (عمل)ە یان ئەزەل؟ .. هەرهەمووی ئەو تیۆرانە لیرەوە لەقوڕاوی سەرسورمان و ناکۆکی نقوم دەبن. هەمووتویژینەوە زانستیەکانی نویش لە سایکۆجی و ئەنسروپولوجی زانستە مرۆییەکانی تریش ئیستا دان بەو نرخە گرنگەی ئەوپەردەیە دەهینن ،هەتا سەر بەریبازانی (فرۆید)یش ، باهەر ووتەکەی (سامی عبدالله) لەهەمان سەرچاوەی پیشوداکەدەلیت (على الاقل عدم المبالات بزهرة العفة مما هى الا شذوذ شائن لانجده الا عند بعض القبائل البدائية الهمجية..... بينما نجد عند الامم المتحضرة ان البكارة او العفة و لاسيما عندما تكون جسدية وروحية معاً تعتبر كالكنز ثمين يجب على الفتاة المحافظة علية بكل مافي وسعه) [١٠١] ،دەلیت ئەو پاریزگاریە لە سیستەمی (باوکایەتی ) هەرگیز باویەتی ! ئەوەش هەردان پیاهینانە بەلام راستیەکەی ئەوەیە هەریەك سیستەمی مرۆیی هەبووە نەك (سیستەمی باوکایەتیە) ،ئینجا بەشیکی تر پاساوی گرنگ نەبوونی ئەو پەردەیان فەرهەنگی ئەورووپیە ،بەلام ڕاستیەکەی وانیە لە ئەورووپاش ئەوانەی خاوەنی ئەو پەردەن شانازی بە خۆ دەکەن وئەلقەیەك لە دەست دەکەن بۆ جیاکردنەوە لەوانەی نەیان ماوە ، سەرەڕای ئەوەی ئەوانەی خاوەنی ئەو پەردەیەیان پیٚ نەکراوە هەردەم ترسی ئایدزیان لیٚ دەکریٚ .

ب-رەگە تەندروستیەکان بیٚ سنوری و نەبوونی سیستەمی خیزان و تیکەل بوون و ریك نەخستنی پەیوەندیە سیکسیەکان لە چوارچیوەی خیزان وگریبەست وڕەزامەندی ئارەزوومەندانە بیجگە لەوەی چەندین ئافاتی

[١٠١] – نشاطنا الجنسی ص٩٧

کۆمەلایەتی و شارستانی و ئابووری و ئەخلاقی .... هەیە، هەروەها چەندین نەخۆشیش لەئەنجامەکانی دا پەیدا دەبێت ، زوهرە و سیلان و لەهەمووشیان ترسناك ترو نوی تر نەخۆشی (ئایدز) ە ،ئەو نەخۆشیانە جیگەی سەرسورمان نیە ، بەلکو وای لە پزیشکان کردووە کۆمەلیك ئامۆژگاری خۆپارستن دەربکەن ،وەك رینمایەکانی ئاینی بەگشتی وقەدەغەکانی شریعەتی ئیسلامی بەتایبەتی بێت، لەوانە هاوسەریەتی لەکاتی خۆی ، دوورکەوتنەوە لەسەر بەستی جنسی (زینا ) و (لەشفرۆشی جنسی) .... ئینجا پەیرەوکردنی خوشوشتن لەدوای (کاری سیکسی) و پاك و خاوینی و دورکەوتنەوە لەمشروبات ومەی خانەو مەلهەکان و دۆخەکانی شازی جنسی ... هەموو ئەوانە بوون و موکومی سیستەمی خیزان دەسەلمێنی دژی هەلوەشانەوەی .

**٤-رەگە جنسیەکەی :** جنس(نێرو مێ) پێویستیەکی سەرەکی پێکهاتن وبەردەوامی خێزانە ،جا دۆخی بزێوی جنسی پیاو بەئامێرەکانیەوە ڕۆلی ئارامی ئافرەت لەهەل و مەرجی جنسی بە ئامێرەکانیشەوە دەقاو دەق یەکتر تەواو دەکەن ، زیاتریش بنچینەیەکی کۆمەلایەتی دا دەرێژی بۆ شوێن و فەرمانی پیاو لەوپرۆسە یە،هەروەهاش بۆ ئافرەت ، لە بەرەلاکردنی جنس بە دەر لە خیزان لە تاقی کردنەوەی زیندوو (کەمەلهەکان) ە کراوە، لە ئەنجاما دەرکەوتووە کە ئافرەتەکان لەو پرۆسەیەدا نەچیژی سیکسی ونەهەست بە مرۆڤلیەتی وخۆشەویستی وەرناگرن ، ئینجا لەو سەرەنجامەی فەوزای جنسی لە کۆتایدا ئافرەت زەرەر مەندی هەرە گەورە دەبێت و چارەنوسی لەڕوەکانی دابینی ژیان وخزمەت گوزاریو پارێزگاری و زۆر لای تر بەتایبەتی لەکاتە ناسکەکانی ئافرەت لە بێنوێژی لە کاتی زاوزێ لەکاتی پیر بوون ..بەو شێوەیە لەو رووانەی ژیان بێ بەش دەبن . هەروەها لەئادەمیزادە مەسەلەی جنسی هەرغەریزەیەکی پەتی نیە، بەلکو مەبەستی زاوزێشە ، ئەوەش لەمنالەکان (کە ئی هەردوو لایە) پەیوەستێکی بەهیزی خێزانی لێ پێك دیت ،کە لەهەموو پەیوەستەکانی کۆمەلایەتی بەهێزترە هەتا لەعاملی جنسی خۆشیەوە ، چونکە عاملی جنسی لەکۆتایەکانی تەمەنی ئادەمیزاد کز دەبێت ،پەیوەستی خۆشەویستی چوار چیوەی خیزان و منالەکان دەمێنێتەوە، ئالیرەیە فرۆیدو مدرسەی جنسی لێی بەهەلە دا چووە .

**٥-رەگە ئابووریەکانی خێزان :** پێشتر مارکسیەکان زۆر بە توندی نکولیان دەکرد کە مەسەلەی مولکیەتی تایبەتی بەشێك بێت لە غەریزەی ئادەمیزاد ، بەلکو تەواوی مولکیەتی تایبەتیان بەدەردو بەلا هەژمار دەکردو بزوتنەوەی شیوعەتیش لەسەر ئەو بنچینەیە دروست بوو، بەلام ئیستا دانی پیا دەهێنن وراستەوخۆش پەیوەندیدارە بە خیزانەوە ، بەو شیوە ئیستا هیچ مەدرسەیەك نەما مولکیەتی تایبەتی وەك دەرد بناسی ، راستیەکەی ئەوەیە مولکیەتی تایبەتی وەك هەموو بەرهەمەکانی تری ئادەمیزاد دوو ڕووە (ذوا الحدین)ە، لایەکی چاك و لایەکی خراپ وەك (دەولەت – یاسا – زانست – تەکنیك – راگەیاندن،.... هتد) ،بۆنمونە: لایەکی زانست تەعمیر کردنی

ئەو زەویەو خزمەتی ئادەمیزادە، کەچی ڕووەکیشی ویران و دەردەسەریە، واتە دەوەستێتە سەر ئەوەی بە کاری دەهێنێت لە سنوری خۆی، واتە زانست خۆی دەردەکە نیە بەلکو دەردەکە ئادەمیزادەکەیە چ چاکەبیت چ خراپە، مولکیەتی تایبەتیش هەروایە .... لەسەرمادیەداری دا کە لە سەر بنەمای (مولکیەتی بی سنور واتە چۆن مال پەیدا دەکەی پەیداکە) پەیرەو دەکرێت، ئەوەش دەبتە هۆی چەوساندنەوەو فێل و قوپیەو دابەش بوون بۆ چینی هەژارو دەولەمەند، بەلام ئەوە مانای ئەوەنیە مولکیەتی تایبەتی هۆیەکە بێت وەك ماركسیەكان وای لی تێگەیشتون ،بەلکو سیستەمی سەرمایەداری کەمولکیەتەکە بەکار دەهێنێت لێی بەرپرسیارە، بۆیە لەو مونتلەقەیەوە لەشیوعیەت دا بریاریان دا مولکیەت یەکجاری بن بڕ بکرێت و نەمینیت بە خیزانیشەوە، دیارە ئەو هەلوێستە هیچ جیاوازی نیە لەگەل ئەوەی بلێی زانست بۆمبی ئەتۆمی دروست کردووە بازانست لە ناو ببەین! ، بەو شێوەیە دیسان چارەسەری ئیسلامی ووردترینیانە بۆ مولکیەتی تایبەتی، کەسنوری بۆ داناوە و مقەیدی کردووە بەو پرۆسانەی کە لەشریعەتی ئیسلام هاتووە بۆ (سوو) (ئیحتکار) ،(بازاڕ) (سنورداری مولکیەت) (میرات) ،(مەرجەکانی مالداری) (زەکات و پینج یەکانەو باجەکانی تر) زامنی خواردمەنی – بیت المال – مەرجەکانی کار- پەیوەندی کار بەموولکیەت دەوری ئامیر پەیوەندی مولکیەتی تایبەتی بەمولکیەتی گشتی . . تا دەگاتە سیستەمی بانك و ئال وگۆڕی دراو وسەنەد وچەکی کاغەزی کە لە فقهی ئیسلامیدا ئال وگۆڕو کڕین وفرۆشتن بەو کاغەزانە ناکریٚ ئەگەر ئابووریەکی ڕاستەقینەی لەسەر ئەرز لەگەل نەبێت*، ئەوانە هەمووی لەچوارچێوەو بوونی خیزان دارژراوە، بەپێچەوانەی سەرمایەداری و شیوعیەتیشە کە ئەو هەماهەنگیە لە نێوان پەیدا کردنی مولکیەت وسەرخانە مرۆیەکان نیە ،بۆیە بوونی خیزان بۆ بوونی مولکیەت و بەریوەبردن و ئال و گۆڕو ...کۆمەلیك پروسیسی تر ڕۆلی هۆو ئەنجام دەبینی ،هەروەها خیزان کاری راستەوخۆشی هەیە لەسەر(زەمان – دابینی کۆمەلایەتی) و زیادی ئاستی بەرهەم لەڕووی چەندایەتی وچۆنایەتی ،ئینجا ڕۆلێکی گرنگیش هەیە لەپرۆسەی (تکامل)، واتە هەرخێزانێك جۆرە ئیش و جۆرە کالایەك بەرهەم دەهێنێت یان پەیدای دەکات، کە لەئەنجامدا پیویستی یەکانی یەکتر تەواو دەکەن بەهۆی پرۆسەی ئال و گۆری بچوك لەنیوان خیزانەکان تا بازرگانە گەورەکانی نێو دەولەتیش لەسەرهەمان بنچینە دەجولینریت، هەروەها چەندین فەرمانی ئابووری تری گرنگ هەیە زانستی داهاتوودا زیاترمان بۆ روون دەکاتەوە .

* لەسیستەمی نوێی سەرمایەداری و کاری بانکەکان کار بەکاغەز دەکرێت بیٚ ئەوەی ڕەچاوی ئەوە بکرێت ئەو کاغەزانە (پارە یان چەك یان سەنەد..) نوێنەرایەتی ئابوریەکی ڕاستەقینە بکەن ،بۆیە ئەو زاراوە ئابووریەی پێی دەلێن (هرم المقلوب) دەبتە بنچینەی ئابوری سەرمایەداری و هەمو دەم ئامادەیە بۆ زنجیرەی تێك ڕووخان وەك لە سالی ٢٠٠٨ -٢٠٠٩ ڕوویدا .

**٦-ڕەگە یاسایی و شارستانیەکان :** وەك پێشوو باسمان کرد خێزان لانەی شارستانی وگەشەی کۆمەلگەیە، زیاتر لەوەش بە پێچەوانەی ڕای سۆشیالیستی معمر قەزافی پێی وایە بۆ دامەزراندنی کۆمەلگەیەکی سۆشیالیستی پێویستە خێزان پتەو بکرێت و دەلیَ پەروەردەی تاك لەدەرەوەی خێزان ناتەواو دەردەچێت[١٠٢] ، سەرەنجامی شلۆق بوونی خێزان یەکجار زۆر مەترسیە ،بەتایبەتی بۆ میلەتێکی وەك کورد کە لە قۆناغی ڕزگاریدایە ،کاتی خۆی گولدستۆن کە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستی پێ داگیر نەکرا ختسیە ئەستۆی پتەوی خێزان وپیرۆزی قورئان ،ووتی ئەو دوو دەزگایەم بۆ شلۆق بکەن بە ئاسانی لەو بەرگریە ڕزگارمان دەبێت ،بنەماکانی (فرق تسد)یش ئاماژەی بە شلۆقی خێزان کردوە ، ئیستا دەرکەوتوە بۆ هەمو ئامانجە کۆمەلایەتی وشارستانی مرۆیی پێویست بە پتەوی خێزان دەکرێ، بۆیەلە بارەی یاسایش لە سەر هەردوو ئاستی نێو دەولّەتی ودەستوری نیشتمانی داکۆکیەکی توند لە بوون وپاراستنی خێزان دەکا ، لەدەستورە جهانی ئیسلامیەکانیش بە مادەی فەرمی داکۆکی لە پاراستنی کیانی خێزان دەکا،تەنانەت هەندێ لە دەستورەکان پەیوەندی نێوان (بوونی خێزان)و خۆشەویستی وولاّت و ئاینیان پێکوە بەستوە ،لەوانە: لە مادەی ١٥ی دەستوری ئیمارات ،مادەی ٥ی دەستوری بەحرەین ،مادەی ٩ی دەستوری سعودیە[١٠٣]، مادەی (٥٨)و مادەی (٦٣)ی دەستوری جزائیر بوونی خێزان ومانای ئازادی پێکوە دەبەستێت،مادەی (٣٣)ی دەستوری لیبیای سەردەمی مەلەکی خێزان وهاوسەری دروست پێکوە بەستوە ،لەمادەی (٩)دەستوری میسریش بە سووك تر هاتوە ، لە دەستوری عێراقی سالی ١٩٦٣ (مادەی ١٥)دوای لە مادەی (٨)ی دەستوری سالی ١٩٦٨، لەمادەی(٢٩)ی دەستوری نوێی عێراقیش داکۆکیەکی توندلە خێزان وەك ئەرکی ئاینی ونیشتمانی دەکا،هەروەها وەك دەستورێکی دەگمەنیش لە لقی(ب)ی هەمان مادە باس لە مافی ئافرەتی دایك وپیرێژن ومنالیش دەکا ، وزۆری تریش ،لە هەموان بە هێز تر دەستوری ئێرانی لە چەندین بەش و بوار وئاستەوە هاتۆتە سەر خێزان ،تا ئەو ڕادەیە قودسیەتی بۆ داناوە لە مادەی (٩) و(١٠) ،لە مادەی (٢١)جیا لە وولاّتانی تر باس لە مافی ئافرەت دەکا ،مادەی (٣١)مافی نیشتە جێبوون بۆ پتەوی خێزان دیاری کراوە ،لە پەرەگرافی(٨)ی مادەی (١٩)ی دەستوری کوردستانیش .

**٧- ڕەگە کۆمەلایەتیەکان :** بەدرێژی باسی ئەنجامە کۆمەلایەتیەکانی چارەسەری کێشەی ئافرەتمان لەهەردوومدرەسەی مارکسیزم و سەرمایەداری کرد، دەرکەوت خێزان چ دەورێکی گرنگ لەکۆمەل دەبینی ، هەر بۆ ڕەوایی مندال و پەروەردەو ڕێکخستن و پارێزگاری بینای کۆمەلایەتی و زەمانەت و ... وەك لەو خشتەیە

---

[١٠٢] معمر قذافی –کتاب الأخضر – الأسرة ص١٢٩–

[١٠٣] دەستوری سعودیە بەناوی (نظام الأساسی للحكم) ناوزەد کراوە ،پێك هاتوە لە ٨٣ مادە ،لە ١٩٩٢/١/٣ دەرچوە .

دەردەكەوێت : بوونی خێزان لە دواشیَ كردنەوەدا بونی كۆمەل رادەگری، لەوێنەكەدا دەردەكەوێت كەچ فەرمانێكی بنچینەییی هەیە ،چەندین فەرمانی تری هەیە كەجاریَ نایزانین یان كاتی كە بەتاقی كردنەوەخیزانمان هەلوەشاندەوەموزاعەفاتی بەدیار دەكەوی ،بۆ نمونە (زمان) كەكاری بایولوجی و فسیولوجی هەیە و كاری كۆمەلایەتی و فكریش هەیە ، ئەركی بنچینەی ئالو گۆر كردنی ئەفكارە لەنێوان ئادەمیزاد كە بەدەروری خۆی دەبتە هۆی پاراستن و پێش خستنی بەخیرایی (ئەفكارە) بەرەو فراوان بوون ، ئەوەش بنچینەی گەشەكردن وپارستنی كۆمەلە بە هەموو لایەنەكانی زانستی وئیداری وسیاسیەو شارستانی و فەرهەنگی ..، خیزان(وەك ژینگەی یەكەمی) ئەو زمانە دەپارێزێت ، واتە خێزان نەبێت مندال زۆر بەدرەنگ فێری قسەكردن وهەلس وكەوتی بەشەری دەبێت ،ئەوەش دەبتە هۆی دواكەوتووی ئەقلی، بەرەبەرە تا كۆمەلی ئادەمیزاد دەتاوێتەوە بەرەو ئاژەلی، ژیانی مرۆڤایەتی بیَ خێزانی هەرنیە، ئەگەر بەو پێیەی كە هەیە واش نەبێت هەردیسان دەبێتە هۆی دواكەوتن، ئەگەر تێبینی لەو هۆزانەی وەك هۆزی قەرەج یان دۆم لەلای خۆمان و هۆزی ئۆیمپیا لە ئوگەندا هەروەها لەهندو ڤیتنام و ناوچەكانی تر كە دەبینین یەكیَ لەعاملەكانی رێكخستنی كۆمەلیەتی لەو جۆرە خیزانانە نوقستانە، بوویتە هۆی دوا خستنیان لەكۆمەلگە ، بۆیە خێزان لەژێر بارودۆخی دادپەروەرانە نەك هەر پێویستیەكی كۆمەلایەتی و ئابووری بەلكو مایەی بەختیاریشە، بە پێچەوانەی ئەو ڕایانەی كە ئیستا بەشیك لە نووسەرانی كوردیش پێیان وایە هەردەم ناكۆكیە كە لە بنەچەدا لە (ئەنجلس) وەرگیراوەو كەدەلێت : (ان الرجل فى العائله هو البرجوازى والمرأه تقوم بدور بروليتاريا )[١٠٤] واتە (لەخێزان دا پیاو برجوازیە و ئافرەتیش پرۆلیتاریا)، ئەویش لەڕایەكەی ماركسی وەرگرتوە كە دەلیَ: پێك هێنانی خێزان لە برجوازیدا لە پێناو بەرهەمە،ئامرازی بەرهەم هێنەرەكەش ئافرەتەكەیە[١٠٥] ، هەروەها دەلێت (خیزان هەرگیز رێك و پێك نەبووە و نابێت بەلكو پرۆسەیەكی زال بوونە لەلایەن پیاو بەسەر ئافرەت) ، بۆیە ناكۆكی و مل ملانێیە، ماركسیش لەوبارەیەوە دەلێت: (یەكەم دابەش كردنی ئیش لەنێوان پیاو و ژن بووە لەپێناو زاوزیَ) [١٠٦]منیش (واتە ئەنجلس) بۆم هەیە زیادی بكەم بلێم :(یەكەم ناكۆكی چینایەتی لەمیژوودا هەلكەوت لەمل ملانی نێوان ژن و پیاو -( **ان اول تعارض طبقى يتوافق زمنيا مع تطور التناحر بين رجل والمرأة فى اقتران الزوجى ،واول اضطهاد طبقي يتوافق زمينا مع اضطهاد الجنس الذكر لجنس الانثى**) ، لەوەش زیاتر (فیرك فرج) دەلیت :( چەندین هەزار سالە خێزان بریتی بوە لەشانۆی جەنگی نێوان پیاو و ژن) ، تا ڕادەیەك ئەو ڕاو بۆچوونانە پاساوی ئاینیشی هەیە ،لە كتێبی موقەدەس ئاماژە بەو دۆخە دەكاو

---

[١٠٤] نصوص مختارة –فريدريك انجلس ،اختيار: جان كانابا ، تعريب:وصفى البنى ص٣٢١

[١٠٥] كارل ماركس – العلاقة بين الرجل والمرأة .

[١٠٦] ئەو نوسینەی ماركس خۆی بوە لە كتێبی (الأيديولوجية الألمانية ص٣٢ ) .

دەڵێ: **(فجلت بقلبي لأعلم وأبحث وألتمس الحكمة وحقيقة الأمور، لأعلم أن الشر جهل والجنون غباوة. فوجدت أن ما هو أمر من الموت، المرأة، لأنها فخ، ولأن قلبها أشراك، ويداها قيود. من كان صالحا أمام الله ينجو منها. وأما الخاطئ فيعلق بها)**[١٠٧] .

**٨-ڕەگە نیشتمانیەکەی** : ڕەگ وپاساوو مقەوەماتی خێزان پەیوەندی بە خۆشەویستی وئینتمای زێدو نیشتمانەکەی بابەتێکی سەربەخۆ نیە ،پەیوەستە بە خالەکانی ٦ و٧لە چوارچێوەی شارستانی وکۆمەڵایەتی ،بەڵام بۆ کورد خاڵێکی گرنگ وستراتیژە ،مادام لە قۆناغی رزگاریدایە ،تابزانین ئاخۆ پەیوەندی هەیە لە نێوان پاراستن ودروست کردنی خێزانی سەرکەوتو بە پاراستنی نیشتمانی وبەرگری کوردایەتی ؟ یاخود پرسیارەکە وا وورد کەینەوە ئاخۆ چەندە بنەماکانی ئاسایشی نەتەوەیی لە ئاسایشی خێزان دێتەدی ؟ ئەگەر بە ووردی بڕوانینە بنەماکانی (فرق تسد)هەر لەنامە وەڵامەکەی ئەرستۆ بۆ ئەفلاتون تادەگاتە دروشمەکەی کرۆمەری بریتانی کەدەڵێ: قورئان و خێزانم بۆ لەناو بەرن هەموو جیهانی ئیسلامی داگیر دەکەم ،ئینجا پرۆتۆکۆلی (١٠)ی (بروتوكول حكماء الصهيون)کە دەڵێت: بۆ ئەوەی بەسەر ئومەمیان زالبین پێویستە بناغەکانی خێزان تێك بدرێ[١٠٨] ، هەلس و کەوتی داگیرکەرانی کوردستانی ئیستا بە ڕوونی ئەو پەیوەندیە دەردەخا ،بەدەیان بەڵگەنامە هەیە کە حکومەتی بەعس ویستویەتی بنەماکانی خێزان لاواز بکا بۆ ئەوەی بتوانێ بە ئاسانی بەرگری کوردستانی تێك بشکێنێ،لەهەمو ئەوانە دەردەکەوێ بۆ لاواز کردنی بەرگری داگیر کەر دەیەوێ بناغە کۆمەڵایەتیەکان هەلوەشێنیتەوە ،ئەوەش بەهەلوەشانەوەو شلۆق کردنی کیانی خێزانە ،ئەو پرۆسە گەورەیەی (نەخشەی **مجمعات**) ئاوارەکردن وتێك دانی گوندو زێدی باب وباپیران ،ئینجا بڵاوکردنەوەی بەدڕەوشتی وەك سەردەمی مەزدەکی دژ بە کوردو میلەتانی تر تا گیانی بەرگریان نەمێنێ و ئاسان داگیر بکرێن ، گرتنە بەری بەد ڕەوشتی ومادی وگەندەلی ودژ بە پرۆسەی بینای خێزانی ستاندەرە، بە پێی ڕایە هەرە خراپەکانیش (وەك لە پێشوو باسمان کردن)دەبتە هۆی دواکەوتن ونەمانی بەها وهاریکاری وپیاوەتی وجوامێریو نەمانی (گوناحە وعەیبە) و..زۆر بە خێرایش کار لە ئینتمای نیشتمانی وئاینی وکەلتوری ومێژوویت دەکا ،کەسێتیەکی لەرزۆك دروست دەبێ ،تیایدا ماناکانی عەوامی لێ بەرجەستە دەبێت ولە کۆتایدا میلەتێکی مەدەنی (ئومەت)یت بۆ دروست ناکا ،ئەو کاتی وەك ئیمام علی دەڵێ : ينحنون بكل رياح ،إذا تجمعوا ذروا ،وإذا تفشوا نفعوا ، جائاوا چۆن بەرگری نیشتمانی دەکرێ ،هەروەك ئیستاش دەبینین لە ژێر سایەی بەرنامەی سەقەتی دەسەڵاتی کوردی بەنەزانی ومەجانی ئەو بەرنامەیەی داگیرکەر پەیڕەو دەکەن وهەول نادەن بۆ

[١٠٧] سفر الجامعة ٧/٢٥-٢٦ .

[١٠٨] لە٢٤ پروتوكول پێك هاتوە ،مەبەستیشی لە ئومەمی(جويم) غەیرە یەهودە.

پاراستنی کیانی خێزان ،بەو شێوەیەی دامەزراندنێك بێت بۆ سودی گەشەی شارستانی وپتەوی کۆمەلگەو چاندنی گیانی کوردایەتی و پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی.

***　　　　***　　　　***

تا ئێرە ڕاو بۆچوونی ئەوانە بوو .. ، نابوایە (ئەنجلس) خێزان وا دابەش بکات چونکە (بورجوازی) بەپێناسەی خۆیان ئەو کەسەیە کەبەرهەم وئەرکی یەکێکی تر بخوات ...، بۆیە ئافرەت و ا هەلکەوتوە کە پیاوەکەی بەرهەم هێنەرە و کرێکاریەتی ئەویش دەیخوا، کەواتە کامیان بورجوازی دەرچوون ؟ باوەلامەکەی لە (ویل دیورانت-خاوەنی قصة الحضارة) تۆمار بکەین ودەلیٚ ئەرکی ئافرەت خزمەتی (مانی جۆرە) ،ئەرکی پیاویش خزمەتی ئافرەتە ،بەلام هەر لە ئەسلی تێگەیشتنەکە هەلّەیە ،وەك دەبینین ڕایەکان تێك ناکاتەوە، پیاو و ژن لەخێزاندا لەجەنگاندانین ،ئەگەر لەجەنگدا بوونایە دەبوایە بە پێی یاساکانی دیالیکتیك لایەك سەربکەوتایەو کۆتایی بەو جەنگە بهاتبایە، بەلکو لەتەبایی و تەواو کردنی یەکترین ،ئەو نموونەی چەوسانەوەی ئافرەت بەدەست پیاوە وەك نمونەی دوو ڕووی (خراپی وچاکی زانستی)یە ، دەردەکە لەسیستەمی خیزان نیە، بە لکو هۆی ترە وەك باسی لێوە دەکەین ،بۆ (مارکس)یش دەبوایە لەیاساکانی دارستان ودنیای ئاژەلدا تێبینی بکردبایە بیٚ ئەوەی خێزان و (ذکر وانثی)هەبێت کەچی بەهێز چ لەبیٚ هێز دەکات وگەورە چۆن بچوك قووت دەدات ، کەواتە (اول تعارض...) لە کیٚ و پرسی خێزان لەکیٚ؟ بە پێچەوانەوە لە سایەی خێزان نەبێت پارێزگاریەکی تری ڕاستەقینە بۆ خودی ئافرەتەکەش نادۆزیەوە، لەسەر ئەو بنچینە قوولّە تێبینی دەکرێت فەلسەفەی مارکسیەتیش دوو دلّ بوە لەو بۆچوونانەی ، لە هەندیٚ شوێن لێیان پشێمان دەبیتەوە ،لە مانیفیستە بەناوبانگەکەی ئەنجلس ومارکس –کە تیایدا حزبی شیوعی جاڕ دەدریٚ تیایدا هاتوە:ئێمە خێزان هەلناوەشینینەوە بە لکو خێزانی شێواز برجوازی تێك دەدەین،هەروەها دەلیٚ :ئێمە هەڕاجی سێکسی ئافرەتان ناکەین لە شیوعیەتا،بەلکو ئەو هەڕاجە لادەدەین کە لە سیستەمی برجوازیەت وا پەیڕەو دەکرێت[١٠٩] .

ئائیستادەرکەوت لەسایەی بونی خێزاندا وەك سیستەمێك چارەسەری دادپەروەرانەی کێشەکانی ئافرەت دەکرێت، بوونی خێزانیش بە ویست و ئارەزوو و بڕیار نیە ،بۆیە ئەو چارەسەریە خەیالیانە لەلایەن مدرسە جنسی ودەروونی وفکریەکان بۆ ئافرەت لەچوار چێوەی(نەبوونی خیزان) داڕژراوە چوونەوە پال یۆتۆپیاکانی تری فکری ئادەمیزادە، وەك دەریش کەوت خێزان نە تەنها بەرهەمی چالاکی کۆمەلایەتی نە لەقوناغێکی کۆمەلایەتیش لەگەل پێویستیەکانی گەشەسەندن هاتبێتە کایەوە.

---

[١٠٩] مارکس وانجلس – بیان حزب الشیوعی ص٦١-٦٢

*** *** ***

**کەواتە** دەبێ بۆ دۆزینەوەی چارەسەریەکی دادپەروەرانەی کێشەی ئافرەت لەژێر ڕۆشنایی ئەو راستیە کۆمەلایەتیە وسروشتیانە وبوونی خێزان وەك واقعیك دەردودەرمانەکانی دەست نیشان بکەین کە پوختەکەی ئەوانەن :-

١- ئافرەت و پیاو جیاوزن یەکسان ناکرێن (بەومانا یەکسانەی کەمەبەستیانە) .

٢- خێزان هەر هەبووە و هەردەمینیت ، ئیشوکاریش دەبیت دابەش بکریت .

٣- دەبێت ئەو دەزگایە تەنها یەکیان بەرپرس بێت ، نابێت هەردووکیان پەنجا بە پەنجا سولتەیان هەبێت .

٤- پەیامی ئافرەت دایکایەتیە و مەحالیشە ئەو پەیامە بەپیاو بسپێردری یان پێچەوانە .

٥- پەیامی دایکایەتی مانای نوقستانی ئافرەت نیە، مانای دواکەوتنی لەئەرکە مرۆڤایەتیو گەردوونیەکان لە چالاکی فکری و زانستی و فەلسەفی و ئەرکی کۆمەلایەتی و سیاسی و ئابووری و ... نیە، بەلکو بەو دەروازەیەوە ئافرەت دەکەوتەوە سەر پێی خۆی .

٦- ئەوتەشخیسانەی کێشەی ئافرەت دروست نین وهۆکاری چەوسانەوەش نین ،کێشەی ئافرەت ڕاستەقینەیە ودەچەوسێتەوەو بە هۆی جیاوازی پێکردنی ،ئەوەش لە ئەنجامی کۆمەلێك داب و نەریت وکەلەکە بوونی پرۆسەیەکی مێژوویی لە زۆرداری و نەبوونی دادگەری هێناویەتە بەرهەم .

## بەشی چوارەم

## دەقی چارەسەریەکانی ئاینی ئیسلام

چارەسەریەکان لە یاساو (تەشریعاتە ئیسلامیەکان) دێت ،ئەوەش دەمەتەقێیەکی زۆری لەسەرە ئاخۆ ئەوە ١٤ سەدە لەوەو پێش دەرچوە بۆ سەردەمی عەولەمە گونجاوە ،ئەوەیان یەکێ لە پاساوەکانی کمال ئەتاتورك بوو کە لە ڕۆژانی ١ و ٢ و ١٩٢٤/٣/٣تیایدا خەلافەتی عوسمانی پێ هەلوەشاندەوەو لەدوایدا بە مەحال لە قەلەم درا،تاشۆرشی ئێرانی١٩٧٩ دەرکەوت مەحال نیە، بۆیە لە پێشدا با بزانین سروشتی ئەو شریعەتە بۆ ئەو سەردەمە ئەکادیمیانە هەلسەنگێنین ..

<u>شریعەتی ئیسلام و یاساکانی سروشت</u>

لەوەو پێش باسی ڕادەی سەربەستی شت و مەکە سروشتیەکان کرا ،دەرکەوت سەربەستیان نیە، بەلکو هەرهەمووی لەجوولە دان و ئەرك فەرمانەکانیان جێ بەجێ دەکەن بەهۆی کۆمەلێك یاسای

پۆلاینی ناوەندی، هەریەکە ماشێنە گەورەکەی بونەوەر تەواو دەکات، بۆیە هیچ بەشێك ناکۆك و شپرزە (فوضی) نابینی لەگەل بەشەکانی تر وەك مارکسیزم و هەندی لە میسالیەکانیش وای بۆچوون ،بەلکو هەمەهانگی و گونجاوێکی تیکڕای هەیە، هەر هەمووی لەژێر رکێفی یاساو رژێمی مەبەستدارە(هادف) ،ئەو یاسا سروشتیانە راستی و نەگۆرو نەمری بوونەوەرن ،ئەگەر جار دەوترێت یاسایەکی سروشتی بەهەلە دەرچوو، ئەوا یاساکە هەلە نەبوو ،بەلکو ئێمە بەهەلە ناومان لێ نابوو(یاسا)، هەر بەنمونە پێشان وایان پێناسەی گەردیلە دەکرد کە (ئەو پارچەیە چیتر پارچە ناکریت-هەر مانای ئەتۆمیش لەوە هاتبوو) دوای ئەوانە گۆران وتەنی بچوکتر دۆزرایەوە...، ئەوە مانای ئەوە نیە یاسا گۆرا وەك هەندێ زاناو مدرسەی فکریەکان وای تیگەیشتون، بەلکو زانیارەیە هەلەکانی ئیمەیە گۆرا ، ئەو یاسایانە ڕاستین و بە دەرن لەجم و جۆلی گەشەکردنی بیرو زانستی ئێمە . خۆ ئەگەر هەموو دانیشتوانی سەر زەوی بلین (٣جاران٥دەکاتە ٢٠) ئەوە چارە نیە هەر دەکاتە (١٥) و بەس ، جا با ئێمەش جاریَ پیَی نەزانین . بەو شێوەیە سروشت و گەردوون هەر هەمووی بەیاسای توند پێك بەستراوە لەوەتەی هەیە ، هەمووی بەهاوکێشەی بیرکاری و ژمارە گرێدراوە بیَ گۆران، (واتە مسەیەرە مخەیەر نیە ) ، لە قورئانیش هاتوە : (کل شيء قدرناه تقديرا) (وکل شيء احصيناه عددا).. ئەوە لەبارەی یاساکانی سروشتی کەبە ستاندەر دانرایتەوە نە دەستکاری دەکریَ نەدەستکاریش هەلدەگریَ ،کەم ترین گۆڕان لێی دەبێتە هۆی کارەساتی سروشتی و ئەو گەردوون وسروشتە تێك وپێك دەچێت ، بەلام جم و جۆلی کۆمەلایەتی جیاوازی هەیە ، سەربەستی تیایە لەنیَوان کۆمەلێك دۆخ ئازادی چ بکەی، بۆ نموونە لەکڕین و فرۆشتندا دەتوانی قوپیە بکەی ، لەقەپان دزی و فێل بکەی (سوو) بخۆی ..هتد، دەشتوانی بەراستی و بەبی فێل بیفرۆشی، بەگشتی لە پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکان لەنیَوان دوو کەس دەشێت ئەو دۆخانە بێتە ئاراوە: یەکیان عەبد یان کرێکار یان پیاو یان سیخوڕی ئەوی تر بێت بەکورتی یان بەسەری زالە یان زالە لەسەر خۆی ، دەشێش پەیوەندیەکی برایانەو ئادەمیزادانە هاریکاری بێت، سەرنج بدە دوخەکەی بیَ فێل یان ئی دووەم برایانە کە (راستیە) یەك دوخە ،کەچی دۆخەکانی تر فرەو زۆرن، وەك نمونەی ٣جاران٥ کەدەکاتە (١٥) یەك دۆخەو راستیشە ، بەلام ٢٠، ١٢،١٦ .... هەمووی فرە وەلامی هەلەن کە زۆرە ، جا ئەو یەکایەتیە (وحدانیە) ی دۆخەکە ئەوە "عەیار وستاندەرە" کەیە ،خەلکی لەناو خۆدا لەرەفتارو هەلس و کەوت لەگەل یەکدا دەتوانن لە هەموو روویەك بەو عەیارانە هەلس کەوت بکەن،

(ئەوەیە تەواو مانای عیبادەت ) کەرسکان و سروشتی ئەسلی (فیترەی ) ئادەمیزادیش لە سەر ئەو عەیارانە دروست کراون (فطرة الله التى فطر الناس عليها)، واتە فیترەتی ئادەمیزاد و یاساکانی سروشت قورئانی بینراو یەکتر پاسادان دەکەن ،لە سەر ئەو بنچینە قوولە (سید قطب) وەسفی پەیوەندی قورئان ویاساکانی سروشت بە (القرأن كتاب الله المقروء و الكون كتاب الله المنظور)[110] دەکات، جا لە هەر روویەکی کۆمەلایەتی: فکری – ئابووری – معاملە – حوکم – کۆمەلایەتی – ناوخیزان – سیاسەت – پەیوەندی ... هتد عەیارەکی خۆی هەیە ،شریعەتی ئیسلامی بریتیە لە کۆی ئەو عەیارانە، دیارە ئەو عەیارانەش بەگۆران و پیش کەوتنی کۆمەل ناگۆرین ، شیوەی دۆخەکانی ئەوانە دەگۆریت و نویٚ ی لیٚ دادەهینریت، بەلام ئەو عەیارانە خۆیان هەرگیز ناگۆرین چونکە یاسان ، وەك یاسای سروشتی هەتا دنیا دنیایە (٤+٥یەکسانە٩)[111] . ئەگەر بەسەرەنجەوە تیٚ بینی چەوسانەوەو زۆر داری لەقولایی میژوو تائیستا بکەین هەر لە دەرەبەگایەتی و عەبدایەتی و سەرمایەداری و ئیستعماری نوی وە دەبینین شیوەکانی چەوسانەوە دەگۆریٚ بەلام ماهیەتیەکە یەکە،ئەو مەسەلەیە ئیستا هەتا لەلای مارکیسەکانیش ساغ بوویتەوە کەلە پیشان لە هەرە دژی ئەو راستیە بون[112] ، لەقورئانیشدا بەروونی وا هاتووە . هەموو یاساکانی کۆمەلایەتی و سرووشتی بە ئەندازەیی چەسپاون ، بە هاوکیشە و رەنووس پیك بەستراون ، یاسای کیش کردن ،یاسا ی وزە ...، تاودان ،.... ئەوەی دەگۆریت تەنیا تیگەیشتنە هەلەکانی ئیمەیە، دیارە یاساکانی سروشت (عەیارەکان ) بریتین لەشریعەتی گەردونی و یاساکانی کۆمەلیش کە ئەو عەیارانەن داد گەری لەسەر بنیات نراوەو بریتیە لەشریعەتی ژیان ،جا بابزانین ئەو شریعەتەی ژیان وشریعەتی ئیسلامی لەچ پەیوەندیەك دان لەگەل یاساکانی سروشت ؟ بەکورتی بیجگە لەو عەیارانە (واتە شریعەتی ئیسلام ) هەرچی شریعەتیکی دەستکردی تر یان (ریتاردە یان ئەدوانسە) وەك هاوسەنگیەکانی ناو لەش ،لە (٧٢) جار دلٚت زیاتر لی بدا یان کەمتر کارەساتە ، هەرواش بەنیسبەت رێژەی شەکر – ئاو – خویٚ – مادەکانی تر لە لەشدا هەمووی عەیاری خۆی هەیە . لە سەر ئاستی کۆمەلاٚیەتیش هەرعەیاریکی تیك بچیت(بە زیاد یان بەکەم ) واتە شریعەتیك لادراو یاسایەکی چەوسینەرانە هاتە جیٚ ی، کە لەگەل یاساکانی کۆمەل و سروشتیش رووبەروو دەبنەوەو وەك یاخی بوونیك (متمرد)

[110] بروانە : سید قطب - فی ظلال القرأن .

[111] نەوەك جەدەلیەك بلیٚ نەخیر دەگۆریٚ لەسیستەمیکی ژمارەیی تر، بۆبرینی ئەودەرفەتە مەبەستمان لە سیستەمی (عوشریە) .

[112] ئەوە تا (عبداللە ئۆجەلان – لە کتیبە کۆکراوەکانی بەناوی هەلبژاردە لە ل١٤) دەگاتە ئەوئەنجامە .

لەیاساو( ئیجماع )هەلدەکەوی، بۆیەش شایستەی گۆرانە هەردەم حەوانەی نیە (ماله‌ا من قرار)، لێرەدا فلسفەی مارکسیزم لە تەفسیری بونەوەر لەچوارچێوەی( یاسای یەکێتی ناکۆکەکان) بەروونی بەهەلە دا چوونی دەردەکەوی لەدوو مەسەلەی بنچینەیی :

١- لەبوونی ناکۆکی گوایە لەناو هەناوی هەمووشتێك هەیە، لەکاتێکا راستیەکەی ئەوەیە تەنها ناکۆکی لەو بوارانە دروست دەبێت کە ئاسەواری دەست کاری ئادەمیزادی تیدایە ، لەویش لەوبەشەی کەلەسەر عەیارەکان نین ،ئەگینا یاساکانی سروشت هەرگیز ناکۆکی تیانیە .. بایەك نمونە بتوانن بهێنن لەوسروشتە هەبێت یان لەنێوان دوویاسای دروست .

٢- هیچ گۆڕان و گەشە کردنێك بەسەر زانیاری (ڕاستیەکان)دا نایەت ،تەنیا بەسەر ئەو زانیارانەدێت کەهەلەن یان ڕاستی نوی دەدۆزیتەوە، نەك راستی بگۆری ،واتە پانتایی زانیاری ئادەمیزاد دەگۆریت تاراستیەکان دەدۆزیتەوە ..، ئەوە پرۆسەی بزوتنەوەی زانیاریمانە(حرکە معرفە)، لەقورئانیش هاتووە (کلمة الطیبة كشجرة الطیبة اصلها ثابت .. ) شریعەتی ئیسلامە بەرێکی دەخێوێتە یاساکانی سروشت، ئەو ئەلقە بۆشاییەی بوونەوەر پڕ دەکاتەوە بەهەمان یاسا ،کە لەئەسلدا هەریەك دانەری یاسایی هەیە . بۆیە بۆ ناسینەوەی دادگەری کۆمەلایەتی (عەیارەکان) بەگشتی دادگەری ناوخیزان بەتایبەتی، دەتوانین یاساکانی سروشتی بەپیوەر دابنێن ،چونکە هەم یاساکانی سروشتی و هەم داد گەریەکە یەك شریعەتن، بەهەمان ئەندازەی پیچەوانەدەتوانین شریعەتە دەستکردەکان بەوە بناسینەوە کە ناتەبایی و سەنتەر نیە بەیاساکانی سروشت ،کەدەکاتە یاساکانی میکانیکی و فیزیایی و کمیایی و جیولوجی و بایولوجی و فیسیولوجی و سوسیۆلوژی (کۆمەلایەتی) و ئەنژوپۆلوجی و (کۆمەلناسی) سایکولوجی (دەرون ) و ئایدولوجی ....، کەسەرەنجام سروشت و رسکانی (فیترە)ی ئادەمیزاد پێك دێنێت ....بۆیە شریعەتی ئیسلامی نەهاتووە وەك وەلامی دۆخێك و سەردەمێك یان بۆ لایەنێك و شوینێك و یان شتیکی نویٚ ی لە تە بیعات و ڕسکانی ئادەمیزاد دابهێنیٚ، بەلکو خۆی هەیە ئینجا (شریعەتی) بۆ هاتوە، (بکەو مەکە ) ی بۆ دانراوە،گوزارش لەو عەیارانە دەکا کە باسمان کرد، ئەگەر ئەو عەیارەش سەنتەر نەبوو یان زۆر دار دەبێت یان زۆر لێکراو لە هەردوو باردا کارەساتە، بە پێچەوانەوە لەکاتی سەنتەربوونی عەیارەکە واتە (شریعەتی ئیسلامی و داد گەری ) نەزۆر

لێکراو نە زۆر دار دەبێت (لاظالم ولامظلوم)، ئەو عەیارەش بە درێژایی تەمەن و رەوتی کۆمەل چەسپاوە، وەك یاساکانی سروشتن بەشوێن و کات ناگۆڕێن .

ئەی بابزانین شریعەتی ئیسلامی یان ئەو عەیارانە پەیوەندی بەگەشەسەندنی عەقلی ئێمە چیە ؟ لەراستیدا ئەقلی ئێمە چەندە لەپێش بیت هەرسنور دارو کەم زانین ،تەنها نەزان وا دەزانی زۆر زانە ، دەروازەکانی زانیاری ئێمە زۆر تەسك وسنورداره،بوویتە هۆی بەند کردنی، دەرزاوەکانی ئەقلی ئێمە بریتیە لە هەستەکانمان ( چاو – گوێ – بۆن – تام – پی کەوتن ) ،بۆیە لەژێرئەوپەڕی کارتێ کراوی دەوروبەرمانین ،هەر بۆیەش ئەقلی ئێمە هەموودەم پیوەر نیە ،نابێت لە هەموو دۆخیکدا دادوەری و راستی بەئەقل بپێوین ، ئەو کاتی ئەقلمان نزیکە لە پێوەر کە زۆر گەشەسەندووبێت ،لەهەموو نەزانیەك دەرچووبێت ، وەك روونە ئەقلی ئیستامان فراوان و گەشەسەندو ترە لەچەند سەدەیەك لەوەو پێش، ئیستا لەرووی ئەقلیەوەش زۆر نەزانی و رەفتاری دڕندانە فڕێ دراوە، هێشتا زۆریش ماوە و بەرەبەرە بەئارستەی دادگەری بەڕێوەیە، هەروەك دوا ویستگەی رووبارەکان دەریان دوا ویستگەی گەشەی ئەقلیش دەریای دادگەریە ، بۆیە ئەگەر (جەدەلەن) ئیسلامیش نەهاتبایە ئەوا ئەقلی پەرەسەندوو خۆی عەیارو (هۆیە ناوەکیەکانی)دەدۆزیەوە[113] ، خۆی بەندەکانی شریعەتی بۆ هەر پرس وبابەتێك دەدۆزیەوە،مادام هەرکێشەیەك هەر دۆزێك زانیاریو چارەسەریەکەشی لەگەل خۆی هەلگرتوە ، (حکمەت و علەت) لەناو خودی (بابەتەکان،شتەکان، کیشەکان..) خۆی مەلاس داوە ، گەشەی زانست و عەقل بەهۆی ئەو (عل)انە دەگەنە ئەو (علە)انە کە هەمان چارەی شریعەتی ئیسلامە، چونکە شریعەتی ئیسلامی(عەیارەکان) پەیماننامەی(میساق)ی نێوان عەقل و فیترەیە ، هەروەك لەفەرموودە هاتووە (فبعث الله الأنبياء ليستأدوهم ميثاق الفطرة ويذكروهم منسى نعمته ويثيروا لهم دفائن العقول) ،بۆیە شریعەتی ئیسلامی و یاساکانی سروشتی و ئەقلی زۆر پەرەسەندوو هەرسێك یەکتر پاسادان دەکەن[114] .

[113] ئەوەیان لەلایەن ئیبن ڕوشدەوە بەیان کرا لەچوارچێوەی دەمەتەقێیەکەی لەگەل ئیمام غەزالی .

[114] هەروەك ابن تيميه ئەوەی بەووردی ڕوون کردۆتەوەوبۆی دەرکەوتوە (تەعاروز)لەنێوان ئەقلی(صحيح) ونەقلی (صريح) نیە.

## یەکسانی پیاو ئافرەت زۆرداریە لە ئافرەت:

**جیاوازی ئافرەت وپیاو دادپەروەریە** : چەندین بڕیاڕی نێو دەولەتی دەرچوە سەبارەت بەیەکسانی و لە هەمان کاتدا هەر جۆرە جیاوازیەك بە پێی ئەو بڕیاڕانە (سەرچاوەی توندو تیژی وکەم تێڕامان لە ئافرەتە ) ،لەوانەش: ڕێکەوتنی(مافی سیاسی ئافرەت ) لە ١٩٥٢،بڕیاڕی ژ:١٩٢١ی رۆژی ٥/کانونی یەکەمی/١٩٦٣ی نەتەوە یەکگرتوەکان، ئینجا ڕێکەوتنی (قەلاچۆی جیاوازی دژی ئافرەت –سیداو) لە١٩٧٩،دوای ڕێکەوتنی (دەرکێشانی توندو تیژی دژ بە ئافرەت )لە١٩٨٣ .. تا دەگاتەکۆنگرەکانی مکسیکۆ لە ١٩٧٥ وە کۆبنهاگن لە١٩٨٠ و ویکین لە ١٩٩٥..،لە چوارچێوەی جاڕنامەکانیش لە مادەی (١٣ -لقی ب) ی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان و جاڕنامەی (مافی مرۆڤ-بەتایبەتی مادەی٢ ومادەی ١٦)، هەروەهاجاڕنامەی(میساقی مافی ئافرەت)لە نەتەوەیەکگرتوەکان لە٧/٧/١٩٥٤ ، لەخودی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکانیش جاڕی یەکسانی مافی ئافرەت وپیاودراو بەند کرا بە مافی چارەنوس[١١٥] ،دوا هەنگاویشی قەلاچۆی هەمو جۆرە جیاوازی ودژایەتیەکی نەژادی ئافرەت لە خولی (٥٤)ی نەتەوەیەکگرتوەکان لە١٥/ئۆکتۆبەر/١٩٩٩ جاڕدرا ،هەرە توندەکەی مادەی(١)ی ڕێکەوتنی سیداو چەمکی جندرە کە بەهۆی سەپانی هاوتایی ژن وپیاو کاری هاوتاشیان پێ دەسپێرێ بەناوی یەکسانی ، کەچی وانیە،لەکۆنەوە فیساگۆرس لە چوارچێوەی دنیابینی لە ڕوانگەی ژمارە پێی وابوە جیاوازی نێرو مێ قوولە، تاکەکان نێرن وژمارە جووتەکانیش مێ،هەندێکی تر پێیان وایە ئاسمان نێرەو زەویش مێ ،(گریمۆس)ی هۆلەندی ووتبووی جیاوازی نێوان پیاو ژن ئەزەلیە ،لەوەش زیاتر (جۆن گرای)پێی وایە جیاوازیان ئەوەندە زۆرە کتێبێکی بە ئەدرێسی (پیاو لە مریخ وئافرەتیش لە زوهرە) بلاوکردەوە، ،لەگەل زۆری تر لەو شێوەیە، لەڕاستیشدا بەدەیان جیاوازی هەیە وادەکا ئەرك وفرمانی ژن وپیاو لێك جیا بێت،وەك جیاوازی تواناو ئەرکی ئەلەکترۆن وپرۆتۆن لە ناوخێزانی گەردیلە ڕۆڵی گرنگی هیچ لایەك کەم ناکاتەوە .

جیاوازی مانای هاولاتی پلە یەك ودوو نیە ، بۆیە داوای یەکسانی کردن داوایەکی عەبەسیە ،یەکسانی بەکێ؟بەکام جۆرە پیاو ؟برجوازیەکان یان شۆڕشگێرەکان ڕەش سپی ..کامەیان؟ بۆ پیاو ئەوەندەباشن تا ئێوە یەکسانی ئەوانتان بوێ؟ ئەگەر پیاو چەوسێنەر وبورجوازی بێت لەناو خێزان ئێوەش دەتانەوێ ببنە برجوازی یاخود دادگەریتان دەوێ تا بەیەکجاری چەوسانەوە نەمێنێت؟

[١١٥] بڕوانە دەقی بڕیاڕی ژ:١٥١٤ ی خولی ١٥ ی ئەنجومەنی ئاسایش ١٤/دیسمبر/١٩٦١

یەکەم هەنگاوی دۆزینەوەی چارەسەری ڕاست لە دروستی پێشان دانی کێشەکە دێت ،ئەو بۆ چوون و تێڕوانینانەی بۆ ئافرەت گەلآلە کراوان بەشی زۆری لەسەر بنیات و بادلۆیەکی خوار هەلنراون ، بۆیە چارەسەریەکان هەرگیز تەرازوو نابن ، وەك لەدوای بەڕوون تر دەردەکەوێت ، ئاشکرایە کۆمەلانی سەر ئەو زەویە بەتێکرایی کۆمەلێك تایبەتمەندی جیای لەیەکتر هەیە لە هەندێ مەدرەسەو تەیاری تر حسابی لەسەر دەکەن بە تایبەتی تەیاری ناشیۆنالیزمی، کەچی لە ئاین ومەدرەسە ئومەمیەکان شکلیە،جیاوازیەکان دووتەوەرە ،یەکەمیان زمانیان لێك جیایە – ڕەنگیان – بالایان – ڕەچەلەکیان – خوێنیان – پایەی کۆمەلایەتیان ...دوەمیان بریتیە لە جیاوازی فەرهەنگ و ئایدیو لوجیایان (ئایین – خوونەریت – مەیلی سیاسی و ...) ،دیارە تەوەرو بەشی یەکەم سروشتین و میراتە بوون ونەبوونی لەدەست ئەو تاکە نیە ، زمان و بالاو ڕەچەلەکی چیەو بەویست  و کۆششەکانی ناگۆڕێت،ئەوەیان لە ئنسرۆ پۆلۆجیا بە فاکتەرو ئینتمایە ستوونیەکان ناوزەد دەکرێت ، لە ئیسلامدا هیچ بەرپرسیاریەتەکی تیانیە، ئەوەی گرنگە بەشی دووەمە،کە بەفاکتەرو ئینتمای ئاسۆی ناو دەبرێ کە بریتیە لەچالاکی و بەرهەمەکانی ئایدۆلوجی و (ئەقلی) کە لەدەست ئادەمیزادەکە خۆیەتی ، زالّە بەسەر گۆڕانکاریەکانی ئەقلی خۆی میرات نیە بەلکو وەردەگیرێو پەیدا دەکرێ (موکتەسەبە)، ئالێرەیە (دورکایم) و (سپنسر) و (مارکس) و (پاڤلوڤ) و مدرسەی (یۆنگ) و هەندی زانای ئیسلامی و کۆمەلێك زانای تر لە وەلآمی ئەوپرسیارە (لە ژێر توێژینەوەی زانستی)بەهەلەدا چوونە  ئاخۆ ئادەمیزاد لەکێ (مسەیەرە) و بە چ ئەندازەیەك (مخەیەرە) ؟ لەئیسلامدا تەنها حیساب و بەرپرسیاریەتی ئادەمیزاد لە بەشی دووەم(موخەیەرە)  دەکرێت ، واتە: موکتەسەبەکە نەك میراتەکە ،موخەیەرەکە نەك مسەیەرەکە، گۆڕاوەکان نەك چەسپاوەکان،..بە کورتی لە ئاسۆییەکان نەك لە ستونیەکان .

لەچوار چێوەی ئەو جیاوازیە کۆمەلایەتیانەی بەشی یەکەم ئافرەت وپیاویش کۆمەلێك جیاوازی بەدەرلەئارەزووی خاوەنی هەیەلە: توانا،ماسولکە،دەنگ،ڕەنگ،جیاوازیلەپێگەیشتنی جنس،لەهەست ونەست ،تەنانەت شانەکانیشیان لێك جیایە ، وەك باس کران لەرووی تواناى لەش ودۆخی دەروونی هەل و مەرجی بایۆلوجی و فسیولوجی ،ئینجا لەرووی پسپۆری ئەرك و کۆمەلێك جیاوازی خورسکی تر، تاکە یەکسانیەك کەبێتە دی لەئەقلدایە،بۆیە چارەسەری ڕاستەقینە ئەوەیە جیاوازیەکان بۆ کارو فەرمانی جیا ویەکسانیەکەش بۆکاری مرۆیی ، ئادەمیزاد وەك تاکیش بە هەردوو جنسیەوە کۆمەلێك

فاکتەر دەیان جولێنی، خۆشیان هەریەکە لەناو چەندین ئەلقەی کۆمەلایەتی لێك جیان، هەرتاکێك ئینتمای بۆ ئەو کۆمەلە کۆمەلایەتیانە خوارەوە هەیە: ئینتمای خۆین- رەچەلەك- لە هۆزی (س)ە ، لەبنەمالەی (م)ە، لەنەتەوەی(ق)ە، ئینجا ئینتمای ڕەنگایەتی ونەژادی و ڕەشو سپی یان لوت پانە یان ...، ئینجا ئینتمای چینایەتی :هەژاری — دەولەمەندی — ئاغەیە — برجوازیە .... ئینجا ئینتمای جنسی: ئافرەتە یان پیاوە ... ئینجا ئینتمای فکر (ئەقلی) : ئایا چی لەئەقلدایە (مەسیحیە — لیبرالیە — ئیسلامە — شیوعیەت — هندوسە — فاشیە ...) ، هەر مدرسەیەکی فکری لەناو ئەو کۆمەلە ئینتمایانە یەکێکی کردۆتە بنچینەی فلسفی و سیاسی خۆی ،بۆ جیهانبینی و چارەسەریەکان ،هەیە ڕەچەلەکی خوێنی کردۆتە بنچینەی ،لە ئەنجاما رەگەز پەرستی نەتەوایەتی لیٚ پەیدا بووە ،خەلکانی وەك (هتلەروموسولین وصدام...) لی بەرهەم هاتووە، لەوبەشەدا (واتە لە فاکتەری ڕەچەلەك پەرستی) پایەی ئافرەت لەخراپترین دۆخ دایە،مادام ناسینەوەی مرۆڤ لەسەر بنچینەی پشت ونێرسالاریە، هەموو ئەو داب و نەریتانەی وەك شیر بایی ژن بە ژنی ئافرەت نوقستانە و ئەو هەموو قسە نەستەقانە میللەتان (وەك لەوەوپێش تۆمارمان کرد ) لەو مونتلەقەیە هاتووە ،بۆ هەرئینتمایەکی تری ستونی بچین مادام یەکیٚ لەجیاوازیەسروشتی و خۆڕسکی و میراتیەکان بکرێتە بنچینە (کەیاسای ئەخلاقی تیدا نەبیت) ئافرەت بەچەوساوەی دەبێت ، لەبەر هۆیەکی سادە ئەویش ئەوەیە لەو فاکتەرانە هێزی ماسولکەو کۆمەڵایەتی بەدیلی هێزی عەقلانیەتە، پیاویش لەئافرەت بەهێزترە،لێرەدا ڕۆلی یاسا وەك کارکەرێکی ئەخلاقی بۆ بیٚ دەسەڵاتەکان بەسوودە،با هەرچەندە یاسایەکی نادادگەریش بێت وەك (ئەفلاتون ووتەنی )باشترە لە نەبوونی یاسا ،ئەوەش دەروازەیە بۆ دۆزینەوەی چارەی ڕیشەیی کێشەی بیٚ دەسەڵاتان بەگشتی وئافرەت بە تایبەتی ،هەر بەو هۆیەشەوە بۆمان دەردەکەویٚ کە عاملی (ئەقل ) بەتاقانەییە کە هەردوولا (پیاو وژن) بەیەکسانی بەشدار بن لەجم و جولەکانی فکر یان عەقیدە و بروایە کانیان لە رەوشت و رەفتارو تیٚ روانینە کانیان،لێرەدا ویستراوە گورزێکی ئەزەلی لە مافی ئافرەت دەدریٚ بەوەی گوایە مێشکی ئافرەت بچوك ترە لەمێشکی پیاو وەك لەمدرەسەی فرۆیدودەروونناسەکان جاڕدرا،هەروەها نوقستانی ئەقلی ئافرەتانیش لە مدرسەی کۆنی یۆنانی وچینی وهندی ولەتەورات وئنجیل وبەشێك لە فقهی ئیسلامیش پێشاندرا، ئاینە ڕاستەقینە بیٚ دەستکاری کراوەکان بەتایبەتی ئیسلام وەك هەمو بەندە شریعەتەکانی تری لەوەشدا لەقولاییەوە بە پێچەوانەی مدرەسەکانی تر هەموو ئینتمایەکانی وەك بنچینە بۆ پۆلین

(تصنيف) کردنی ئادەمیزادی ڕەت کردۆتەوە ،تەنها عاملی ئەقلی وەردەگرێت، کە هەر هەموو ئادەمیزادێك بە جیایی ئنتماکانی ستونی وئاسۆییەوە بەیەك ئەندازە دەتوانن لێی بەشدار بن، ئەوە لەلای ئیسلام گرنگ نیە ئەو ئادەمیزادە لەچ هۆزێکە ؟ یان لەچ نەتەوەیەکە ؟ پاکستانیە یان ئەمریکیە ، ڕەشە یان سپی یە ، ئاغەیە یان کرمانج ، ئافرتە یان پیاوە ... گرنگ ئەوەیە :ئایا چی لەئەقلدایە ؟ ئەوە جەوهەری هەر ئادەمیزادێکە لە ڕوانگەی ئیسلام ،بەهەموو تەبیعاتیەوە ،جیاوازی ئافرەت و پیاو لەچوار چێوەی جیاوازیە گەردوونیەکانی وەك ڕۆژ و مانگ و هەواو ئاو وئاسن و.. لێك جیان ،کانزاکان لێك جیان لەبەکار هێنان و سودو سیفاتی کیمیایی و فیزیاییان، خواردەمەنیەکان لە سود و خۆشی وکەمی و زۆری ... لێك جیان ، قورئان باسی (افضليةتی) کردوون (تلك الرسل فضلنا بعضهم على البعض ..البقرة-٥٣)

ئەو جیاکاریانە مانای (فضل) لەمرۆیی نیە ، بنچینەکە ئەوەیە کام ئادەمیزاد دۆخی فکری بریتی بوو لەرژێمی سیاسی و کۆمەلایەتی مرۆڤایەتی و داد پەروەرانە بێت ، ڕەفتارو کارەکانی بەو پێیە بێت ،ئەوا ئەو ئادەمیزادەیە گەورەترو(ئەفزەل تر) ،جا پیاوە ئافرەتە ئەلمانیە بی کەسە...(ان اكرمكم عند الله اتقاكم)، تەنهاوەبەتەنها لێرەوە ئەو دادگەریە دێتە دی، چونکە بوونی ئادەمیزاد لەو ئینتمایە بەدەرە لە ویست و ئارەزووی ، ئەگەر عەرەب بە گەورەتر دانرا (بەخراپ و چاکەیەوە) لەکوردوهندیەك ئەوا ئافرەتی کورد لە چ ڕێگەیەك تێبکۆشی بگاتە ئادەمیزادێکی بەکار لەو جهانە، مادام چارەی ڕەش بووە و عەرەب نیە ،ئەوە پەك کەوتنی مافی ئافرەتە ئینجا پەك کەوتنی پیاو وتەواوی کۆمەلگەیە، کەحەتمەن مافی پیاویش لەگەل کەوتووە . بەلام هەر ئادەمیزادیکی سەر ئەو زەویە دەتوانن مێشکی خۆیان بکەنەوە ڕاست ترین ڕێگا بگرن و ئەو ئەقلەش بەیەکسانی دراوە بە زاناو نەزان و فەیلەسوف و پیاو و ئافرەت وکوردو عەرەب وئەورووپی ، توانای ئەقلی ناکەوێتە سەر قەبارەی کەللەی سەرو سەنگی مێشك وەك هەندی خەلك وزانای تریش لی ی بەهەلە داچوون و ئافرەت بە نوقستانی سروشتی دادەنێت ،گوایە چونکە سەنگی مێشکی ئافرەت چەند گرامێك کەمترە لە پیاو ،بۆ دەمەتەقێ دەێلین مێشك تاقە لانەی جێی ئەقل نیە وەك بەشی هەرە زۆری وای لی تێگەیشتووین بەتایبەتی خەتی مادیەت، ئەوەتا چەندین پۆلی زیندەوەری سەرەتایی ئەمیبیای و بەکتریایی و ڤایرۆس هەن نەمێشك و کۆئەندامی دەماری مەرکزیشیان نیە ،کەچی ئەقلیان هەیە ،بۆیە قەبارەو سەنگی مێشك پیوەری زیرەکی وتیژی ئەقل نیە ، هەرئادەمیزادێك لەدەست خۆیەتی

تا چ رادەیەك تێدەكوشی و ئەقلەكەی بەكار دەهێنی ئەوە زانا تر دەبێت هەروەك لەقورئانی پیرۆزیش ( یؤتی الحكمة من یشاء..البقرة-٢٦٩)، ئیمام علی دەلێت: (تەنها دەفری ئەقلە بە پڕبوونی فراوانتر دەبیت)[١١٦]، زیاتر لەوە دەقاو دەق هەرئادەمیزادیك رادەی مرۆڤایەتیەكەی بەوە دەپیورێ كە تاچ رادەیەك ئەقلی (ئەخلاق) زالە بەسەر ئارەزووەكانی، كە ناكۆكیەكی سروشتی یە لەناو ناخی هەموو ئادەمیزادێك، ئەسلی ناسین و پۆلین كردنی ئیسلامی بۆ هەر ئادەمیزادێك وەستاوە لەسەر ئەنجامی ئەو ناكۆكیەلەسەر دونیاو لەقیامەتیشدا[١١٧] ، دیارە ئەوە بە پێچەوانەی مدرسەی شیوعیەت وهەندێ لای تر ئەقل ناكاتە بنچینە ،سەرنج بدە ئەنجلس دەلیت :بۆ ناسینی تەبیعات و ئینتمایەكانی بەشەر سەیری كەللەو سەری ئادەمیزاد مەكەن بەلكو سەیری دۆخی ئابووری وبازارەكەی بكەن ،یان دەلێن مێژوو لە گەدە دەستی پی كردووە نەك لەئەقل ،هەشە دەلێت لەئامیری جنسی و ئیدیش دەلێن لە (زمان) و سوپەرمانەكانیش دەلین لە (خوێن) ....، بەیەك پرسیاری ئازادانە بەسادەیی بۆ هەموان دەردەكەوێ كەكامیان راستە، ئایا لە لەشی ئادەمیزاد كام ئەندامیان لە هەموویان گرنگترە ؟ زۆر روونە كە ئەقلە ،ئەگینا لە دونیای ئاژەلیش هەموو ئەو پروسە و ئەندامانەی ترهەیە ،لەئیسلام دا هەر ئەقلە (حوجەی ئەوەل وئاخیر)كە هەر لەوەشەوەیە ئافرەت دەتوانی بەهاوبەشیەكی یەكسانی بەشوێنی خۆی بگات، ئەگینا لە هەر فاكتەرێكی ترو ململانێی تر قسەكەی ئەنجلس ئەو كاتی راست دەردەچیت،كە دەلێت: پەیوەندی پیاوو ژن بریتیە لە(اخچاع جنس لجنس اخر) ،چی ووتویانە ڕەنگە راست دەرچێت ، ئەو جیاوازیانەی تریش بنچینە نین نابنە رێگر و نوقستانی ، ئاخۆ ئافرەت بی هێزە، كورت ترە، بە بەزەییە، پسپۆرو پەیامی جیایە ... ئەوانە جیاوازی ڕووخسارین بە تایبەتی لە عەولەمە چونكە بەرە بەرە فاكتەری عەقل جێی ئەو فاكتەرانە دەگرێتەوە ،كۆمەل بە ئافرەت و پیاوەوە هەر دەبێت وەك (تۆینبی) گوتەنی دەبێت بەشەكانی كۆمەلگەش وەك لەشی ئادەمیزاد هەر ئەندامەی ئەركێكی پیێ سپێردراوە بۆی تەرخان كراوە، چاو بۆ بینین و دەست ماندوو ترە لە پرچ ،دلّ لەجگەرو.. هەریەكە بە ئەركی خۆی ، دیارە لەو ئەركە جیا جیایانەی ناو كۆمەلیش هەریەكە جۆرە ئەركێكی پی رادەسپیردرێت ، ناتوانی ئەركی بگۆڕی هەروەك ناكری ئەركی دل بەجگەر بسپێری، لێرەوە چەمك وئامانجی (جەندر)زیادەڕۆكەی دەردەكەوێ وئاواش ناكرێ ئەركی پیاو بە ئافرەت

---

[١١٦] دەقەكەی (كل إناء یضیق بما جعل فیه إلا وعاء العلم فإنه یتسع) كە لە كتێبی (الف كلمة المختارة-امام علی ) وەرگیراوە .

[١١٧] بۆ زیاتر لەو بارەیەوە بڕوانە :مەوسوعەی جودی –جەنگی نێوان ئەقل ودەروون .

بسپێری یان پێچەوانە ، ئەو ئەرکانەش پیوەری مرڤایەتی نیە ،وەك پیشتر ووتمان و دەمێکە لیّ ی بەهەلەداچووین، کە لەزەمانی یۆنانی کۆن لەسەر زاری (دیمۆستین ) هاتووە و (ویل دیورانتی) تازەش هەردووبارەی کردۆتەوە و ئەرکی ئافرەتیان داناوە بۆمانای جۆر (نوع )، نەخێر ئەرکی مەزن تریشیان هەیە ،بابزانین هەردوولا بۆچی هاتونە ئەو دنیایە و بۆکویّ دەڕۆن ؟کەواتە چ بکەین لەسەر ئەم دنیایە ؟ پەیامی ئادەمیزاد چیە؟هاتوە ەبۆ (تەعمیری زەوی —کە مانای ئەکادیمی بریتیە لە بەرپا کردنی شارستانی ) لیّرەوەیە دەبیّ ئەقلەکەی بەکار بهێنین تا لەدونیا بەختەوەر و لەکۆتایشدا سەربەرز ، بەو شیّوەیە ئیسلام دەتوانی ئەو نیو کۆمەلەی( واتە ئافرەتان) کەپەکیان خرابوو بەگڕیان بێختەوە بۆ پیش کەوتنی کۆمەل وگەشەپێدانی زانست و بەرهەم و هینانەدی دادگەری، ئافرەتیش لە نوقستانیەوە بۆ تەواوەتیەوە ،جا لەسەر ئافرەت پیویستە بۆ خۆ ڕزگار کردن هەول دەندادگەری ئاینی بکەن بە پیشەنگ تەنها و بەتەنها لەویّ ئەو ئامانجانە دێتە دی بێجگە لەوە لەخشتەبردنە .

**هاوسەری**

پیشوو تر باسمان کرد کە ئەو جۆرە تیّڕوانینەی گوایە لەسەرەتا هاوسەری بە قۆناغی (تێکەلی-زواج جماعی) ودوای بۆ (فرە هاوسەری )ودوای (تاك بەتاك) ڕاست دەرنەچوو ، کۆن ترین پەیوەندی نێوان هەردوو ڕەگەزە پیّش بونی دەولەت وئیدارەو یاسالەگەل پەیدابوونی مرۆڤایەتی جمك بووینە ،خۆی لە ئادەم وحەوا گوزارش کردوە ،هیچ ساتێك بیّ ئەو پڕۆسەیە ژیان نەمانای دەمێنیّ نەبەردەوامیش دەبیّ ،بەلاّم ڕەنگە هەمو سەردەم ولەهەموشوێنێك ئەو هاوسەریە شارستانیەی لە شیّوەی مارە کردن ونوسینی پەیماننامەو شاهێد ومۆر کردن نەبوە ،ئەوەی لەجهاندا باو بوو چەند جۆرێك بوو کە لە نێو عەرەب کۆ ببۆوە ،لەڕاستیدا هەرچی نەریتی نێگەتیڤی یۆنانی وچینی وهندی ونەریتی کۆنی ترە لە نەفامی عەرەب کۆببۆوە ،بەپێی ئەو فەرمودەی ح عائیشە تۆماری کردوە چوار جۆر هاوسەری سەرەکی هەبوە :كان النكاح في الجاهلية على أربعة أنحاء :فنكاح منها نكاح الناس اليوم ، يخطب الرجل إلى الرجل وليته أو ابنته ، فيصدقها ثم ينكحها .ونكاح آخر كان الرجل يقول لامرأته إذا طهرت من طمثها :أرسلي إلى فلان فاستبضعي منه ويعتزلها زوجها حتى يب  حملها ، فإذا تبيّن أصابها إذا أحب .و يفعل ذلك طمعا في نجابة الولد ويسمّى هذا النكاح نكاح الإستبضاع .ونكاح آخر :يجتمع الرهط ما دون العشرة ،فيدخلون على المرأة كلهم يصيبها ، فإذا حملت ووضعت ومرّ

عليها عدة ليال أرسلت إليهم فلا يستطيع رجل منهم أن. تنع حتى يجتمعوا عندها ، تقول لهم :قد عرفتم ما كان من أمركم وقد ولدت فهو ابنك يا فلان تسمّى من أحبّت باسمه ، فيلحق به ولدهاو لا يستطيع أن تنع منه الرجل .ونكاح رابع :يجتمع ناس كثير فيدخلون على ا لمرأة و لاp تنع ن جاءها وهنّ البغايا a ينص . على أبوابهن رايات تكون علماa فمن أرادهن دخل عليهن a فإذا حملت إحداهن ووضعت جمعوا القافة ثم ألحقوا ولدها بالذي يرون a فالتاط به a أي) التصق (ودعي ابنه a لا ...لەگەل چەند ووردە جۆری تریش.

لەزۆربەی مەملەكەتی جیهانی لە چین وهندو تا ئەسبرتەو ئەمریكا ئەو سەردەم هەندێ جۆری تری هاوسەری لە پێناو بوونی وەچەیەكی بە هێز هەبوە بۆ شەڕو بەرگری،زۆربەی جار گەڕیدەو مێوان بە ئەولیاو گرنگ زانیوە وایان زانیە خزمەتی ئاینیە ئافرەتەكانیان لێ چاكردوە ،هەروەك چۆن كەر ومایـن ومانگا لە نێری بەهێز چاك دەكەن ،لە شارستانی بابلیش وەك هیرۆدۆتس دەیگێڕیتەوە دەڵێ ئافرەتان لە ژیانیا دەبوایە بچوبوایە پەرستگای(میلیتا وعەشتار)لەوێ ڕێز دەبوون تا كارێكی جنسی لەگەل حاجیەك بكردبایە،ئەو نەریتە پەڕیەوە زۆربەی جیهان،لەناوچەكانی توركستان وسیبریا وتیبت وهندو هیمالایەو سیلان(وسیریلانكا) كۆشنش(ڤیتنام) وبۆرماو فلیپین و زۆرلای تری ئەفریقاو ئوسترالیا وبرازیل و وهەتا لەهەندێ ناوچەی یۆنانیش هەندی نەریتی نەفامی تری وا هەبوە بە یەك بنەماڵە ژنێكیان هەبوە (Polyandrie ) ،ژنی برا گەورەكە دەبوو ئەوانی تر شریك بوون ،منداڵەكەش بەناوی برا گەورەكە دەبوو، لەهەندێ شوێن دەبوە ئی هەموویان بۆیە لەكۆتایدا بەناوی دایكی بانگ دەكرا ،دەبێ تێبینی بكەین ئەوانە دۆخێكی شازوقێزەون بووینە نەك گشتی ، بۆیە تەعمیم كردنی بۆ قۆناغێك وسەردەمێك هەڵەی كوشندە دەردەچێت هەروەك لە تویژینەوەكانی (مادی-عەلمانی )لە ئەنجلس ومۆرگان وزاناىانی تر بینیمان ، هەرچەندە ئەونەریتە بەربەریانەی عەرەب لەسەر دەستی ئیسلام پاك كرایەوەو تەنها هاوسەری شارستانی مایەوە ،بەڵام لە سەردەمی ئەمەوی وعەباسی جارێكی تر ئەو نەریتانە دزەیان كردەوە لە ڕێی خەلیفە ئارەزووبازەكانەوە ، نەریتی شەوە ڕەشە لە ڕێی مازدەكیەكانیش هاتبوە كوردستان پێش ئیسلام دووبارە چووبوە نێو زۆر تیرەو تایفەی ئیسلامی وبنچینەیەكی ئاینیشی پێ درابوو ئەو ماڵەی لێی كۆدەبونەوە پێی دەووترا(دار الصفوة)[١١٨] ،دەڵێن تاچەند ساڵیك لەمەو بەر لە نێو هەندێ تایفەی بچوكی كوردستان

---

[١١٨] بڕوانة : د عبدالسلام الترماتيني-الزواج عند العرب- ص١٧-

هەبوە بەڵام جاریٚ هیچ توێژینەوەیەکی ئەکادیمی نەبەدرۆی خستۆتەوە نە پشت راستیشی کردۆتەوە ، بەڵام جارێکی تر ژن بە ژنەو بەبچوکی مارە کردن بە خەستی گەڕایەوە نێو جهانی ئیسلامی لەسەردەستی عەباسیەکان بە دواوە ،لەنێو کوردیش باوی هەبوو تالە کۆتایی سەدەی بیستەم لە سەر دەستی لایەنە ئیسلامیەکانی کوردستان بە ئەزموونی کردە ئەو نەریتە کۆتایی پیٚ هێنرا.

لەو بوارەدانەریتی وا هەیە هاوسەری هەر لە نێوە خۆ دەکریٚ ،لە عەشیرەت بۆ عەشیرەتێکی تر بە دروست نازانن،یان لە ئاینێك بۆ ئاینێکی تر لە هەموان توند تر ئەو ئاینانەی بوویتە میرات وەك زەردەشتی ویەهودی ،لە یەهودی (بەتایبەتی ئەو تایفەی پێیان دەووتریٚ ئەسینی)[119] هەرچی بەدەر بیت لە خۆیان بە موشریك وجویم وئومەمی وئاژەل هەژمار دەکریٚ بۆیە بە پێی ڕێنمایی تەلمۆد ڕیٚ نادەن هاوسەریان لەگەل بکریٚ ،لە (سفر الملوك الۆل ١١:١-٦)سەرزەنستی (ح سلیمان) دەکا چونکە ژنی لە میلەتی تر هێناوە ،دوای بەدەفی ئایەت قەدەغەی هاوسەری لەگەل (ئومەمی) واتە میلەتانی تر دەکا ودەلیٚ( ...**الذين أخطأوا بزواجهم من الأمم**)[120]،لەفرنسا بە یاسای مەدەنی سالی ١٨٠٤ هەلوەشایەوە بە فەرمانی ناپلیۆن (مەجمەعی یەهودی کۆبونەو) وئەو نەریتە یەهودیەیان بە پێی یاسا لادا ،تەنانەت لە مەزهەبێك بۆ مەزهەبێکی ترلەیەك ئاینیش هەندیٚ جار بەدی دەکریٚ ،لەنێوان ئەرسەدوکس وپرۆتستان وکاتۆلیك ئەو دۆخە هەیە ،لە نێو هەندیٚ مەزهەبی ئیسلامیش هەیە.

لەگەل هاوسەریدا دیاردەیەکی دەگمەنی پێچەوانەی هاوسەری هەیە پێی دەووتریٚ (ڕەبەنی) ،بەو ڕوانگەیە هاوسەری دونیایی وئارەزووبازیەو ناشرینە بۆیە بەشێك پێیان وایە ئاین پەروەری تەواو تەرکی دونیاکردنە بەهەموو ماناکانیەوە ، دووركەوتنەوە لە ئافرەت خواپەرستی زیاترە،سەرۆکی روحی ئاینە دەستکاری کراوەکان بۆیان نەبوو هاوسەری بکەن ،هەروەها بۆ ئەو ئافرەتانەی لە پێناو خودا نەزر کراون ، ئەو نەریتە بۆ ئاینی تری وەك رۆژ پەرستی وبت پەرستیش بوە لە تەواوی جیهانیش بلاو بوە لە مکسیك وپیرۆ وئەفریقا و هند ،لە ئاینی بوزا دەلێن (وەك مەسەلەی ح مەسیح) دایکی بوزا بە ڕەبەنی بوزای بوە بۆیە وا پیرۆزە ، ،لەئاینی یەهودی (بەتایبەتی تایفەی ئسینی)زیاتر لە هەموان هێرش کراوەتە سەر هاوسەری وبە پرۆسەیەکی نامرۆڤانەو دوور لە ئاین لە قەلەم دراوە ،بەشێك لە مەسیحیش بەو فەرهەنگە کاریگەر بووینە وەك لە پەیامەکەی بۆلس

---

[119] ئەسینی لە ئەسینای پایتەختی یۆنان نەهاتوە بەلکو لە یەکسانی هاتوە .

[120] **کتاب المقدس** (عزراء ١٠) —اية(١٨—..) .

بۆ(خەلکی کورانت)دەلێ ئەگەر ترس لە زینا نەبوایە ئەوا پێم دەووتن هاوسەری مەکەن بەڵام هەرچۆنێك بێت هاوسەریەکە لە ئاگر باشترە هەر بۆیەش بێوەژنەکانیش ئەگەر خۆتان بۆ ڕاگیرێ باشە ئەگینا ئێوەش وا بکەن .

لەو سەردەمە هاندانی هاوسەری بوویتە بەشێك لە فەرهەنگی مۆدیرن ،بەڵام هێشتا ڕێگەی ڕاستەقینە کە لە قازانجی ئافرەتە وەك پێویست نیە، هەرچەندە ئەوەی لە بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان و خودی میساق یان ڕێکەوتنە نێودەولەتیەکانیش بەدی دەکرێ هانی هاوسەری شەرعی کەم دەدرێ ،زیاتر داکۆکی لە مافی ئافرەت لە ئازادی پەیوەندی ناڕەوا دەکا ، بە پێچەوانەی دروشمی زانستی (خۆپاراستن لە چارەسەری باشترە) مادام ڕێگەی دروستی شەرعی هاوسەری هەبێت بۆ بەرەو ئەو چارە ترسناکە پاڵ بدرێن.

لەلایەکی ترلەکۆنەوە تائیستالەلایەن هەموو مەدرەسەکان هەولێ بۆ درا هەولدراوە بەدیلێك لەجیاتی ئەو شێوە هاوسەرییە کە بریتیە لە مارەکردن و گواستنەوەو مارەییانەو گرێبەست و ... بدۆزرێتەوە، ، لە شیوعیەتدا هەولدرا سەربەستی جنسی بەرەڵا بکرێت وەك بەدیلێك و لەیەهودی و مەسیحی زۆر ئاینی تریش رەبەنیەت و زۆر شێوەی تر تاقی کرایەوە،هەروەهاباس لە هاوسەریەتی جیاجیای وەك: (هاوسەری دەرەکی –Exogamy) ،(هاوسەری ناوەکی-Endogamy )،(هاوسەری تێکەڵ-Mixelmeriag )، (هاوسەری ئاسایی –یەك بۆ یەك-Monogamy ) ،(فرە ژنی - Polygamy ) ، (فرە مێردی-Polyandry).. لەدوای شکستی هەموو ئەوانە گەڕانەوە سەر شێوەی ئێستای هاوسەری وخرایە نێو بەلگەنامە نێودەولەتی ودەستورەکان،تیایداداکۆکی لە هاوسەری وپێك هێنانی خێزان کرایەوە ، هەرچەندە بەشی هەرەزۆری ئەو شێوەیەی ئێستای هاوسەری لەسەر عەیاری خۆی نیە، هۆیەکەش دەگەڕێتەوە بۆ لادانی کۆمەڵ لەسەر سکەی خۆی، لە پێشاندا زۆر جۆرە هاوسەریەتی هەبوەو ئێستاش هەر ماوە، وەك شیربایی، ژن بەژنە، شەوەڕەشە، گۆڵکردن[١٢١] ، بەپێچوون،... ئینجا لەسەر بنچینەی پایەی کۆمەڵایەتی لەرێکەی تقوسی ئایینی و ڕەوشتی سەیرسەیر، لەزۆر شوێندا وا باوبووە کە شەوی یەکەم لای گەورەی کۆمەڵەکە بێت، یان لای سەرەك عەشیرەت یان شایەکە بێت لەوانەش لە کوردستان لە پێش هاتنی ئاینی ئیسلام ئەو نەریتە

[١٢١] لە نێو عەرەب ولەنێو هندیش جۆرێکی باو لە هاوسەری هەبوە ،نزیکەی ١٠ کەس پێکەوە هام وشۆی جنسیان لەگەل کچێك دەکرد لە مالی باوکی منداڵەکە لەکامیان بوایە (بە پێچوون) ژنەکە بۆ ئەو دەبوو .

بەرەبەرە بە هۆی هەردوو مەزهەبی مانی ومەزدەکی بلاوەبوویەوە، جاریش وابووە لای پیاوێکی ئاینی بووە، ئیتر زۆر نەریتی سەیر سەیر.

لەناو هەندێ ئایینیش لەوانە مەسیحیەت و یەهودیش مەسەلەی هاوسەری و زاوزێ بە هەنگاوێکی ناپاکی لەقەڵەم دەدەن، بۆیە پێشەوا ئایینیەکانیان (راهیبەکان) نە ژن دەهێنن و نە مێردیش دەکەن، گوایە بەپاکی بمێننەوە، گوایە روح پاکەو جەستەش پیسە..! لە پەیامێکی مامۆستا پترۆس هاتوە (رەبەنی بۆ خوایەو هاوسەریەتیش بۆ دونیایە).

هەڵوێستی شیوعیەتیش بەرامبەر هاوسەری دیسان سەلبیە، مارکس دەڵێت: (مەبەست لە هاوسەری برجوازیانە بەرهەمەو ئافرەتەکەش ئامرازی بەرهەمهێنان دەبێت )[١٢٢] ،ئەنجلس دەڵێت: (هاوسەری تەنیا بۆ زاڵبوونی پیاوانە بەسەر ئافرەتاندا)،بەشێك لەوانەی کوردستان گوایە داکۆکی لەمافی ئافرەت دەکەن دەڵێن زۆربەی ئەو جۆرە هاوسەریەتە بریتیە لە (پڕدان -إغتصاب) .

لەئاینی ڕەسەنداولە ئیسلامیشدا هەموو ئەو نەریت و راوبۆچونانە تێك و پێك دەشکێنرێت، لەشوێنی ئەو پەیوەندیانە پەیوەندییەکی مرۆڤانەی واقیعی دادەڕێژێ کە سیستەمی مارەکردنەو ڕەزامەندی هەردوولا لەسەر بنچینەی کۆمەڵێك دیسپلین **(ضوابط وروابط)** ،نەك هەر ئافرەتەکە پێیەوە بەند بێت بەڵکو پیاوەکەش، ئەو بنچینانەش نابێت تەنیا جنسی بێت وەك فرۆید و وسترمارك و هەندێکی تر کە دەڵێن هاوسەری تەنها بریتیە لە (یەککرتنی جنسی نێوان کوڕ و کچ) وەك واباوە ئێستاش.. ئەو پێناسە سەردێری ڕای زۆربەی عەلمانیەتی ناوچەکەشی گرتۆتەوە،هەر بەنمونەم(الموسوعه علم الإجتماع)وا پێناسی هاوسەری دەکاو دەڵێ: (الزواج هو علاقه جنسیه تقع بین الرجل والمرأه)[١٢٣] ،نەخێر بەڵکو دەبێت بنچینەکان بە پلەی یەکەم ئایدیۆلۆجی بێت ئینجا بنچینەکانی تر، وەك کۆمەلایەتی، خۆشەویستی، خزمایەتی، شارستانی و لەوانەش بنچینەی جنسی، ئیدی شەریعەتی ئیسلام بە پێچەوانەوە هاوسەریەتی سەپاندوەو بە بەشێك لەباوەڕی داناوە، لە پێش باسی هەندێ دۆخی لە ئاینە سەرەکیەکانی تری وەك مەسیحی ویەهودیمان کرد سەبارەت بە هاوسەری بەلام بەگشتی هێل بۆهاوسەری کێشراوە،لە تەورات وئینجیل هانی هاوسەری دراوەو مەرجیشی بۆ دانراوە لە تکوین(١ و٢-٢٨) و(جامعه٢ و٤-٢٨) (تکوین٩ :1) (عبرانیین١٣: ٤) بە سیستەمی ئیلاهی

---

[١٢٢] کارل مارکس- العلاقة بین الرجل والمرأة .

[١٢٣] الموسوعه علم الإجتماع –ص٢٢٢

وهاوبەشی ژیان وهاریکاری پەسند وهۆی مانەوەی وەچەووەسف کراوە ، لە ئاینی مەسیحیش لە نامەکانی (١کورنپوس٧: ١-٤) (٢کورنسوس٦: ١٤-١٧) (١کورنسوس١٣) باس لە مەرج وپێویستی هاوسەری دەکا، پێکەوە بە پرۆسەیەکی چارەنوسسازی دەزانن، لێرەوە پرسێکی گرنگ لەو بەشە چارەسەر دەکرێ بە پێی ئەو ڕوانگە لێك جیاوازانە لە بارەی پرسی باوك بۆ مارەیی ، ئەگەر هاوسەری تەنها مانای (یەکگرتنی جنسی)بێت و بەس ئەوا ڕاستە لە مارەییدا پێویست بە شاهێد ورەزامەندی (ولی امر)نیەو ماناشی نیە ،بەڵام ئەگەر هاوسەری قووڵتر بێت لەوەو مانای کۆمەڵایەتی وژیاری وسیاسی و فکری ومرۆیی تێدا بێت، ئەوا پرۆسەیەکی گرنگ وچارەنوسسازە پێویست بە ڕاوێژو شاهێدی ونوسین وگرێبەست هەیە* ،کێ هەیە لە (ولی ئەمر) دلسۆز تر بۆ ڕاوێژ وپرس پێ کردن وەك لە ئاینی ئیسلام ومەسیحی داکۆکی لەسەر دەکا *،ئەوەنەك بۆ ئافرەت بۆ پیاویش ،بەڵام بۆ پیاوەکە بەو پلەیەی ئافرەت نیە چونکە لە کاتی سەرنەکەوتنی هاوسەری وتەڵاق ئافرەتەکە زیانی قورسی بەردەکەوێ لە کچەوە بە (بێوەژن) ناودەبرێ، هەندێ نەریتی سەلبی کە جار وایە زوڵم لە ئافرەت دەکرێ بەو هۆیەوە نابێ وات لێبکا لەو پرۆسە زانستیەی ڕاوێژ وپرس و ڕاو مارەیی و پێویستیەکانی تر دوور کەویەوە.

ڕێگای هەڵبژاردنیش بۆ هاوسەریەتی سەربەست کردوەو بۆ هەردووك، ئێستا وەك جارِدان هەر هەموو زانایان هاتونەتە سەر هەمان ڕای ئیسلام بۆ ئەو مەسەلەیە، واچاکە هەر ئەو دەقەی بەندی (١٦) لەجارِی گەردونی مافی مرۆڤ تۆمار بکەین کە تیایا هاتوە (پیاو و ئافرەتی پێگەیشتوو و مافی هاوسەریەتی و دامەزراندنی خێزانیان هەیە. مارەبڕین بەتەنیا قایل بوون و سەربەستی تەواوی ئافرەت و پیاوەکە دەکرێت).

ئەگەر پابەندی بە ئیسلام هەبێت لەپێشدا خودی پرۆسەی هاوسەری بە(نصف الدين) وەسف کراوە بە پێچەوانەی چەمکی ڕەبەنی لە ئایندا یان مانای تەرکی دنیا کردن هەروەك لە سۆفی گەرایی، ئینجا

---

* ئەرمەن دەڵێن: اختر زوجتك بعين شيخ , واختر حصانك بعين شاب

* لە ئاینی مسیحیش لە چوارچێوەی مەرجەکانی هاوسەری بریتیە لە : ١-هەردوولا مەسیحی بن ٢-کوڕەکە کەمێك گەورە تر بێت لەکچەکە ٣-تۆبزی نەبێ ٤-ڕەزامەندی دایك وباوك.

نابێت (چ ئافرەت چ پیاو) یەکتر هەڵبژێرن لەسەر بنچینەکانی: دەوڵەمەندی، پایەی کۆمەڵایەتی، رەچەڵەك، جوانی.. (لە ئاینی مەسیحیش هێلی بۆ کێشاوەو لە ئینجیل(١کورنپوس١٣) هاتوە: حب الشهوه لا يبنى بيتاً سليماً ) ،واباشە ئەو فەرمودانە بۆ ئەوە لێرە تۆمار بکەین:

١- لا تزوجوا النساء لأموالهن فعسى أموالهن ان تطغين.

٢- من تزوج امرأة لحسبها لم يزده الله الا زيادة...

٣- من تزوج امرأة لعزها لم يزده الله إلا ذلا ...

٤- تنكح المرأة لأربع : لمالها ولحسبها وجمالها ولدينها ، فاظفر بذات الدين تربت يداك ، کەچی لە بەشێکی زۆری فقهی ئیسلامی فتوای پێچەوانەی ئەو فەرمودانە بەدی دەکرێ ،یەکێ لەوانە فتوای ئیمام شافیعی (کە کوردیش لەسەر مەزهەبی ئەو زانایەن) لە بابی(کفائە) قەدەغەی پێدانی ژنی عەرەب بە عەجەم دەکا، لە هەندێکیان دەبینرێ ئەو ژنانە تەلاقیان پێ داون کەدراونە عەجەمی وەك ئەوەی خوارەوە چۆن ژنێکی عەرەبیان بە(بن سيرين)ی کورد تەلاق داوە (حَدَّثَنَا سَعِيد بن أسد ، حَدَّثَنَا ضمرة عن ابن شوذب قَال: تزوج بن سيرين عربية وكره الموالي لما يدخلهم من السيي. قَال: فذهب بن عون يتشبه به فلم يحمل له العرب ذلك ، فرفعوه إلى بلال بن أبي بردة بن أبي موسى الأشعري فضربه وفرق بينهما ، قال له: طلقها. قَال: هي طالق. قَال: ثلاثًا قَال: واحدة تبتها. قَال: أقول له ثلاثًا وهو يبتها. وقال له: طلقها. قَال: هي طالق ثلاثًا. قَال: واحدة. قَال: أقول له ثلاثًا وهو يفتيني بطلاقها)[١٢٤]، **لەکاتێکا لە فەرمودەو لەدەقی قورئانیش (نسب وحسب وعز) ڕەتکراوەتەوەو تەنها ئاینی لێبژێردراوە لە هاوسەری ،کەچی ئەو ئیمامانە کردوویانەتەوە مەرج ، ئەوە فڕی بە ئیسلامەوە نیە بەلکو لە بنەچەدا لە نەریتی خێلەکی وتەوراتی دەستکاری کراو هاتوە کەسەرزەنشتی (ح سلیمان) دەکا کە هاوسەری لەگەل میلەتانی بێگانەی وەك(مەوانی وعەمۆنی وئەدۆمی وسیدۆنی وحەسیەکان) دوای بەدەقی ئایەت قەدەغەی دەکا نەك ئافرەتی یەهودی هاوسەری لەگەل بێگانە بکابەلکو پیاویشی (..الذين اخطأوا بزواجهم من الأمم)[١٢٥]، دەبوابی لەبابی(کفائە) ی فقهدا تەمەن وهەندێ دۆخی تر دیاری بکرابوایە نەك جیاوازیە نەفامیەکانی ڕەگەزو خوێن ونەتەوە**

---

[١٢٤] المعرفة والتاريخ – أبو يُوسُف يعقوب بن سُفيان الفسوي، المحقق: د أكرم ضياء العُمَري ج٢ ص٦٣.

[١٢٥] كتاب المقدس –سفر الملوك (١١:١–٦) هةروةها (عزراءاية ١٨–.. )

**دیاری بکرابایە ،هاوسەری لەنێوان ڕەگەزی جیاجیا کارێکی زۆر تەندروستە و ئەسلێکی ئاینیە ، مەرجی نمونەیە ئەو سەردەم بۆ مارەیی ئەو مەرجەی سەروو نەبوە ،مەرجی ئوم سلیم عەرەبایەتی نەبوو بەلکو (کێ ببێتە موسولمان) ، لەسەر**
ئەو بنچینە بەهێزە پێغەمبەر(د خ) مارەیی (ام سلیم بنت ملحان)ی بە باشترین مارەیی داناو دەڵێت: (**فما سمعت بأمرأة قط كانت أكرم مهرا من ام سليم كانت مهرها إسلام**) دیارە (ام سلیم) مارەییەکەی خۆی بەجوانی و دەوڵەمەندی و ڕەچەڵەك و.. نەبەستۆتەوە بەڵکو بە مەرجێکی ئایدیۆلۆجی بەستۆتەوە، دەبێت ئەوەی دەیخوازێت بیروباوەڕەکەی بگۆڕێ لە بێ ئایینی بۆ ئیسلامەوە، ئاواش ڕویداو ئەو فەرمودەی کە لەسەروو هاتوە ئێستاش زۆر ئافرەتی وا پەیدا دەبێت بەرەو زیادبوونە.

هەر لەسەر هەمان تراز ئەسمای کچی ئەبوبەکری دەوڵەمەندترین کەس مێردی بە (زوبەیر)ی هەژارترین کەس کرد. ئەگەر بەو شێوەیە نەبێت هەمووی عاملی چەوسانەوەو هەڵخەڵەتاندنی تێدایە، بەتایبەتی بۆ ئافرەت وەك ئێستا زۆرباوە، ئەو شێوە دەستنیشان کردنە برجوازیانە بە هەزاران کوڕ و کچ لێی زەرەرمەندن، لەو شێوە هاوسەریە برجوازیانەیە دەبێتە سەرچاوەی گیروگرفتەکانی خێزان، هۆیەکیشە بۆ پەیوەندی جنسی نارەوا، ئەوەیە سەرچاوەکەی نەك وەك ئەنجلس و مۆرگان و هەندێك زانای تری وەك مارگریت مین، دۆپۆمیری، شوارتز... وای بۆ دەچن کە ئەو دەردە لە سیستەمی خێزانە، مۆرگان ناوی ناوە (هیتایریە) و ئەنجلسیش بۆی لێك دەداتەوەو دەڵێت (هیتایریە) دەروازەی (**بغاء المطلق**)، سەرنج بدە ئەنجلس هەر لەوبارەیەوە دەڵێت: (...ئەو پەیوەندیە ئاشکرایە لەزیادبوندایە بە هەموو شێوەکانیەوە، کە بەرەو بێناموسییەکی بێتام دەڕوات)،بەڵام ڕاستی ئەو دۆزە وانیەو وەك پرسی (ملکیەتی تایبەتی) دەردەکە لە (سیستەمەکە) نیەو ئەو لانە ئەنجامەکانی لە عەیار لادانەکەیە.

لەئیسلامدا مەرجی یەکەم و کۆتایی بۆ هاوسەریەتی (**المرأة الصالحة**)یە واتە خاوەنی بیروباوەڕێکی دادگەرو هەقی هەبێت (کچەکە و کوڕەکە) جا ئەوە: هەژارە، دۆمە، ئەمریکیە، ناشیرینە،. ئەوانە هەمووی شێوەی جەوهەرەکەی (صالحیەکەی)... دیارە ئێستا هەموو زانایانیش هاتنە سەر ئەو باوەڕە لە هەمویان بەئاشکراتر (تۆلستۆی) وەك ئامۆژکاری دەڵێت لەگەڵ ئافرەتی(سالح) سەرکەوتووترین ژیانە،ئیسپانیش دەڵێن بەختەوەر ترین ژیان ئەوەیە هاوسەرێکی بە ئەمەکت هەبێت، ئەوەیە

هاوسەریەتی دادپەروەرانە دەبا لێرەدا ئەو دەردە هەبێت (هیتایریە) لێرە چی دەکات؟ ئەوەیە ڕێگەی ژیان، کەی(حەبی مەنع)ی (راسل) ڕێگەی ژیانە؟ ئەوە چ جۆرە کۆمەڵگایەکی لیێ دەردەچێت؟ بێجگە لەوە هەمووی گێروگرفت و چەوسانەوەوەو بێئومێدی ژیانە.

## کامیان سەرۆك خێزانە؟ -ئافرەت یان پیاو

وەك مەسەلەی خێزان سیستەمی بوونی سەرکردەو بنکە بە بریارو ڕێك کەوتنێکی کۆمەلایەتی نیە ،بەلکو بەندێکە لە فەرهەنگی گەردوونی ، جا نەك هەردەبیێ و نابیێ بەلکو پێویستیەکی ژیانە بۆ هەر کۆمەلە خەلکێك دەبێت: سەرکردە هەبێت، یاسا پارێز هەبێت ڕێنماییدەر و وەرگریش هەبێت...، ئەوە لەگەل پێش کەوتنی شارستانیەت و ئالۆز بوونی ژیان و فراوان بوونی (کمالیەتی ژیان) زیاتر پێویست دەبێت ، پێچەوانەی مدرسەی کلاسیکی مارکسیزم و هەندی فەیلەسوفانی تر کەپێیان وابوو لە شیوعیەت پیویست بە سەرکردەو ڕێنماییدەر ناکات ، زیاتر لەوە ئیستا زانایانی کۆمەلایەتی و ئەنسرۆبۆلوجی و سیاسیەکان بوونی دەولەت و سەرۆك و میللەت و خزمەت کردن و بەڕێوەبردن و پسپۆری و دابەش بوونی ئەرك ... پلە بە پلە بەمانای سیستەمی کۆمەل دەزانن ، لەوانەش خەستتر (ئەرنۆلد تۆینی) دەلێت هەروەك لەشی ئادەمیزاد میشك لیێی فەرماندەرە و قاچ و دەست وئەوانی تر فەرمان وەرگرن ، کاری هەست جیایە لەگەل کاری پەنکریاس ، دلێ ماندووترە ،یەکێکیان گرنگ ترە لەوەی تر.. لەکۆمەلیشدا بەو شێوە ، خێزانیش بەشێکی ئەو کۆمەلەیە یان وەك دەلێن دەولەتۆکەیەکە بەهەمان شێوە ئەو دابەش بوونەی دەوێت، سەرەك خیزان – لێپرساوی مال –ئیش کەر و لێپرسراووفەرمان وەرگرو... هتد ،ئەوە بەلگە نەویستە هیچ فەترەیەکی میژوویی خەلکانێك بەناوی کۆمەل بیێ خێزان وبیێ دابەش بوونی ئەرك و بیێ مرکزیەت نەبووە و نابێت ، ئەو ڕایانەی سەبارەت بە دایك سالاری ئەو قۆناغانە لەپیشدا تۆمارمان کرد بەسەرنجێکی کەم بۆمان دەردەچێت کە هەمووی بیێ بنچینەن و لەگەل یەك ناکۆکن و لەتەسکایی مێشکی خۆی هەلقولاوە، کەواتە ئیستا لەبەرامبەر ئەگەرەکانی خێزان دەرچووین ،دەبێت بەرپرس و بەڕێوەبەری هەبێت، ئەوەی جێی سەرنجە

زۆربەی ئەوانەی داکۆکی لە مافی ئافرەت دەکەن حەق وناحەق وا تێکەڵ دەکەن مافەکەش بزر دەبێ ،زۆربەی دروشمی ئافرەتانی ئیستا دژ بە تەبایی خێزانە لە چوارچێوەی مەرکەزیەت ،ئەوەش بە ڕوونی لە مادەکانی ١ و ٥ و ٩ و١١و١٣١٥و١٦کۆنگرەی سیداو بەدی دەکرێ ،لەو مادانە بە بێ دیاری کردنی دۆخێکی دیاری کراو کە ئاخۆ بە فەرمی کامیان سەرۆك خێزانە،لە زۆربەی بانگێشەکانی مافی ئافرەت وا هەست پێ دەکرێ دەیەوێ ئەو تەباییەی نێو خێزان تێك بدا،هانی تێك دانی ئارامی دەدا وهانی یاخیبوون دەدا ،دوای خۆشی لە بەرپرسیارێتی و سەرەنجامەکانی لادەدا .

لە پێشوترهاتینە سەر سێ دۆخ یان پیاوەکە بەرپرسی یەکەمە یان ئافرەتەکە یان پەنجا بە پەنجا دابەشی دەسەڵات دەکەن، لەپیشتر باسی ئاستەمی بوونی دووبەڕێوەبەرمان کرد، کەواتە پرسیارەکەی پێشوو تەسك بوویەوە بۆ ئەو پرسیارە کە ئەلقەی کیشەکەیە: ئایا کامیان دەبێت سەرەك خێزان بن ئافرەتەکە یان پیاوەکە ؟ دیارە دووبارە دەبێت وەلامەکەی لەسروشتەوە دەست پی بکەین، واتە هیچ موتلەقیەك نایەلینەوە بێ لیکۆلنینەوە، هەموو روشەنبیرێك سەربەستە لێرە لە ئەگەرەکانی بکۆلیتەوە، بێ دوودلی دەلێین دەبێت پیاوەکە سەرەك خیزان بیت ،لەبەر ئەو هۆیانەش :

١- هۆیە واقیعەکەی : سەرتاسەری کۆمەل سەرەك خیزان پیاون .

٢- هۆیە میژووییەکەی : واتە ئەگەر بگونجابایە لەهەندێ شوێن ئافرەت سەرەك خیزان دەبوو ، ئەگەر بەدەگمەنیش هەبووبێ ئەواله چوارچێوەی دانیشتوانی زۆر دواکەوتوی بێ شارستانین .

٣ — هۆیە فیزیکی و ماسولکەییەکان :- دیارە وەك ئاشکرایە بەهۆی کۆمەلێك کارگەری فسیولوجی و هۆرمۆنی (نەك کۆمەلایەتی ) پیاو بەرگری زیاتر لەئافرەت ، ئەو رۆلە وای فەرز کردووە سەنگەری یەکەم وئیشی دەرەوە بەبەر پیاو بکەویت ،ئەو فاکتەرەش هەر بەکار دەبێ لە کۆمەلگەیەکی دواکەوتوی ڕاوکەر تا کۆمەلگەی ئەلەکترۆنیدار.

٤- کۆمەلێك هۆی کۆمەڵایەتی وشارستانی تری بەهێز هەن ،بناغەکەی دەگەڕێتەوە بۆ تایبەتمەندی فسیولوجی ئافرەت وزێدە باییەکی لە نرخی پیاو زیاتر دروست کردوە* ، کەوای لەئافرەت کردووە بەسەلامەت ترو جێیەکی هێمن تری بدرێتی بە پێی توانا ولێوەشایی .

٥- هۆیە فیسولوجیەکان: ئافرەت بەهۆی دوگیانی و بێ نوێژی وتوانای ماسولکەیی وکۆمەلێك هۆکاری تری پەیوەندی ئورگانیکی بە زاو وزێ وپاراستنی پەردەی کچێنی ..وەك کۆمەلە فاکتەرێکی

---

* یەکێ لەو نرخ وزێدە باییانەی بریتیە لە (پەردەی کچێنی) .

بەدەر لە بڕیارِ ویست و ئارەزوو فەرزی کردووە کە ئیشی ناومال بەر ئافرەت بکەویت ، پەیامی ئافرەت دایکایەتی بێت.

لە ڕاستیدا بوونی پیاو بە سەرۆك خێزان ڕێسایەکی زیندەکیە ،لە نێو مەیمون توێژینەوە کرا بۆ دۆزینەوەی هۆکاری بوون بە سەردەستە ، دەرکەوت ئەو مەیمونانەی دەگەنە ئەو پلەیە (ریزۆس) هۆرمۆنێکی تایبەتی لە ناو خوێن یاریدەدەریانە بە ناوی (تەستۆستیرۆن)،ئەوانی تر ئەو ڕێژە هۆرمۆنەیان نیە[126] .

٦-ئەگەر ئەوشوێنەی ئافرەتمان بە پیاو داو جێی هەردوولامان گۆڕیەوە دەبینین بە سەدان موزاعەفاتی جەستەیی وفیزیکی وفیسیۆلۆجی وکۆمەلایەتی وئابوری وسیاسی وشارستانی لیَ سەرهەلدەدا، کە ژیان وگەشەش ڕادەوەستیَ،پسپۆرانی بواری (سەرکدەوبەڕێوەبەر)١٣ ئەرك وتایبەتمەندی بۆ دیاری کراوە[127] .

دەبوایە مۆرگان وهکسلی ومارکس و ئەنجلس و زاناکانی تر وهەندیَ نووسەری کوردیش بەرپرسیارەتی ناومال بۆ ئافرەت بەسەرەتایی کەوتنی مافی ئافرەت هەژمار نەکردبایە ،ئەگەر وابیَ ئەوا بیَ چارە دەبوو وەرگیز ئافرەت مافی نەدەبوو ، دەبتە چارەوبەخت ڕەشی کەوتنێکی سروشتی بەدەر لە چارەی بەشەری، چونکە ئەو دابەشیە لەدەست کۆمەل نیە بنچینەی سروشتی وفسیولوجی خۆی هەیە ،دابەش بوونێکی سروشتی دادپەروەریەدوورە لە دەستکاری بەشەرە،واتە ستاندەرە ، چونکە هەرداب و نەریت و پرۆسەیەکی کۆمەلایەتی ڕەگ وریشەی لەدەرەوەی پرۆسە کۆمەلایەتیەکان بوو ئەوا دادپەروەریە،مادام بەدەرە لەبڕیارە چەوتەکانی کۆمەل،بەدەرە لە بڕیارِی زالم بەسەر مەزلوم .

کەواتە وەك واقعێك دەرکەوت (**الرجال قوامون على النساء**)،ئەوە بە جۆری تر ڕەنگ دەداتەوە،بە نمونە لە بریتانیا هەرچەندە کارەکانیشیان ماسولکەیش نەبێت هەربە فەرمی ئافرەت لە ٦٠سالی خانەنشین دەکریَ وپیاویش لە ٦٥سالی جاچجای کاری تری ماسولکەیی ، بۆیە شریعەتی ئیسلامیش وای بۆ هیناوە (وللرجال عليهن درجه البقره-٢٢٨))، بەلام مانای جیاوازی مرۆڤایەتی نیە،مانای پلەیەکی پیاو پلە دووی ئافرەت نیە ، بەلکو لەچوارچێوەی جیاوازی سروشتیەکانی کانزاو دارو

---

[126] بۆ زیاتر بڕوانە : الموسوعة الصغيرة رقم:١٢٨-عالم الهرمؤنات ص٩٠ .

[127] د عبدالحليم عباس قشطة –الجماعات والقيادة ص٥٣ .

درەختەکان جیاوازی پسپۆریەکان ...کە چۆن ئەو جیاوازیانە پرۆسەی سروشتی تەواو دەکەن ، چۆن جیاوازی لە پسپۆری وشارەزایی پرۆسەی گەشەی کۆمەل تەواو دەکەن ،چۆن کاری دەستی وکاری زیهنی وکاری تەکنۆلۆژی پرۆسەی بەرهەم تەواو دەکەن .. ئاواش جیای لە ئەرك وپسپۆری پرۆسەی خێزان تەواو دەکەن .

ئەو هەموو دەنگە لەبارەی شارستانیەتی مێینە و شارستانیەتی نێرینە چەندە هەڵەیە، ئەگەر (بەگریمان) تیۆری پەرەسەندنی داروینیش راست بێت ،ئەوا خۆ لەدنیای ئاژەل و بالداریش ئەو نمونە بەدەگمەنە نیە کەمێ سەرەك خیزان بێت ،ئەگەر هەندی نمونەی دوور گوایە ئافرەت لێپرسراوی یەکەمە لەهۆزەکانی (ئاپەنمول – مەندوجر – یان هۆزەکانی غینیا و مانون – و تشامپولی و گاروس لەبنگلادیش ..هەروەها لەلای ئێمەش هۆزی دۆم و قەرەج ئەوا هیوایەکەی ئەنجلس و زانایان و هەندی لایەنی کوردی خۆشمان هاتتە دی (کە ئافرەت لەئابووری ناومال دەرچووە) کەچی سەرەك خێزان هەر پیاوە، ئەو هەنگاوانە زیاتر ئافرەتەکانی چەوساندۆتەوە، وا بەرەو لەناوچوونیشە، ئنجا ئەو جێ گۆرکیە واتە لێپرسراوی ئافرەت لە خێزان و سپاردنی ئیشی دەرەوەی مال بەئافرەت بوویتە هۆی دواکەوتنی ئەو تیرو هۆزو خێلانە، لە پرۆسەی پیش کەوتن و شارستانی بەشدار نەبن ...، واتە ئەو جی گۆرکیە نەخۆشیە – دواکەوتنە – چەوسانەوەیە – نادادگەریە..کەوابێ چۆن دەبێ ببتە بنچینەی بانگێشەی مافی ئافرەت؟!. لەسەردەمی پێش کەوتن و ڕووناکی و زانستی ئەو ڕایانە هەر هەمووی ئیستا ساغ کراوەتەوە ،ئەوەتا توێژینەوەی زانایانی دەروونناسی و ئەنسرۆپۆلوجی و کۆمەلایەتی و هەتا سیاسیش و بگرە ئابوریناس و فیزیایی و کیمیایی و بیرکاریەکانیش هەر هەموویان هاتوونەتە سەر ئەو قەناعەتە کە کیانی خێزان بەو دەقەی خۆی لە گرێبەستی مارە برین وسیستەمی هەرەمی و دابەشی ئیش و .. تەواوە ، بەتاقی کردنەوەی زیندوو لە ناو هەموو هۆزەکانی پیش کەوتوو و دواکەوتوو هەموو سوچێکی ئەو دونیایەیان پشکنیە ئینجا ئەو بڕیارەیان داوە ،نەك وەك مورگان و ئەنجلس هەر لەسەریەك (دێ) یان (هۆزیك) و بەخەیال بڕیاری وا بدەن، جا ئیستا هەرکەسی دەتوانی خۆی ئەو دیمەنە بێنێتە پێش چاو ئەگەر سەرەك خیزان بدرێتە دەست ئافرەت چەند نەگونجاوی و موزاعەفاتی وای دەبێت، کەژیان وەك کۆمەل پەکی دەکەویت، هەرسادەترین نمونە پیاو کاتێ لیپرسراوی ئیشی ناومال بوو، ئایا کێ ئیش و کاری دەرەوە لەکاتی دووگیانی و زاوزێی ئافرەت ڕادەپەڕێنی؟ بەو شێوەیە بۆمان دەردەچی نەك هەر نابێت بەلکو هەر چەوسانەوەیەکی تری سەربار بۆ

ئافرەت زیاد دەکات ، کە لە توانای فسیولوجی و ماسولکەی و ناسکی و گرنگی ئافرەتەکە دەردەچێت، ڕەنگە بڵێن تەکنولوجیاو کۆمپیوتەرو سیستەمی ئوتوماتیکی کەلێنی هێزی ماسولکە پڕدەکاتەوە ...، بەلی ڕاستە بەلام پێویستی ماسولکەی تەنها بەرهەم هێنان نیە، ئیش و کاری دەرەوەش تەنها نەوەستایتە سەر هێزی ماسولکە،تا دونیا ماوە هەم هێزی زیهنی هەم هێزی ماسولکەی بۆ کۆمەڵگەو خێزان ومرۆڤیش پێویستە ، ئەوە لەلایەك، لەلەلایەکی ترەوە تەکنۆلۆجیاش جیاوازی فسیولوجیەکانی پێ چارەسەرناکریت، ئەو دابەش بوونەی ئەرکی ئافرەت و بوونی پیاو بە بەرپرسی یەکەم لەئاستی مرۆڤایەتی کەم ناکاتەوە ،چونکە لەئیسلامی ڕاستەقینەدا سەرەك و ڕێبەرو بەرێوەبەرو بەرپرسیارەتی هیچ ئیمتیازی نیە وەك ئیستا باسی لیوەدەکەین.

**سەرۆکایەتی خێزان ئەرکە یان ئیمتیاز**

بەشێك لە نوسەرو توێژەرەکان کە پیاو بە چەوسێنەر وبورژوازی هەژمار دەکەن بە بە بیانۆی ئەوەی کەسەرکردەو سەرەك دەولەت و سەرەك عشیرەت و سەرەك خیزان ..وا دەبینرێ وەك زۆردارێکی خۆویست وخاوەن ڤیتۆ وئیمتیاز ، ڕاستیشە ئەو شێوازە سەرکردایەتیە دەسکەوت و زۆر داری تیایە، چ لەو سەردەمەی ئیستا بەتایبەتی لە جیهانی عەرەبی وکوردی ــئینجا لە مێژووی سیاسی موسولمانانیش ،بەلام وەك مەسەلەی (مولکیەت) کە لەمەوپێش باسمان کرد خەتای سیستەمی مولکیەت نیە، لەوەشدا خەتای سیستەمی سەرکردایەتی نیە، وەك عەرەب گۆتەنی( سوء الاستخدام لاینفی الاستخدام) بەلکو لە بێ سنوری دەسەلاتەکەیە ، هەرکاتێك دەسەلات و ئەرکی ئەو سەرۆکانە بەپێی ستاندەر((عەیار)) بوو،ئەوا چەوسانەوەی تیا نامێنی . لە ئەسلی ئیسلامدا سەرەك دەولەت و رابەری کۆمەل و سەرۆك خیزان و .... مانای ئیمتیاز نیە، بەلکو ئەمانەتێکە وەبگرە ئەرکێکی ناخۆشە، هەموو کەس پێی ڕازی نیە ،چونکە دەبتە خزمەتکار نەك سەرۆك- (سیدالقوم خادمهم) ، ڕەنگە جێی سەرسوڕمان بێت بۆ خەلکانێکی نەشارەزا لە ئیسلام و ئەزمونە زێرینەکانی چەند سەردەمێك ، ئەو کات بۆدانانی ڕابەڕی هەرێمێك زۆر جار توشی گێرو گرفتی دەبوو کەسیان دەست نەدەکەوت، نەك لەبەر لێنەهاتووی، بەلکو دەیان ووت نامانەوێ ئەو ئەرکە قورسە بخەینە سەرشانمان ، دەبوایە بە تەکلیف و فەرمان یەکەکیان تەرخان بکردبایە ، هەمو ئەوانە لەبەر هۆیەکی زۆر سادە ، چونکە ئەو خەلکە خۆویست نەبوو ،ئینجا ئیمتیازیشی تێدا نەبووە، کرۆلە – مۆنیکا– زەوی – پارەو پوول و رابواردن و پایەی تیا نەبوو . بۆیە لەکۆمەلگای ئیسلامی بەراستی نە سەرۆکیك

نەسەرەك خێزانیش بەمانای (سید و عبید ) (بور جوازی و پرۆلیتار) (ئەفسەرو سەرباز) نیە، پایەی کۆمەلایەتیش بەدەست بەرهەم هێن نەبوە وەك (ئەنجلس) وای بۆچووبوو ، (د. نوال ) و (د.خلیل ابراهیم ) زۆری تر و لەکوردستانیش بەگەرمی دووبارەی دەکەنەوە ،بەو شێوەیە سەرۆك خیزان ئەگەر بەدادگەری (بەحوکمی ئیسلام بێت) ئەو کاتی هەریەکە دەسەلات و ئەرکی خۆی پیادە دەکا، ژیانی سروشتیەکەی هەروەك ئافرەتەکەیە ، بۆیە تەنها ئەخلاقی ئاینی ڕاستەقینەیە دەتوانی ئەو دادگەریە بپارێزی ،ئەگینا هەر سەرەك خێزانێکی سەر بە مدرسەیەکی تر هەرگیز چەوسێنەر دەبێت، وەك وا دەبینین و مێژووش هەر وابووە .

## سەرۆك خێزان و دیسپلین:

هەر لە ڕەوتی ڕاوبۆچوونەکانی ئەوانەی دژی دەسەڵاتی مەرکەزین لەناو خێزاندا توشی ناکۆکی دێن، هەر لەو زانایانە کە دێنە سەر پرسی ئیدارەی وولات و سەربازی و دەزگاکانی تر باسی ڕەوای مەرکەزیەت و گرنگی دیسپلین و گوێڕایەڵی دەکەن، هەر هەموو دان بەوە دەنێن ئەو مەرکەزیە پێویستە بۆ سەرۆکی کۆمپانیا و سەرۆك ئیدارەو بۆ هەر دەزگایەك ،تەنانەت دیموکراسی و(لامرکزیش) بێ مەرکەزیەت نابێت، ئایا ئیدارەی خێزان لە هەموو ئەو دەزگایانە پێویست تر نیە ،هەر خۆی بە وڵاتێکی بچووك وەسف دەکرێت، کە کۆمەڵێك یاساو ڕێسای خۆی هەیە، پێویستە هەموو لایەك پابەندی بن، دەبێت بشیپارێزێ، لە بەڕێوەبردنی حکومەتدا (بەندیخانە) و(دورخستنەوە) (سێدارە) و سزا هەیە، بەکورتی (سزا) لە ئەسڵدا بۆ ئەوە هاتووە خەڵکی خواروخێچ و زیانبەخشی پێ ڕاست بکرێتەوە، ئەوە بەشێکە لەژیان، هەندێ ڕاوبۆچوونی سیاسی و فەلسەفی و کۆمەڵایەتی هەیە دژی توندوتیژییە(هەرچەندە هەر بەقسە)، بەڵام ئەوە واقعی نیە، ڕاستە هەندێ نەخۆشی لە لەشی ئادەمیزاد بە حەب و دەرمان چا دەبێت، بەڵام جار وایە نەشتەرگەری(عملیات )پێویستە، (چاو) خۆشەویستە بەڵام جاروایە نەخۆشە دەردەکێشرێ ،هەرواش لەناو کۆمەڵ هەموو شت بە ئاشتی و ئامۆژگاری خۆشە بەڵام هەموو بەشێکی کۆمەڵ ئەوەی قەبوڵ نیە، لەو بەشەدا ئەگەر شەقێکیان لێدای لا ڕومەتەکەی ترت بۆ وەرگێڕا ئەوجارە دە شەقت لێ دەدا..، ئەوانە هەمووی بەشێکن لە ئیشی ڕۆژانەمان و بەچاو دەیان بینین لەناوخۆ و لەنێودەوڵەتانیش ،بەڵگە نەویستە مشت ومڕی پێویست نیە، ئاینی ئیسلام زیاتر لە هەموان باوەڕی بە چاکسازی هەیەو سنوری بۆ فراوان کردوە، بە پێچەوانەی ئامۆژگارییە بەناوبانگەکەی (مارکس) بۆ مارکسیەکان کە دەڵێت: (ئێوە شۆڕشگێڕ بن

نەك ئیسلاحی)، بە پێچەوانەی دنیای سەرمایەداریش کە بەگوێرەی (یاسای دارستان) توندوتیژە بۆ بێهێزان و نەرمە لەگەڵ بەهێزان،هەروەك لە مێژوو و واقعی ئیستا وا دەیبینین[128]، لە ئیسلامی ڕاستەقینە (یاسا)یەکسانە بۆ نزیك و دوور بۆ دەوڵەمەند و هەژار بۆ ڕەش وسپی بۆ بەهێز و بیٚ هێز بۆ فاتیمەی کچی محەمەد(د خ) وئافرەتێکی یەهودی، حوکمی نەفامی لەهەر شوێنێك و لە هەر سەردەمێك و لە ژێر هەر ناوێك بەوەی جیادەکرێتەوە کە یاساکە هەژاران دەبرێت و لە بەهێزانیش لادەدات[129]، ئینجا لە ئیسلامدا مەبەست لە سزابۆ ئیسلاحە.. جا لەناو خێزانیشدا( کە ولاتۆکەیەکە)ئەو هەموو ئالۆزیەی تیایەو پێویستە لەگەڵیدا بەهەموو دۆخەکانی دا بچیٚ، هەم مانای ژیان و هەم بنەماکانی ئیسلام لە یەك کاتدا: ئامۆژگاری و توندوتیژیە،ووشیاری و لێبوردنە، دورخستنەوەوسزاو پاداشەکانی تریشە ،هەریەکە لە شوێنی خۆی ، بۆیە بۆسەرۆك خێزان ڕەوایە هەمو ئەو ئامرازانە بەکار بهێنیٚ،بەڵام هەروەك چۆن ئەو سیستەم وحوکمڕانیە نمونەیە کە زیندان وسزای پێویست نەبێت ،ئاواش ئەو سەرۆك خێزان و ژن ومنداڵانە بەوە نمونەیین کە ئیدارەی ئەو خێزانە پێویستی بە سزاو چاو سورکردنەوەو مەولەت ولێدان نەبێت ، هەرگیز نابێت ئەو تاوتویٚومەرکەزیەتە زۆرداری بێت ،بەلکو وەك سەرۆك دەوڵەت ئەمانەت بێت ، زیاتر لەوەش نابێت ئەو مەرکەزیەتە ئەوەندە چڕ بکرێتەوە تا ڕادەی دیکتاتۆری سەرۆك خێزان  وەك لە تەوراتو ئینجیل هاتوە(**أما إذا واجهتهن الصعوبات : فليسألن رجالهن في البيت** ) ، بەلکو دەبیٚ ئازادی و (لامرکزی) ببەخشریٚ لە سنوری خۆی ، ئەگینا بە دەیان ئایەت دژ بە زۆرداری هەیە ، بۆیە سەرۆك خێزان چ سەرۆك هەر ئیدارەیەك پێویستە زۆر چاك لە بنەماو مەبەستەکانی ئیسلام گەیشتبێت، ئەگینا لە حوکمی فەرمانەکانیدا بەبەر ئەو ئایەتە دەکەوێت: (ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الظالمون) ئینجا (کافرون).. لە هەموو ئەوانە بۆ ئەوەی خێزانێکی بەختەوەر و بەهاوکار وخۆشەویست پێك بێت، خێزانێك بێت ببێتە لانەو کارگەی بەرهەم هێنانی مرۆڤی دادگەر و بە ویژدان وشارستانی ،تیایدا خزمەتی مرۆڤایەتی وئاشتی وپەیامەکەی بکا ، بەدەیان نمونە لە ئاین و ئایدیۆلۆژیا هەیە، لە نێو

---

[128] هەبوونی  ڤیتۆ بۆ هەریەکە لە (ئەمریکا وڕوسیا وچین وفرنسا وبریتانیا) بە پێی مادەی ٢٧ی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان و نەبوونی  ئەو مافە بۆ وولاتانی تر باش ترین بەلگەی نادادگەریە ، جگە لەوەی هەندیٚ میلەت هەر دەنگی نیە وەك میلەتی کورد و زۆری تر .

[129] وەك خۆشەویست دەفەرموێت: (في الجاهلية اذا قام الشريف عفوا عنه ... والله ان فاطمة بنت محمد لو سرقت لقطعت يدها)

پێغەمبەرەکان ،لەسەروی هەموان (خۆشەویست) کە لەناو خێزانی خۆیدا تاقە یەکجاریش لەیەکتریش توڕە نەبوینە.

**مەودای بەشداری ئافرەت لەژیاندا:**

ئافرەت لەئاینە سەلامەتەکان بە تایبەتی لەئیسلامدا ئادەمیزادێکی تەواوە ، بەپیچەوانی هەندێك داب و نەریتی کۆمەلایەتی و رابۆچوونی کۆن و نوێ، بەنمونە هەندێکیان باس دەکەین : لەشارستانیە کۆنەکانی یۆنان –چین – هند – رۆم – فارس و روس... کەلەمیژوو وچیرۆك و گۆرانیە فۆلکۆری وسەربوردەکانیان دەردەکەوێت ئافرەت تیایاندا بە ئادەمیزاد هەژمار نەکراوە، هەتا لەسەدەی بیستەمیشەوە، چەند سەرنجێکی (قسە نەستەقەکانی ) میللەتان بدەین کە گوزارش لە(تۆمارگەی میژوویەکی سروشتیان دەکا) بەڕوونی ئەو دۆخانە دەردەخا ،وەسفی ئافرەت وا هاتوە: (شەیتانە – نوقستانە – سانەویە – بۆ خزمەتە – پیسە – ئەقلی لەدامێنە – قژی درێژە وئەقلی کورتە- هەتا گومان لەروح لەبەرایەتیان هەبووە هەروەك پێشوو تر باسمان کرد. هەرچی لە ئاینەکانی مسیحی و یهودی ئیستاشیاندا ئافرەت بە ئاشکرا لەکتێبە پیرۆزەکانیان دا بە(ناقص العقل) دەژمێردرین ،بەشێك لە فقهی ئیسلامیش تووشی ئەو دەردە بوە،سەرنج بدە لەبارەی هەلخەلەتاندنەکە ئافرەت بە بەرپرسی یەکەم دادەنرێت هەروەك لەئینجیل هاتوە: **لأَنَّ آدَمَ جُبِلَ أَوَّلاً ثُمَّ حَوَّاءُ، وَآدَمُ لَمْ يُغْوَ لَكِنَّ الْمَرْأَةَ أُغْوِيَتْ فَحَصَلَتْ فِي التَّعَدِّي** [١٣٠] ، لە تەوراتیش بە هەمان شێوە وەك لە(سفر تکوین) لەبەشی سێ یەم هاتوە:(فقال ادم المرأة التي جعلتها متى هيى . اعطى من شجرة فاكلن ١٤ ). لەو کاتیەوە ئافرەت کەوتە بەر سەرزەنشت : وای لە خۆ کرد هەرشەرمەزار بێت وەك لەهەمان ڕەوتی تەوراتی دەلێت: **قول الرب لحواء حين أغوت آدم : قَالَ لِلْمَرْأَةِ: تَكْثِيرا اكَثِّرُ اتْعَابَ حَبَلِكِ. بِالْوَجَعِ تَلِدِينَ أولادا. وَالَى رَجُلِكِ يَكُونُ اشْتِيَاقُكِ <u>وَهُوَ يَسُودُ عَلَيْكِ</u>** [١٣١]، هەر بۆیەش هەلویستیان بەرامبەر ئافرەت بەگشتی بە هۆی هەلوێستی خراپیان بەرامبەر حەوا هاتوە وەك لە تەورات دەلێت:**(امرأة ماكرة، عاصية لأوامر ربها، تنقاد للشيطان المتمثل في صورة الأفعى الحية. وتخدع الرجل آدم، وتغريه بأكل الثمرة،**

---

[١٣٠] ئینجیل ١تیموثاوس ٢ : ١٢ _ ١٤

[١٣١] تەورات- سفر التكوين ٣ : ١٦( ترجمة فاندايك واهاتوە: <u>وَهُوَ يَسُودُ عَلَيْكِ</u>) بەلاَم بە پێی تەرجەمەی - کتاب الحياة : وَهُوَ يَتَسَلَّطُ عَلَيْكِ .

**وعصيان أوامر ربه، فيعصاه)**[132]،هەمان هەلوێستیان بەرامبەر ئەو ئافرەتانەی ناویان لە کتێبی موقەدەس هاتوە وەك: سارا ،هاجەرە ،داك وکچانی لوت پێغمبەر ، رفقەی هاوسەری ئیسحاق ،هەردوو ژنی عیسۆ ،لیئەو رامیلی ژنی یەعقوب وکچەکەشی ..

ئەو راو بۆ چوونەی کتاب المقدس یان بە فراوان تر بلێین ئەو ڕایە چەوتەی لە ئینجیل وتەوراتی ئیستا وکتێبە موقەدەسەکانی تر وتێکەلّ بە نەریتی کۆمەلاّیەتی تیایدا دوو تاوانی ئافرەت دەکەنە بنچینەی مەینەتی مرۆڤ : ١- یەکەم جار هەلخەلەتاوی حەوا بوە هۆی فرێ دانی ئادەم و(پیاو)لە بەهەشت ٢- یەکەم جەنگیش بە هۆی ئافرەت بوو کە لەنێوان دووپیاو (قابیل وهابیل) ڕوویدا ، دەلّێن ئەو تاوان وبێ ئەمەکیەی ئافرەت لەو کاتەیە کە پیاو چاکەی لەگەل کردوەو لە پەراسووی خۆی دروست بوە هەروەك لەتەورات هاتوە :(**فأوقع الرب الإله سباتاًعلى ادم فنام ،فأخذ واحدةً من اضلاعه...فقال ادم : هذه الأن عظم من عظامي ولحم من لحمي ، هذه وتدعى امرأة..**)[133] ،هەرچەندە زانیاریەکان هەلّەن ،بەلاّم بەو هۆیەوە کاری کردۆتە سەر ڕای گشتی کۆمەلگای مەسیحی و کۆمەلگەکانی تری جیهانی و زاناکانیشیان،تەنانەت ئەو ئەدەبیات وگوتارە چەوتە گەیشتۆتە نێو کۆمەلگەی ئیسلامی وبەشێك لە فیقهەکانیشی ،چونکە ڕای گشتی هەتا ئیستاش ئافرەت وەك کائینێکی گوناهبارو سانەوی تابیعی پیاو هەژمار دەکرێت :َلأَنَّ الرَّجُلَ لَمْ يُخْلَقْ مِنْ أَجْلِ الْمَرْأَةِ بَلِ الْمَرْأَةُ مِنْ أَجْلِ الرَّجُلِ [134]... هەروەها :

( وَلَكِنْ لَسْتُ آذَنُ لِلْمَرْأَةِ أَنْ تُعَلِّمَ وَلاَ تَتَسَلَّطَ عَلَى الرَّجُلِ، بَلْ تَكُونُ فِي سُكُوتٍ، لأَنَّ آدَمَ جُبِلَ أَوَّلاً ثُمَّ حَوَّاءُ )[135]،بۆیە بە ڕای ئەوان هەروەك چۆن جاران ڕۆژێ سێ جار لە بەندە(عەبد) دەدرا بۆ ئەوەی بە بیری بێتەوە کە بەندەیە ئاواش دەبێ بە بیر ئافرەت بهێنیەوە کە ئافرەت سوکە هەروەك لەوتەفسیرەی تلمۆدو کتابی موقەدەس لە لایەن (ولیام بارکلی) کراوەو دەلێ: (( إن الله لم يخلق المرأة من رأس الرجل لئلا تتكبر وتتفاخر عليه ، ولا من عينه لئلا تحقد وتحسد ، ولا من يده لئلا تصبح طماعة جشعة ، ولا من قدمه لئلا تصبح مجرد جسم هائم على وجهه ، ولكنه خلقها من ضلع من أضلاعة .

---

[132] سفر تكوين ٣/١-٦

[133] كتاب المقدس –سفر التكوين ٢ /٢١-٢٣

[134] بولس في رسالته الأولى إلى كورنثوس ﴿ ١١ : ٣ _ ٩ ﴾

[135] هەمان ئایەتی سەروو (١٢-١٤).

والضلع دائماً مغطى ، ولذلك فالتواضع ينبغي أن يكون صفتها الأولى ))،ئەوەشە بنچینەی ئەوەی کە ئافرەت لەگەل مێردکردنی لێی بتوێتەوە و وا لە پیاو دەکا دایك وباوکی لە بیر بچێ مادام زادەی پەراسویەکی پیاوە وەك لە تەورات هاتوە:(..لذلك يترك الرجل اباه وأمه ويلتصق بإمرأته ويكونان جسد واحد )[١٣٦] ، ئەوەتا لەهەموو ئەوروپا هەرکە ئافرەت مێردی کرد یەکسەر ناوو ڕەچەلەکی دەتوێتەوە لەناو ڕەچەلەکی مێردەکەی، بۆیە گومان لەڕوح و سەربەخۆییەکەی کراوە ،ئەو تێڕوانینە ڕەگ و ڕیشەی قوولی هەیە ،لە ئینجیل دەلێ نابێ ئافرەت لە نێو کنێسە قسە بکا ،بۆیەش لە دەولەتی ڤاتیکانی ئیستا مێینەی تێدانیە[١٣٧] ، ،هەروەهاش بۆ (شاخی پیرۆزی ئاتۆس)ی یۆنانی[١٣٨] .. (..لأنه من المعيب للمرأة أن تتكلم في الكنيسة) [١٣٩] ، Eph:5:22 ايها النساء اخضعن لرجالكنّ كما للرب) ،ئەوەش هەمان ڕێنمایی ئاینی بوزیە کەدەلێ (وەك خواتان خزمەتی مێردەکانتان بکەن ) ، بە هەمان شێوەش لە شارستانی چینی ئەو ڕێنماییە هاتوە:(دەبێ ژن ئەوەندە بە گوێی مێردەکەی بکات وەك خوا پەرستی )لە فقهی ئیسلامیش ئاماژەیەکی وا هەیە ، لەوەتەی نوسین ماوە بێجگە لەدەقی ئاینەکان ئیدی هەر هەمووی هەلوێستی خراپ بووە، ئەفلاتوون و مدرسەو زاناکانی

---

[١٣٦] ...سفرالتكوين٢/٢٤-٢٥

[١٣٧] ژمارەی دانیشتوانی دەولەتی ڤاتیکان ١٠٠٠ کەسن ،هەر هەمووی پیاون ،تەنها لەوێ زمانی فەرمی لاتینیە .

[١٣٨] ئەو شاخە کەوتۆتە هەرێمی مەکدۆنیای یۆنان لەژێر دەسەلاتی بەتریرکی قوستەنتینی مەسکۆنیە ،تا لەو شاخە پیرۆزە روحانیەت سەلامەت بێت نایەلن ئافرەتی یان هەر مێینەك تەنانەت نایەلن مریشکیشی بچیتێ ، لەدەستوری ١٩٧٥ ی یۆنان دان بەنیمچە سەربەخۆیی ئە شاخە هێنراوە کە حاکمێکی یۆنانی لێ بێت .

[١٣٩] ئینجیلی بولس لە ژێر ناوی **(النظام فى الكنيسة)** هاتوە: : (( لتصمت نساؤكم في الكنائس لأنه ليس مأذوناً لهن في الكلام ، بل أمرن أن يخضعن للطاعة ، هكذا تأمر الشريعة ، فإن أردن أن يتعلمن شيئاً ليسألن رجالهن في المنزل ، لأنه من المعيب للمرأة أن تتكلم في الكنيسة )) (٣٦-١٤)... ملاحظ: والمقصود بعبارة (( كما تأمرالشريعة )) هو ما جاء في تكوين ٣ : ١٦ من ان الرب جعل الرجل متسلطاً على المرأة فقال : " وَقَالَ لِلْمَرْاةِ : تَكْثِيرا اكَثِّرُ اتْعَابَ حَبَلِكِ. بِالْوَجَعِ تَلِدِينَ اوْلادا. وَالَى رَجُلِكِ يَكُونُ اشْتِيَاقُكِ وَهُوَ يَسُودُ عَلَيْكِ

[١٣٩] قاموس الأديان - مادة: بوذية

[١٣٩] قورئان وفەرموودە زۆرن دژ بەو کارە کە لە نێو عەرەب وهەندێ میلەتی دواکەوتەی تر کراوە .

سەردەمیان لەدوعاو (تأملات) و هەلوەستەکانیان بەجوانی هەلومەرجیان بەدیاردەکەوێت، سوکرات دەلێ ئافرەت درەختێکی ژاراویە ، وەکو عەبد وبەربەری پۆلینی کردوون ، لە یۆنانی کۆن پاڕانەوەو سوپاسی خواوەندیان ئەوەبوو (بەخوای چابوو یونانی بووم و بەندە نەبووم . پیاویش بووم ئافرەت نەبووم ) ، ئەدەبیاتی یۆنانی و ئەرستۆو لە کتێبی (رساله فی السیاسه )دەلێ: نوقستانی ئافرەت لە نوقستانی ئەقلی دێت ،بەتێکرایی لە باشترین دۆخیدا ئافرەت وا بینراوە وەك ئامرازێکی (زەوق) و بەس ،سرودێکی چینی هەیە تیایدا بە ئافرەت هەل دەلێ : (ئەی ئافرەت لەتۆ کەمتر نیە.. )، لە بنەچەدا ڕق لە ئافرەت بوون لەو زانیاریە هەڵە دێت کە گوایە یەکەم جار شەیتان (ح حەوا)ی هەلخەلەتاندو واتە ژن هۆکاری سزای پیاوانن وەك لە سەروو باسمان کرد، ئەگەر بە خێرایی سەرنجیش بدەینە قورئان هەموو ئەو ڕاو بۆچوونانەی تێدا بە توندی رەت کردۆتەوە، پرسی ڕووداوەکەی (داری گەنم) ناداتە پال حەواوئافرەتان بەتەنها، بەلکو بۆ هەر دوولا (وَقَاسَمَهُمَا إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ النَّاصِحِينَ .فَدَلاَّهُمَا بِغُرُورٍ.. (الأعراف : ٢١-٢) بۆ سزایەکەش بۆ هەردوو لایانە( (...... الم انهكما) ، بەلاّم ئەو پاکانەی قورئان هەرچەندە زۆر ڕاشکاوانەیە کەم دادی داوە،فقهی ئیسلامی کەوتۆتەوە ژێر کاریگەری نەریتی عەرەبی دواکەوتەو ئەدەبیاتی بیانی تر کەلە سەروو باس کرا ،بۆیە پایەی ئافرەت لە قورئان ولە فقهدا زۆر لێك جیایە،بەو شێوەیەکۆمەلگەی ئیسلامیش بە خێرایی کەوتەوە ژێر ئەو وەسفە چەوتانەی بۆ ئافرەت کراوە .

لەچاخەکانی ناوەڕاستیش باری ئافرەت ئەوەندە نزم بوو کارگەیشتبووە ئەو ڕادە ئافرەتانیان زیندە بەچال دەکرد وەك نەریتێکی مەردانەو ماقوولانە[١٤٠]، سیستەمی ئەو سەردەمیش پاساوی بۆ دەکرد ،لە نێو هندیش ئافرەتی مەرد ئەوەبوو لەگەل سوتانی مێردەکەی لە کاتی مردنی خۆ بخاتە نێو ئاگرەکەو ئەویش بسوتێ ، ئەگینا خۆی خانەوادەکەی بە سەر شۆڕی دەمانەوە ، ئیبن بەتوتو بە چاوی خۆی سوتانی ئافرەتی ئاوای بینیوە کە لەگەل مردنی مێردی ئافرەتەکەش سوتاوە[١٤١].

---

[١٤٠] قورئان وفەرمودە زۆرن دژ بەو کارە کە لە نێو عەرەب وهەندێ میلەتی دواکەوتەی تر کراوە .

[١٤١] بڕوانە رحلة ابن بطوطة المسماه تحفة النظار في غرائب الأمصار وعجائب الأسفار دەقەکەی لە ل٢٠٦ بەو شێوە هاتوە : رأيت الناس يهرعون من عسكرنا، ومعهم بعض أصحابنا. فسألته ما الخبر ؟ فأخبروني أن كافرا من الهنود مات، وأججت النار لحرقه، وامرأته تحرق نفسها معه. ولما احترقا جاء أصحابي وأخبروا أنها عانقت الميت حتى احترقت معه. وبعد ذلك كنت في تلك

ئیستاش ئافرەت لەگەل گۆرانکاریەکانی تێکرایی لایەنەکانی کۆمەل باری مرۆڤایەتی چاکتر بوە ،بەلام یەکجار دوورە لەدادگەری ،یان نەگەیشتوتە عەیار یان لیٚ ی ڕەت بووە، دیارە (الزائد کالناقص)، ئافرەت سانەوی نیە وەك رای زۆربەی شارستانیەکۆن ونوێیەکان وکنێسە و (شوبنهاوەر) و(نیتچە)و..هاوبیرانی ئێستای دەیلێنەوە ،هەر بەنمونە "نجیب الریحاني" دەلّیٚ : ئافرەت ئەوەندە گرنگ نیە، ژیان بیٚ ئافرەتیش دەبیٚت بەبەلگەی ئەوە ئادەم هەبوو بیٚ ئەوەی ژن پەیدا بیٚت ،لەسەر هەمان تراز وتوند تر فەیلەسوف(فینینجر)لە (الجنس والشخصیە)دەلّیٚت: پەیوەندیەکی توند لە نیٚوان کەسایەتی ونەژادی هەیە ،سیفاتی پیاو بریتیە لە رەوشت وبیرو هۆشی چاك دەتوانیٚ داهێنان بکا ،بەلاّم کاتیٚ لەگەل سیفاتی ئافرەت تێکەل دەبیٚ ئەو داهێنانەی پەکی دەکەویٚ ،ئەو مەینەتی مرۆڤایەتیش لە پەیوەندی نیٚوان ژن وپیاو دەبینی[١٤٢] . بەو شێوەیە ئەوانە پیاو بە ئەسل هەژمار دەکەن،ئەوەش ئەسلی ئاینی هەیە هەروەك لە پەیامەکەی بولس بۆ کورنثوس ﴿ ١١ : ٣ _ ٩ ﴾ دەردەکەویٚ: " وَلَكِنْ أُرِيدُ أَنْ تَعْلَمُوا أَنَّ رَأْسَ كُلِّ رَجُلٍ هُوَ الْمَسِيحُ. وَأَمَّا رَأْسُ الْمَرْأَةِ فَهُوَ الرَّجُلُ. وَرَأْسُ الْمَسِيحِ هُوَ اللهُ "[١٤٣]،لەسەر ئەو بنچینەیە "صمیلز" دەلّیٚت:المرأة قلب الإنسانية . . والرجل هو الرأس . .

**بەڕوونی ئەو هەلویستە لە فقهی ئیسلامی دەردەکەویٚ زۆربەی ڕێنماییەکانی ڕوو لە پیاوە ،بۆیە هەندێك زیاتر لەوە ڕەخنە دەگرن ودەلێن فقهی ئیسلامی فقهێکی زکوریەو پیاو بە ئەسل هەژمار دەکا .**

---

البلاد أرى المرأة من كفار الهنود متزينة راكبة، والناس يتبعونها من مسلم وكافر، والأطبال والأبواق بين يديها، ومعها البراهمة، وهم كبراء الهنود. وإذا كان ذلك ببلاد السلطان استأذنوا السلطان في إحراقها فيؤذن لهم فيحرقونها. ثم اتفق بعد مدة أني كنت بمدينة أكثر سكانها الكفار تعرف بأبجري ، وأميرها مسلم من سامرة السند، وعلى مقربة منها الكفار العصاة، فقطعوا الطريق يوما، وخرج الأمير المسلم لقتالهم، وخرجت معه رعية من المسلمين والكفار، ووقع بينهم قتال شديد، مات فيه من رعية الكفار سبعة نفر - وكان لثلاثة منهم ثلاث زوجات، فاتفقن على إحراق أنفسهن. وإحراق المرأة بعد زوجها عندهم أمر مندوب إليه غير واجب لكن من أحقرت نفسها بعد زوجها أحرز أهل بيتها شرفا بذلك، ونسبوا إلى الوفاء، ومن لم تحرق نفسها، لبست خشن الثياب، وأقامت عند أهلها بائسة ممتهنة لعدم وفائه

[١٤٢] بە هۆی ئەو تێڕوانینەی دژی نەژادی یەهودیش بوو .

[١٤٣] لەوەوە کاری کردۆتە سەر ئەدەبیاتیان بڕوانەلە کتێبی (الدسقولية —الباب الثانی) وا وەسفی ڕۆلی ئافرەت کراوە : رأس المرأة هو زوجها،ورأس الرجل هو المسيح ،وراس المسيح هو الله ابوه ..لذلك على النساء ان يخضعن لأزواجهن .

لەلایەکی ترەوە بەشێکیش ئافرەت بەئەسل هەژمار دەکەن وەك:(لستروود) و(د .نوال —لە کتێبی :انثی هی الأصل) و زۆری تری لەوانەی دەوری نێر کەم دەکەنەوە[١٤٤] ،نەئەوە ڕاستە نە پیاویش ئەسلە هەروەك لە ئینجیل و تەورات وشارستانیە کۆنەکان و نەریت و ئەو ڕایانەی سەروو هاتون ، بەلکو تەواوکەری یەکترین .

ئەویۆچوونە دژ بە یەکانە هەمووی (خلط الاوارق)ە و لە عەیار لادانە ، لەهەموو بارێکی دا دەردی سەرباری ئافرەت زیاتر دەکات،نوێیەکەی بریتیە لەبەکار هێنانی ئافرەت وەك کالا بۆ پەیداکردنی مال و بازرگانی، کە لە کۆتایدا بەرەو (سوزانیەتی) یەکجاریان دەبا .

ئەو هەلوو مەرجەی ئیستا لە ئەوروپاو ولاتانی عەلمانی جیهانی ئیسلامیدا گوایە ئافرەت سەربەست کراوە ، لەراستیدا سەرخۆش و مەست کراوە بە ئاهەنگی برجوازیانەوە، خنکاوە لەو پەیوەندی یە مادی و بارزگانیدا کە بینای مرۆڤایەتیەکەی تێك ڕوو خێنراوە، وای لێکراوە دەورێکی وای لەکۆمەل نەبێت، بەشداریەکی کەمیشی لەژیانی نوێ نەبیت، بۆیە کەمتر زانایان لێ پەیدا بووە، داهێنەرێکیان نیە، موفەکرێکیان نیە ...، هەتا لایەنگری هەرەسەربەستی ئافرەتان لەوانە (فرۆید) هێرشی کردۆتە سەر هونەری ئیستاو دەلێت (هونەری نوێ کار بۆ وروژاندنی ئارەزوو بازی دەکاو هەتا بەشی زۆریان بەرەو بەدرەوشتی تەواو پال دەنێ )[١٤٥] .

ئەو تێڕوانینە چەوت و تێك چرژاوانەی سەروو لەگەل هاتنی ئیسلام ژێراو ژوور کرا،ئافرەت ئادەمیزادێکی تەواوە (النساء شقائق الرجال) ،هەموو هاوبەشیەکی مرۆڤانەیان پێکەوە هەیە ،تەنیا ئەوەیە هەریەکە بە پێی پسپۆریەکەی فەرمان و ئەرکیان جیایە ،لە مادەی یەکەمی (ڕێکەوتنامەی سیداو) زیاد لە پێویست داکۆکی لە بەشداری ئافرەت بەهاوتایی(تماثل)لەگەل مرۆڤ دەکا ،بۆ ئەو مەبەستەش داکۆکی لە هاوتایی ژن وپیاو دەکا کە ئەستەمە،لەکۆمەلگەئاینیەکان و ئیسلام بە تایبەتی بۆیەکەم جار ئافرەتان بەشدار بوون لەژیانی کۆمەلایەتی و سیاسی و فکری ، وە پڕیەتی لەنمونەی واقعی کە ئافرەت بەشدارە لەژیانی سیاسی و هەتا ڕێبەرایەتیش، ئەوەتا لەقورئانی پیرۆز

---

[١٤٤] – بەرای کنیسە کە لە کتاب المقدس وەرگیراوە لەپەراسوی چەپی پیاو دەرچووە بەو شیوەیە (**الذكر هو اصل**) لەکاتیکا (د . نوال ) کتابیکی هەیە بەناوی (**الانثى هي الاصل**) هەردوولا لە عەیار ڕەت دانە .

[١٤٥] – نظرية الجنسية ص ١٠٧

دەفەرمووی (والمؤمنين والمؤمنات بعضهم اولياء بعض..)[١٤٦] ،ئافرەتانیش بەشداری سیاسیان کردووە (بەیعەتی سیاسی وفکریان داوە بە پیغمبەر)- بەیعەتی دوەم بەیعەتی سیاسی بوو،یەکەم موسولمان ئافرەت بووینە ،یەکەم شەهیدیش لەوان بوە ،دوو سورەتیش بەناوی ئافرەتانە وعەرشی بلقیس لە قورئان بە (عظيم)هاتوە،بەهەشت لەژێر پێی ئافرەتانە، عایشە (١٢٠٠) قوتابی هەبووە، لە هەردوو (هیجرە بۆ مەدینەو حەبەشە ئافرەت لەگەل بوە ،بە بۆنەی بیعەی یەکەم ودوەمیش لەقورئان هاتوە: ( يا أيها النبى إذا جاءك المؤمنات يبايعنك على أن لا يشركن بالله شيئا ولا يسرقن ولا يزنين ولا يقتلن أولادهن ولا يأتين ببهتان يفترينه بين أيديهن وأرجلهن ولا يعصينك في معروف فبايعهن واستغفر لهن الله، إن الله غفور رحيم) .لە ئەنجومەنی ڕاوێژی پێغمبەر (دخ) بووینە ،ئوم سەلمە نەخشەی چارەسەری ئەو کێشەیەی کرد کە بە هۆی ئاشتینامەی حودەیبە سەری هەڵداو فەرمانی پێغمبەر جیٚ بەجیٚ نەکرا ، ئوم سەلمە ووتی بڕۆ خۆت بیکە بەدوای خۆت هەمو جیٚ بە جێی دەکەن ،کرا، دوایش ح عمرسەرۆکی (حسبەو بازاری ئافرەت بوو بەناوی شیفا[١٤٧] ، هەریەکە لە ابن حزم وامام حنيفة وطبرى وحسن البصرى وابن الحجر .. پێیان وایە نەك دەشیٚ یان ناشیٚ بەلکو دەبیٚ ئافرەت بەشداری سیاسەت بکا،لە ئیبن جوزیەوە :کان عمريشاور النساء-نمونە پرسەکەی بە حەفسە)، پیغمبەریش ڕاوێژی بە ئافرەت کردوە ،بە پێی ابن حزم ابن طبرى ئافرەت بۆی هەیە ببتە قازی ، ابن حزم پێی بەرەواژی نیە ئەگەر پێغمبرانیش لە ئافرەت هاتبێت،ئەوانە بوێریان بە د حسن تورابی دا کەبەشداریەکی فراوان بە ئافرەت بکا لە دەسەڵاتی سودان تا ئەو ڕادەیە دەیوت :لاریمان نیە ئەگەر مەسیحیەکی ئافرەت لەسەر دەسەڵات بێت، تەنها مەرجمان دادگەریەتی . هەندیٚ لای تریش لەزانایانی ئیسلام بە پێچەوانەی ئەوانە مەرجی ئیمام وخەلیفە بە (ذکوری) دەبینی ،سیستەمی دەسەڵاتی ئوردەن بە بۆچونی خۆی پشتی بەوانە بەستوەو لە مادەی ٢٨ی دەستوری ئوردەن پشتاوپشتی دەسەڵاتی داوەتە (ذکوريةکانی)مەلیك وئافرەتی بیٚ بەش کردوە.

بۆیەکەم جار کتێب ونوسین بۆ مافی ئافرەت لە لای بیریارە ئیسلامیەکان هاتوە، یەکەم جار ئیبن روشد ووتی پێش کەوتنی هەر کۆمەڵگەیەك بە پێش کەوتنی ئافرەتانیان دەپیوریٚ ،بەڵام ڕۆژئاواییەکان لەگەل ڕایەکەی (فۆریٚ)گرێی دەدەن ودەڵێن هەردووك وا دەڵێن

---

[١٤٦] التوبة -٧١

[١٤٧] بە پێی ابن الحزم وابن اسير ناوی تەواوی (لەیلای کچی عبداللی قورەیشی ئەلعەدەویە-بنت العدويه)

،لەکاتێکا ئیبن روشد (١١٢٦-١١٩٨)شەش سەدە لە پێش فۆرێ بوە ،ئەو کاتی کە ئیبن روشد وکتێبە فقهیەکان دەردەچوو لە قازانجی ئافرەت لە ئەوروپا خوێندنی ئینجیلیان لێ قەدەغە دەکرابە پێی بڕیارێ پەرلەمانی ، بە پێی یاساش فرۆشتنیان هەرزان کرابوو بۆ (٦)ئۆنسە .. بەشداری ئافرەت لە ژیانی کۆمەلگە بەرجەستە کرابوو بەهەمو مانایەکەوە ،بە ڕاستی ئەو نیوە کۆمەلگەیەش لەتابیعی وسانەوی هاتبوونە شوێنی سروشتی خۆیان ئەرکی شارستانی وگەردوونی خۆیان دەبینی .

هەتا زاناو توێژەرەوەکانیش لە میژووناسان دان بەوە دەنێن کە هەردەمێك دادپەروەری لە میژوودا کە لەسەر دەستی (پێغمبەرەکان د خ ) دەهات ئافرەت هەل و مەرجیان باش دەبوو ، سەرەنج بدە رای (ویل دیورانت ) کە لە کتابی بەناوبانگی (قصة الحضارة) دەلێت :(لەسەردەمی زەردەشتیەکان ئافرەت لەوولاتی فارسەکان پایە بەرز بوو ... دوای کەوت)، بە پێی (ئنسیکلۆبیدیای بەریتانی) سەروەری ئافرەتی کورد زیاتر لە میلەتانی تر بۆ ئەو ئاینە دەگەڕێتەوە ، ئەگەر بەووردی سەرنج بدەینە ( الكتاب المقدس) هەندێ ئایەت روحی دەستکاری کراوی لێ نابینرێ ئەوا دادگەری تێدایە وەك لەو ئایەتەی خوارەوە لە بارەی ئافرەت داوای هاوتایی و(شقائق)دەکا وەك ئیسلام : وَقَالَ الرَّبُّ الإِلهُ: «لَيْسَ جَيِّدًا أَنْ يَكُونَ آدَمُ وَحْدَهُ، فَأَصْنَعَ لَهُ مُعِينًا نَظِيرَهُ»[١٤٨] ، هەروەها داوای مافی ئافرەتی کردوە( فعرف يسوع وقال لهم : " لماذا تزعجون هذه المرأة ؟ فهي عملت لي عملا صالحا )[١٤٩] ، هەروەها " **ما أعظم إيمانك " يا امرأة ! فليكن لك ما تريدين**[١٥٠] ، **وأحضرها إلى آدم. ودعا آدم اسم امرأته حواء، لأنها أم كل حي**[١٥١]. هەروەها لە زۆربەی ئاینەکانی ڕۆژهەلاتو شارستانیەکان ناوی (حەوا) بە ڕێزەوە بە گوزارشی جیاجی بەو شێوەی خوارەوە هاتوە: (الأم الكبرى، إنانا، عشتار، عشتروت، فينوس، إيزيس أو الأم الإلهية، ، سيدة الحكمة، سيدة النواميس الإلهية، ، نور العالم، نور السماء، نجمة الصباح..، ستناي- لەناوەبەناوبانگەکانی شەرکەسی واللات والعزى ومناة، خوایە گەورەکانی

---

[١٤٨] الكتاب المقدس –سفر تكوين ٢: ١٨.

[١٤٩] ئینجیلی مرقس ١٤-٦

[١٥٠] ئینجیل **متّى** ١٥ – ٢٢ .

[١٥١] سفرتكوين ٢/٢١و٢٢و٣/٢٠.

عەرەب لە پێش ئیسلام [١٥٢] ، تەنانەت لە ئەدەبیاتی یۆنانیش لەسەر زاری سوکرات بەدی دەکرێو دەڵێ: المرأة أحلى هدية قدمها الله الى الإنسان ، "بلزاك"یش دەڵێ:(المرأة . . مخلوق بين الملائكة والبشر) هەروەها لە شوێنێکی تر دەڵێت:( **الرجل صنيعة أمة ،والبيوت بلا أمهات صالحات قبور).**

لەسەرەتایی سەرهەلدانی ئیسلام وەکو ئیمرۆی ئیسلامی دیسان ئافرەت پیشرەو بوون ،بوونە هۆی ڕاکێشانی بنەمالەو خێزانەکانیان، لەوانە (شەیما) خوشکی عمری کوری ختاب ،( خەولە ) و..ئی دی ئافرەتان بووژانەوە لەناو هەموو میللەتانی ئیسلام ،بە پیچەوانەی رای ئەو سەردەم و سەردەمی ئیستاش کە بە ئافرەتانیان شەرم بوو، لەو کاتە ئافرەت لە کۆنگرەی گەورەی ئیسلامی هەلدەستێتەوە ڕەخنە لە ح عمر دەگرێت و ئەویش دەلێ :من هەلەم وئافرەتەکە ڕاست دەکا،ئافرەت لەسەردەمی پەیرەو کردنی ئاینی ئیسلام زۆر گەشایەوە ،لە کتێبێك بەناوی (صفحات خيرات من حيات السابقات) ٣٥٠ ئافرەتی ناوداری هەلبژاردوە ، ئەو نیوە کۆمەلگە پەکخراوە هاتونە گۆڕەپان لە بوارە جیاجیاکان چالاکی تەواویان بەو شێوەی خوارەوە نواندوە :

١- لە بواری بازرگاتی :ناوی حبيبه العدويه،خنساوبن خزام ،نقيش بن سالم ،سلمى البصريه ،سويه اليمنيه و زۆری تر دەرکەوتوە .
٢- لە بواری سیاسی وکارە گشتیەکان : فاتیمەی زەهرە ،زەینەب،اسما بنت عميس،اسما بنت ابى بكر،سكينه بنت حسين ، ...
٣- لە بواری زانست :حفصه،عائشه،ئوم دردا، ..زۆری تر .
٤- لە بواری ئاینی ودادگەری :جويريه بنت حارس،عفيره العابد،رابعه العدويه،امنه بنت يعلى ..،
٥- لە ڕاستگۆیی وخۆ نەویستی : ئوم وەرەقە ،ئوم دەردا ،ئوم عەلی ،جاريه حسن بن صالح،...
٦- لە بواری لیکدانەوەو شێ کردنەوە :ئوم ئەیمن،ئوم شريك،حفصه بنت سيرين ،ئوم المراعيه ،
٧- لە ژیری ووەسفا :فاتیمە ،سەفیە،ئوم سەلیم،منفوسه بنت زيد،معاذة العدوية ،جاريه بنى موئمل ..
٨- خێر خوازی:سودە،عائیشە،زينب بنت جحش،زبيره ،..

[١٥٢] أساطير آرام – الدكتور وديع بشور / لغز عشتار.

٩- زانای زۆر گەورەشیان لێ هەلکەوت لەوانە:زینب بنت ابی سلمه ،حفصه بنت سیرین،امه الواحد بنت الحسین،نفیسه ابنه ابی محمد الحسن بن زید،ئوم احمد الأنصاری ،ئوم عیسی ،....لەو ڕۆژەوە لە هەموان زیاتر لە زاناو موفوسیرو گوتاربێژو زمان ناس و فەلەکناس وفەقیهو ئازاو بوێر بەرامبەر دەسەلاّتدارو خوارو خێچیەکانیان .

هەروەها کۆمەلێکی زۆری ئافرەتانی کوردی ناودار پەیدا بوو لەوانە : زانای بە ناو بانگ شەهدە ی دینۆری ،امه الله ابی العلا الشهاب الکردی (لەسەدەی ٩ی ه زانا بوو) ،خاتوو زەیفە (١١٨٥-١٢٤٢م خاوەنی حەلەب بوو جوان ترین سەرۆکایەتی شامی کرد ،زانکۆیەکی بەناوی فردۆس کردەوە )، عەزرای کچی نور الدولەی ئەیوبی — ئەو کۆلیجی عەزراویەی لە دیمەشق دروست کرد ،خێر خوازی بە ناوبانگ ست شامی کچی ئەیوبی شادی،ربیعەی کچی ئەیوب ،زەهرەی کچی مەلیك عادل ،دایکی محمد یوسفی هەکاری .. تا دەگاتە شاعیرو ناودارانی تری وەك مەستورە خانمی کوردستانی،سیرا خانمی دیاربەکری حەیران خانمی ناخچەوانی[١٥٣]، ئینجا سیاسی وفەرماندەو پلان دانەرو شای گەورەی وەك خانزاد وزەیفە خاتون وسەیدە شیرین وخاتو شانازو شاخاتون وحەفسە خانی نەقیب و عادیلە خاتون ومینا خانم وناهدەو ڕەوشەن بدر خان وگەزیدە خان .. ..بە هەزارانی تر لەو نمونانە ، نەك لە کوردستان زۆربەی هەرە زۆری خویندنگاو کۆلیجەکانی شام لە سەر دەستی ئەو ئافرەتە کوردانە دروست کراون، زانایە هەرە بەرزەکان لەوێ دروست بووینە ، تیایدا ئافرەتی زاناو موفەسیرو موحەدیس و فەلەکناس و پزیشك و... لێ دەرچوە،لەو بەرهەمانەی کە ماون کتێبێکی مەزنی (عایشە تەیموریە ١٨٤٠-١٩٠٢ )بە ناوی (مرآةً التأمل فی الأمور)لە سالی ١٨٩٣ چاپ کراوە، شکۆفەشی هەبوو،بە ڕای (مینۆرسکی) کورد لەنەتەوەکانی جیهانی ئیسلامی ڕەوشەنبیر ولە پێش تر بووینە ،واسیلی نیکیتین لەسەر زاری (سۆن)دەگێڕتەوەو دەلێ: ئافرەتانی کورد دەسەلاّتێکی زۆریان هەبوە ئەگەر مێردیان لە مالەوە نەبوایە خۆیان خاوەن مال بووینە بۆ مێوان ڕاگرتن وپیاوەتی ،زۆر بەدەگمەن بێ حەیایی لە نێو ژنی کوردا نەبوە[١٥٤] ،چەندین دەسەلاّتدارو سەرۆك عەشیرەت ومەلاژنی گەورەیان لێ

[١٥٣] بۆ زیاتر ؛بڕوانە ئەو سەرچاوانە :١- معجم اعلام الکورد ٢- د ابراهیم طاهر — المرأه الکردیه ودورها فی المجتمع الکردی ٣- صفحات خیرات من حیاه السابقات —جمع وتصنیف ندیر محمد مکتبی ٤- هەروەها بڕوانە: مشاهیر الکورد ،اعلام النبلا ،روض المناضر ..

[١٥٤] واسیلی نیکیتین-کوردو کوردستان ل٣٠٠-٣١٣

هەڵکەوتوە،مینۆرسکی دەڵێ ئافرەتێکم بینی تەمەنی ٢٢ساڵی بوو لە عەشیرەتی میلان بوو ڕیش سپی وکێخواو گەداو هەمولایەك پابەندیان بە فەرمانەکانی دەکرد،هەردولاشیان دەڵێن ئافرەتی کورد هەرگیز لە ماڵ نەبەستراوەتەوە بەڵکو بەمانای سەربەستی بوە ،زۆر جاریش مندال بەناوی دایکی هەڵدەدریێ[155] ، هەمو ئەو وەسفانە لەگەڵ ئەو بەڵگەنامەبریتانیە یەك دەگرێتەوە کە وەسفی ئافرەتی کورد زۆر بە پێشکەوتو لە میلەتانی دەورو بەر دەکا[156] .

هەمو ئەوەش لە کاتێکابوە کە لە شارستانیەکانی ترو لەئاینی یەهودی ومسیحی وتاوی و بوزی و ..قەدەغە بوە ئافرەت نوقەی لێوە بێت ، تەنها بۆی هەبوە گوێ ڕابگرێ (( ولتصمت النساء في الجماعات ، شأنها في جميع كنائس القديسين ، فإنه لا يؤذن لهن بالتكلم . وعليهن أن يخضعن كما تقول الشريعة أيضاً فإن رغبن في تعلم شيء ، فليسألن أزواجهن في البيت ، لأنه من غير اللائق للمرأة أن تتكلم في الجماعة ٣٦-١٤))[157].

---

[155] هەمان سەرچاوە ل٣٠٦-٣١١

[156] ١٤\ اذار \ ١٩٣١ *CO 730/ 161/2*

ان الكرد ليس عربا وهذه حقيقة ثابتة . ليس هناك شك بكون الكرد مسلمين ولكن اسلامهم يختلف عن اسلام العرب. فالعرب بصورة عامة ، خاصة الشيعة متعصبون ولكن الكرد غير متعصبين. للكرد تطلعات الى الحرية التي تتوق اليها الاوروبيون. ولتأكيد هذا اسرد الحقائق التالية:

أ) يعطي الكرد اكثر من العرب الحقوق النساء

ب) لاتلبس المرأة النقاب التي تلبسها المرأة العربية وتختلط بحرية بالرجال

ت) ترقص المرأة الكردية بحرية مع الرجال

ث) حتى في المجالس الخاصة كانت النساء يرأسن الاجتماعات ولنا في زوجة الشيخ قادر نموذج حي.

ج) تستضيف المرأة الكردية ضيفها حتى في غياب زوجها.

[157]: لە شوێنێکی تر کەمێك بەجیاوازی تر هاتوە (( لتصمت نساؤكم في الكنائس لأنه ليس مأذوناً لهن في الكلام ، بل أمرن أن يخضعن للطاعة ، هكذا تأمر الشريعة ، فإن أردن أن يتعلمن شيئاً ليسألن رجالهن في المنزل ، لأنه من المعيب للمرأة أن تتكلم في الكنيسة )) (٣٦-١٤) دەقە ئینگلیزیەکەشی کەمێك جیاوازی لەگەڵ هەردوو لاهەیە:

Corinthians 14:34-35-36: "…women should remain silent in the churches. They are not allowed to speak, but must be

کەواتە پەیامی دایکایەتی بۆ ئافرەت وەك ئەرکی بنچینەیی بەمانا سایکۆلوجیەکەشیەوە مانای ئەوە نیە هیچ رۆلێکی لەبەرهەم و ژیانی سیاسی و چالاکی فکری و ئیداری و فەرمانرەوایی و دیبلۆ ماسی ... نەکات ، ،وایان زانیوە ئافرەت توانای عەقلیان بیٚ هیزترە وەك فرۆید و کنێسە و بەشێك لە فقهی ئیسلامی وکۆمەلێك لەزانایانی تر وای بۆ چوون، بەڵکو ئافرەتیش وەك پیاوە بەهەمان ئەندازەو زەمینە و ئیمکانیەتی عەقلیان پی بەخشراوە، جا هەل و مەرج و ئاستی ئەو کەسە چۆنیەتی ئەقلی دیاری دەکا،نەك قەبارەو سەنگی مێشك ، ئەوانە زیاتر لە ڕوانگەیەکی سەقەتی جنسیەوە سەیری ئافرەت دەکەن، وای دەبینن ئافرەت تەنها ئامرازێکە لە پێناو پیاو دروست بوە ، بۆ ئاهەنگ وچاوچنۆکی وڕابواردن و نێچیریایەتی ،دەبیٚ ئافرەت خۆی لەو تەوقە ڕزگار بکا ،لە بری ئەوەی  توانای عەقلتان بەفیرۆ بدەن کە تەعمیری زەوی وبەرپا کردنی شارستانی دادگەریە ،دەبیٚ ئەو ئەقل وتوانایە لە فێر بوون و توێژینەوە بتەقینەوە ئایەتی (..ان اکرمکم عنداللە اتقاکم)پیادە بکەن، هەربۆیەش ئیمرۆ جیگەی سەرسورمان نیە کە دەبینین بەشی زۆر ئافرەتان ڕێگەی خۆیان دۆزیتەوە،وا ڕابوینە بۆ بەکارخستنی فکریان لەبەشداری سیاسی – ئەخلاقیانە دوور لە میکافیلی و پراگماتیکی ولیبرالی . ئیمرۆ ئافرەت لەم بزوتنەوانەدا رۆلێکی بنچینەیی هەیە ،وەك پرۆسەیەکی پێش چاو ،کە دەبێت ببتە بنچینە بۆ قوول بوونەوە لەزانست و داهێنان و بەشداری تەواوی ژیان، بە پێچەوانەی کۆڕو کۆمەلو ئەلقەکانی تر کە ئافرەتی بۆ بەکار هێنانی مەرامی چەپەلی ئارەزووی بازی  بەکاردەهێنیٚ لەژێر  پەردەی ڕازاوەو بریقەردای :مافی ئافرەتان، یەکیتیەکانی ئافرەتان ،ناوەندو سەنتەرەکانی ئافرەتان .... هتد،بە داخەوە بەشێك لەو ئافرەتانەش لەو نیازە شاردراوەی ئەو جۆرە پیاوانە ناگەن، بۆیە تێکەل بوونی بیٚ ڕادەی ئافرەتان لەگەل پیاوان بەناوی جوراو جۆری وەك : پێش کەوتن و سەربەستی ویەکسانی و مەدەنیەت .. لەرووی زاتی و مەوزوعی زەرەریەتی، جاری هەربەگشتی  هەموو تێکەل بوونێکی بی ڕێکخستن لەنێوان بە هیزو بیٚ هیز ،ساردو گەرم ،چاك وخراپ ،پارێزراو نەپارێزراو ...زەرەری نرخدارەکەیە

---

submission, as the Law says, If they want to inquire about

“something, they should ask their own husbands at home

”.church for it is disgraceful for a woman to speak in the

، هەر بەنمونە هەژارو دەولەمەند لەناو یەك كیانی سیاسی عەلمانی ئەوا هەژارەكە لە دوا پروسەی دا زەرەریەتی، بێ ئەوەی لەئەنجامی هەندێ خسوسیاتی ئافرەت بەتایبەتی سەروەری نرخەكەی كە لە پیاو زیاترە زەرەری پی دەگات ، وەك تەنێكی ووزەدار تێكەڵ بە تەنێكی كەم ووزە بكرێت ئایا ووزەی تەنی یەكەمیش نزم نابێتو لەئەنجاما نرخێكی سروشتی دۆڕا ، بۆیە لەتێكەل بونی بێ سنور دەبێت ئافرەتانی پیشرەو خۆ بپارێزن وەك دوای دێینەسەر یەكێ لەو ئیجرائەتانە كە گرنگترینیانە ئەویش خۆ داپۆشینە .

**ئایا ئافرەت لەكام لازیاتر گەشەدەكات ؟ لە عەلمانی یان ئاینی**

ئەوپرسیارە ووردەكاری زیاتر دەوێت ،ئەگەر بەراورد بێت لە نێوان وولاتانی ئیستای جهانی ئیسلامی ورۆژئاوا ئەوا هیچ گومانی نیە لە ڕۆژئاوا بارو دۆخی ئافرەت باشترە ،ئەگەر بچینە مێژووی فقهی ئیسلامی دیسان لەو ڕووەوە جێی شانازی نیەو كەم تر گرنگی بە ئافرەت دراوە وبە سانایی هەست بە فقهی ئیسلامی دەكرێ كە فقهێكی (نیرینەیە-ذكورية) ،ئەگەر بەراورد بێت لەگەل ئەزمونی ئەفغانستان و چیچان وناوچەی بیارەو هەلەبجە ئەوا دیسان نمونەی سەركەوتوی نیە ،بەلاّم ئەگەر بەراوردی شارستانیەكان بە شارستانی ئاینی ڕاستەقینە بووبێ ،یان بەراوردی نێوان نەفامی وئیسلامی سەردەمی پێغمبەر(د خ)و خەلیفەكانی دوای ئەو بێت ،یان بەراورد لە نێوان سیستەمی سیاسی عەلمانی وناشیۆنالیزمی جهانی ئیسلامی لەلایەك وئەزمونی وولاتانی توركیای سەردەمی دادوگەشە وتورابی سودان وئێرانی دوای ١٩٧٩ جێی شانازیە،لەوانە ئافرەت لە ئاینی زیاتر بواری گەشەی لەبەردەم دایە نەك لە عەلمانی .

ئەوەی ڕێگرە لە پیشكەوتنی ئافرەت لە جیهانی ئیسلام لە چوارچێوەی ئەو پرسیارەی سەروو بەشێك لە فقهی ئیسلامیە ،كە ئافرەت بە زەعیفەوناقس عەقل وسەفیهو فتنەودۆزەخی ..وەسف دەكەن،ڕاستیەكەی وانیە ،نەزەعیفەیە نە ناقسی عەقلە و نەسەفیهیشە ،ئافرەت فتنە نیە بۆ پیاو بەلكو ئەوەئارەزووبازی هەندێ پیاوە فتنەیەبۆ خۆی ،هەلەكە لەوە دێت ئافرەت بۆ پیاو دروست نەكراوە ،بەلكو هەردوولا دروست كراون بۆ بەرپا كردنی شارستانی لەسەر زەوی ، دەتوانین هەمو بۆچوونە ئیسلامیەكان لە چوارچێوەی ئەو ئایەتە ساغ بكەینەوە ،ئەوانەی پێیان وایە كە خوای گەورە دەفەرموێ **(انی جاعل فی الأرض خليفة)** مەبەستی تەنها پیاوە لە پیاوەكانیش چینێك دەگرێتەوە

،( ئیخوان سەفا) پێیان وایە تەنها پادشاو سەرۆکەکان خەلیفەی خوان[158]،ئەو ڕایە زۆر باوەو فقهی لەسەر بنیات نراوە ،بەشی دوەم ئایا ئافرەتیش دەگرێتەوە واتە هەمو مرۆڤ خەلیفەن،لەڕای یەکەما ئافرەت ونیوەی کۆمەلگە پەك دەخا لەمەبەستی هاتنی مرۆڤ بۆسەر ئەو زەویەو ئافرەت لەچوارچیوەی خیزان ومالەوە زیندانی دەکا،تەنانەت زۆربەی پیاوانیش پەك دەخا ،ڕای دوەمیش کەپێی وایە ئەو ئایەتە ژن وپیاو دەگرێتەوە ،ئەوە ئاسۆیەکی نویێ بۆ ئافرەت دەکاتەوە ومەودای بەشداری ئافرەت تەواوی ژیان دەگرێتەوە ودابەشی ئەرك ومافیش لەچوارچێوەی تواناو پسپۆری دەبێت .

**پۆشاك (حیجاب)**

لە پێش تر باسی زێدە بایی نرخی ئافرەتمان کرد ،دیارە خۆداپۆشین دەقاودەق پاراستنی ئەو نرخەیە ، ئەوەش بەلای مدرسەکانی فرۆیدو هەندێ ڕێچکەی نوێ ی دەروون ناسی وهەندێ لایەن و نووسەرانی خۆشمان بە بەندکردن و ناشیرین کرن و چەوساندنوەی و بە نوقستانی کردن و ... لە قەلەم داوە، ئەگەر سەرنج بدەینە ڕاو بۆچوونی ئادەمیزاد (جا زانایە فەیلەسوفە میژووزانە) هەردەم دەیەوێت بۆچوونەکەی تەعمیم بکات بۆ پەیرەوی ژیان، کەچی لە دوا شیێ کردنەوە دەبینین وەك (د.سۆلیڤان )[159] گوتەنی یەك لایەنیە، ئینجا زۆر دەست کورتیشە لە: ١- قوولێی بابەتەکە ٢- هەمەلایەنیەکەی ٣- سەرەنجامەکانی بە ووردی لێك نەدرایتەوە .

دەردی (تەعمیم) لەمدرسە هەرە بالآکانیش بەدی دەکرێت، لەوانە مارکسیزم دەبینین سەرجەم فلسفەو بۆ چوونەکانی بریتیە لەیەك لای ژیان، وەبگرە لەو لایەش لەبەشێکی ،ئینجا کیانی نەزەریەکەشی هەلقولاوی وەلامی واقیع و زەمان وزەمینێکی کۆمەلە، بۆیە ئەو مدرسانە تەمەن کورتن، لەبەر هەمان هۆی پیچەوانەش دەبینین شریعەتی ئیسلام کە هەردەم نوێ و بەکارو نەمرە، جا (حیجاب) یەکێك لەومەسەلانەیە کە دەمەتەقێ ی زور لەسەرە ، گوایە بەشێك بەرگری لەمافی ئافرەت دەکەن بێ وورد بوونەوە و قوولێ بوونەوە داوای دەرخستنی جوانی ئافرەت دەکەن بۆ هەمو

---

[158] رسائل اخوان الصفاء ج١ ص٩١-٩٢

[159] - لەکتێبێك بەناوی (حدود العلم) د. سولیڤان

کۆمەلگە بەچاك وخراپەوە ، بەرەهایی گوایە ئەوە: ڕووناك بیریە ، مرۆڤایەتیە ، شارستانیە ،مەدەنیەتە ..بۆیە ئەو داوایە لەگەل گەشە سەندنی عەلمانیەت وبیری نەتەوەیی ومۆدێرنیەت لەجهانی ئیسلامی سەری هەلّدا.

زۆربەی نوسەرانی ناشیۆنالیزمی عەرەب (هودا شەعراوی )[١٦٠]بە یەکەم داکۆکی کەری مافی ئافرەت دەزانن چونکە داوای کرد ئافرەت پۆشاکی لەسەر فڕێ بدا ،کتێبی(مرقص فهمی)بە ناوی (المرأة فی الشرق) وکتێبی (تحریر المرأة)ی قاسم ئەمین کە لە سالی ١٨٩٩ز دەرچوو بە پشتیوانی سعدزەغلول وشیخ محمد عبده داوایان کرد کۆتایی بە پۆشاك بهێنرێ چونکە ئەسالەتی ئیسلامی پێوە نیە ،هەندێکیان دەیان ووت دوورە لە نەریتی عەرەبی بۆیە با نەمێنێ[١٦١]، لە ئەفغانستانیش زاهیر شا لە کۆبونەوەیەکی فراوان پۆشاکی خستە ژێر پای و ووتی کۆتایی بە نەزانی ونەفامی هات[١٦٢]، لە کوردستانیش لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە فڕێ دانی لەچك وپۆشاك بە پێشکەوتن هەژمار کراوە ،لەو بارەیەوە سەرنج بدە لە بلاّوکراوەی (مەشروتیەت) بە پێنووسی (شەریف پاشا)ی کورد لە (ژ:٤٠ی سالّی ١٩٠٣) چۆن نووسیویەتی: (ئەوەی دەیسەلمێنێ کورد ئازاد بووینە و ئازادیخوازن ئەوەیە کە ئافرەتانیان هەرگیز پەچە ناپۆشن) ، گۆتەی(تا ئەوروپا لە کۆت و زنجیری ئایین ڕزگاری نەبوو پێش نەکەوت، ئێمەش با لەچك فڕێ دەین تا زانست فێر بین ،واتە پۆشاك ڕێگری پێشکەوتن وزانستە تا ئەو ساتەش ئەوە دەگۆترێتەوە ..،هەلبەتە ئەوە ڕاست نیە ئەگەر وابوایە لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە زاهیر شای ئەفغانی لەچکی لەژێر پێی خۆی ناو ووتی کۆتای بە سەردەمی تاریکی هات ،لە میسر وعێراق و تۆنس وتورکیا ..کەچی پێش نەکەوتون ،لە ئێرانیش دەبینین ئافرەتە لەچکی لەسەرە ودامەزرێنەری بەرنامەی ناوکیە،زانای گەورەیە.

با لێك دەینەوە پێکەوە ، کامیان لەبەرژەوەندی ئافرەتان و کۆمەلیشە؟ دەرخستنی جوانی بۆ گشتی یان خۆ داپۆشین لە گشتی ودەرخستنی بۆ تایبەت، لەو بارەیەوە کۆمەلێك ڕاو بۆچوون و دەمەقالی گەرم هەیە، هەندێك زیاتر لەوە لێ ی قوولّ بوینەوە ،هەرلەمەسەلەی جل و بەرگ و خۆ داپۆشین

---

[١٦٠] لە ڕاستیدا ئەو ئافرەتە داوای جێ بەجێ ی تەواوی شریعەتی ئیسلامیشی دەکرد کە پێی وابوو تەواوی مافی ئافرەتی تێدایە ، لە ٩ سالیدا قورئانی تەواو کردبوو ، بۆ زیا تر بڕوانە : مذكرات هدى شعراوي ـ دار المدى ـ سورية ـ دمشق ـ ٢٠٠٤ .

[١٦١] بڕوانە : الموسوعة الیسرة فی الأدیان والمذاهب والأحزاب المعاصرة-ص٤٥٣-٤٥٥

[١٦٢] بڕوانە : الإسلام والعلمانیة واثرهما فی نشأة الدولة العراقیة الحدیثة —ص٣٨

هەموو شوێنەکانیان کۆڵیوەتەوە ، لە هەرە نوێیەکان لە ئاستی فەیلەسوف و نزیك لە فیمینیزم (راسل) ی بەریتانی لەکتێبێکی بە ناوی(فی التربیه) دەلێت :(ئەگەر ئادەمیزاد ڕووت بێت باشترە هەتا منالەکان نەپرسن چی لەبن جلەکاندایە و عەیبە نەمێنی )، لەسەر هەمان تراز (فرۆید)یش دەڵێت: (ئەو ڕووتیەش وەك ئەو وێنانەی خیلاعی لی دێت ماوەك خەڵك سەیری دەکات و دوای لێ ی بێزار دەبن ،ئیتر خۆداپۆشینی بۆچیە)...، با پرسیارێکی واقیعانە بکەین :دەرخستنی جوانی وڕووتی بۆکێ؟ئەگەر بۆ خەلکیە ئەی چارە نووسی کیانی خێزان بەرەو کێ یە؟ ئەدی ئەو گرێبەستەی نێوان ژن وپیاو (مارەیی) چارەنوسی چیە ؟ ئەو کاتی مەبەستەکان وەردەگەڕێن و ڕۆل و ئامانجی هاوسەری دەبێتە لانەی بازاڕی سێکسی ، یان بەلای کەمی مانایەکی ساغ بۆ پەیوەندی هاوسەری نامێنیێ،لەسکالای پیاوێك لە سەر هاوسەرەکەی تۆماری کردبوو...دەڵێت :(خێزانەکەم لەکاتی نووستن دەبێتە دەعبایەکی ترسناك و هەرچەندە بەخەبەر دێم زەندەقم لێ ی دەچێت، بۆ ئەوەی پرچی تێك نەچێ کلاوێکی قیتی خستۆتە سەر ،دەم و چاویشی مەرهەمێکی وای لێ داوە نەبرۆو و نە لێوی دیار نامێنێت، هەر هەموو ئەو مکیاجانە بۆ ئەوەی بەیانی لە دەرچوونی دا جوان بێت) ،با کەمێك سەیر بکەین: کوا ئامراز و کوا ئامانج ؟ دەبوایە پیاوو ئافرەت خۆیان بۆ یەکتر جوان بکەن نەك بۆ دەرەوە، خۆ هیچ لایەکیان مولکی دەرەوە نین بەلکو مولکی یەکترین ،ئینجا دەرخستنی ئەو جوانیە(بەتایبەتی ئافرەتان)سەرنج وزەوقی خەلکی دەجولێنیێ بە بێ ماناو عەبەسی ، ئەوەیان لەپیشدا رای لێ کولەرەوە دەروون ناسەکان کە (فرۆید) خۆیشی پەنای بۆ رای (بنت .گرافت — ئینج) بردووە و دەڵێت :(زەوق و ئارەزووی جنسی هەریەکێك دەووروژێ کاتێ پرچ و ڕان و باسك و گەردەنی جنسەکەی بەرامبەری دەبینی)، لەوەش زیاتر ولیام بارکلی گەورە موفەسیری (کتاب المقدس) دەڵێت: پرچی ژنان فریشتەشی هەلخەڵەتاند ،هەر ئەوە خۆی وەلامی (راسل)یشە، با خۆشی ئەو دیمەنە بێنێتە پێش چاو ،کە خەلك هەمووی ڕووت بێت پەیوەندی کۆمەلایەتی چی بەسەر دێت ؟ سنورو قەدەغەو ئادابی گشتی و(زەبتی کۆمەڵایەتی) و ئەوەی پێی دەووترێ سیستەم و ژێرخان وبناغەکانی کۆمەلگە چی بەسەر دێت ؟خۆ ئەگەر دەلێن هەستی جنسی دەمرێت وەك لەمەلهەکان دەمرێت ،باشە بۆ بمرێت ؟ سەرەنجامی خێزان چی بەسەر دێت ئەگەر هەستی جنسی بمرێت، هەلدەوشێتەوە و شارستانی و کۆمەلیش هەلدەوەشێتەوە،ڕەنگە ژیانی مەدەنیەت تێك ڕووخێ ، بۆیە باژیانی جنسی بەشێك بێت لەژیانی ڕێکخراو لە چوارچێوەی سیستەم ویاسا و (بکە ومەکە) بێت ، کەواتە نەك ڕووتی بەلکو

بەدیار خستنی پرچ و قۆڵ و باسك و جلی بەرجەستەو تەسكیش هەم ئازاری خەلكی تیایە و هەم كار لە پیرۆزیەتی پەیوەندی كۆمەلایەتی دەكات ،كە پەیوەندیەكی مرۆڤانەیە، چونكە ( گەندەلی جنسی) بەمانا تێكەل بوون و هەلوەشانەوەی ریكخستنە، بۆیە بەدیلی پەیوەندی گشتی (لەشوێنە گشتیەكان )پەیوەندی یەكی شهوانیە،ئەوەش لە ئەنجامی خۆ دەرخستنی هەر جنسێك بە زیادەڕەوی — واتە ئیفرات كردن لە پێشاندانی مێینایەتی خۆی یان نێرینەیی پیاو سیستەمی كۆمەلگە تێك دەدا، فرۆید خۆشی دانی پیاهێناوەو دەلێت (تێكەلی جنسی ونەبوونی قەدەغە) لەپەیوەندی مرۆڤانە دوور دەكەوێتەوە ، سەرەڕای كۆمەلێك موزاعەفاتی تر ، كەوای لی دێت بەدەرخستنی جوانی ئافرەت هەم پیاوان بەكار بهێنێ بۆ مەرامی رۆژانەی (بژێوی بێت ئیداری بیت فەرمانبەری بیت) هەم عەقلی پیاویش بكەوێتە ژیر كارتێكەری شەهوانیەتی كەیەكێكە لەڕەگە دڕندانیەكانی ئادەمیزاد ،جا دەتوانی رۆژانە سەر لەگەراج و بازاڕو فەرمانگەكان بدەیت بەدەیان نمونەی بەرچاو (علم اليقين ) دەبینی، كە چۆن پیاو بەو جوانیە هەلدەخەلەتێنێ و شتی نەبووی بۆ دەكاو جیاوازی لەگەل خەلكانی تر پێ دەكا،ئافرەت وا لە پیاو دەكا بیپەرستی، نەك لە وولآتانی دواكەوتەو نەكراوە هەتا لە ئەوروپاش وەك ( سەلامە موسا)تێبینی كردبوو لەناو پاریس ئەو وەسفە هەلدەگرێ ،لەلایەكی ترەوە ئافرەتەكەش ئەخلاقی (كە بینایی مرۆیەكەیەتی) بەرەبەرە دەتوێتەوە، لەدوا ئەنجامدا تووشی داوی هەلدێر دەبێت كە گشتی سیناریۆیەكی پەشێمانی بە ژیان و چارەنووسی ئافرەت تەواو دەبێت . كاریگەری جیاوازی لە جوانی ئافرەت زۆر بەرچاوە ، كاری لەسەر پایەی (منزلە) كۆمەلایەتیشی هەیە، هەروەك جیاوزیەكانی تری پایەی ئابووری — پایەی خزمایەتی — پایەی نەتەوایەتی ... بۆیە چۆن تێدەكۆشین هەژارو دەولەمەند یەكسان بكەین، شێخ و مسكین یەكسان بكەین بەكەس بی كەس - رەش و سپی .... هتد یەكسان بكەین، ئاواش دەبێ تیبكۆشین جیاوازی لە جوانی ئافرەتان نەبتە چەوساندنەوەی ئافرەتی ناشیرین ،بۆ ئەوەی نەبێتە هۆی گەرمی بازاری جوانەكان و بێ بازاری ناشیرینەكان ، دیارە ئەو پرۆسەیە لەشوێنە گشتیەكان (ئەگەر كاتیانەش بێت)دەبتە كەسب كردنی پایەی كۆمەلایەتی و دەسكەوتی و مادی و یەخسیر بوونی شەهوانیەكان بۆیان ...، ئەوە هەمووی گیرو گرفتی كۆمەلایەتیەو رەگ و ڕیشەی بێ دادگەری و چەوساندنەوەی پێوەیە، بۆیە حیجاب ئەو ئەركە گرنگەو ترسناكە دەبینی لەزۆر تەوەرەدا، هەم لەناوەخۆ لەگەل ئافرەتەكان هەم لەگەل پیاوانیش وەك ئادەمیزادێكی تەواو نەك وەك پەرستنێكی كالایی، بۆیە لەو سەردەمە بەشێك لە ڕۆژ

ئاواییەكانیش هاتونە سەر ئەو ڕایەی بلێن خۆ داپۆشین دژ بە ئازادی نیە ،باراك ئۆبامای سەرۆكی ئەمریكا دەڵێت: ئەوەی ئازادی ئافرەتی قۆرخ كردیە پۆشاك نیە ،بەڵكو توندو تیژی ودەمارگیریە[١٦٣]، ڕەنگە بلێن ئەی بۆ پیاویش وا خۆی داناپۆشی ؟ .. بۆ پیاوانیش بەگوێرەی سنوری خۆی بەو سنورەی كە ئافرەت جوانترن (نسبییەن) خۆ دەكرێ بلێین بۆ (یۆرانیوم) وا هەڵدەگیرێ و ئەلەمنیومیش وا ... ئەو جیاوازیانە هەمووی ڕەگ و ڕیشەی سروشتی و گەردوونی خۆی هەیە، بۆیە حیجاب ئەو ئەركانەی هەیە بەكورتی :

١- سەرنج و شەهوانیەتی خەلكی بەناڕەوایی ڕاناكێشێ

٢- هەلس وكەوت لەگەل ئافرەتان لەسەر بنچینەی جوانیەكەی ناهێلی چ خۆ بە چ لەگەل پیاواندا .

٣- پەیوەندی ئافرەت و پیاو لەشوێنە گشتیەكان لە چاوبازی و ناكۆكی و چاودێری كردن و .. دا وەردەچەرخێ بۆ پەیوەندیەكی ئاسایی وهاوتایی و خوشك و برایانە هاوكاری و (دیاردەی شازیش هەر هەیە) .

٤- دەبتە هۆی ریكخستنی پەیوەندی گشتی و قەلاچۆكردنی هەلبزرگان (فوضی) و بەدكاری .

٥- بۆ ئەوەی ئافرەت لە بنچینەوە لە كالاو نیوە ئادەمی زاد و ئارەزوو بازی و نێچیری پیاو .. رزگار بكریت بۆ بوونی بە ئادەمیزادێكی تەواو.

لە سەر ئەو بنچینانە نەك هەر ئاینی ئیسلام هەمو ئاینە خاوەن پەیامەكان داوای داپۆشینی ئافرەتیان كردوە ،تەنها لە ئینجیل زیاتر لە (١٢ )ئایەتی لەسەرە ،لەوانە :

Cor:11:5١ واما كل امرأة تصلّي او تتنبأ وراسها غير مغطى فتشين راسها لانها والمحلوقة شيء واحد بعينه.

Cor:11:6١ اذ المرأة ان كانت لا تتغطى فليقص شعرها.وان كان قبيحا بالمرأة ان تقص او تحلق فلتتغط.

Cor:11:13١ احكموا في انفسكم.هل يليق بالمرأة ان تصلّي الى الله وهي غير

---

١٦٣ وثيقة بيت الأبيض حول تعزيز دور المرأة -٢٠٠٩/٦/١١

مغطاة النقاب

Sg:4:1. ها انت جميلة يا حبيبتي ها انت جميلة عيناك حمامتان من تحت

نقابك.شعرك كقطيع معز رابض على جبل جلعاد. (SVD)

Sg:4:3 شفتاك كسلكة من القرمز.وفمك حلو.خدك كفلقة رمانة تحت نقابك.

**ئایا حیجاب تەعریبی دەستور کوردەواریە لە جل وبەرگدا ؟** لەڕاستیدا ئەو پرسیارە پاساو بوە بۆ تورکیای دوای ئەتاتورك وئەفغانستانی دوای زاهیرشا وئەندۆنیسیاو زۆر وولاتی تر ،لە هەموی سەرسوڕهێنەر تر لە وولاتانی عەرەبیش بە هەمان پاساو لە تەنس زۆر وولاتی تر پۆشاك قەدەغەکراوە گوایە ئەوە نەریتی ڕەسەنی عەرەبی نیە ،ڕاستیش دەکەن ئەو دەستورە نەعربیە نەتورکی ،نەعەجەمی ونە ئەفغانی .. بەلکو ئاینیە ،بۆیە ئەو گوتارە کەتازە بەشێك لە لائیکی کورد دەیلێنەوە وگوایە پۆشاك تەعریبە ودوورە لە دەستوری کوردەواری قەوانێکی زۆر کۆنە .

## بەشی چوارەم

## چەند پرسێکی تری ئافرەتان

١- **لەبارەی میرات و شایەدیەوە** :لەپێشەکی دا پێویستە بەدەنگێکی بلّند بگۆترێت کە ئافرەت بێجگە لە شریعەتی ئاینەکانی خوایی هەرگیز لەمیراتدا بێ بەش بووە ، لەجهانی نوێشدا هەتا دوای شۆرش فرنسی و هەتا پێش نیوەی سەدەی بیستەم هەر بەنەزەریش بەشداریان لە هەموو رووەکانی ژیان قەدەغەبووە[١٦٤] ، ویل دیورانت لە (قصة الحضارة) دەلّێ کۆمەلگەی سەردەم لەڕێی ئیسلامەوە هەستی بەماف و میراتی ئافرەت کرد ،لەئیسلام دا ئافرەت خاوەن مولکە وەك بڕگەیەکی رەسەن (للرجال نصیب مما اکتسبو و للنساو ونصیب مما اکتسبن ...)

[١٦٤] یەکەم جار لە ویلایەتی وایۆمینگی ئەمریکی سالی ١٨٦٩مافی دەنگدانیان پیّ درا ،بەلاّم تا سالی ١٩٢٠ ئینجا دەستوری فیدرالی ئەمریکی ئەو مافەی تۆمار کرد ، لە نیوزلەندا سالی ١٨٩٣،لە ئوستراليا لە ١٩٠٢،نەرويج وسويد ودانيمارك لە ١٩١٣،،کەنەدا١٩١٧،بەريتانيا و نەمساو پۆلەنداو مەجەرو چیکۆسلۆڤاکیا وروسیا ١٩١٨ ، بەلجیکیا ١٩٤٥،لە فرنساش تا سالی ١٩٤٦ مافی دەنگدانی بە ئافرەت ڕەوا نەدەبینی ،دوای لە مادەی (٢)ی دەستوری سالی ١٩٥٨ بە فەرمی تۆمارکرا .

، ئەگەر بەووردی سەرنج بدەینە شوێنی ئافرەت لەپایەی ئابووریەکەی بە ئاسانی بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو لێپرسراوی یەکەم نیە لەبەرامبەر خێزان بۆ دابین کردنی کەرەستەکانی ژیان ،بۆیە لەدابەش کردنی میرات ئافرەت نیوەی بەردەکەوی ،کەدەقاو دەق پڕ بە شوێنەکەیەتی و زیاتری بدرێتی لاسەنگ بوون و زۆرداریە ،چونکە لەلای تریش بەش تری هەیە بەپێی شوێن وکاتی خۆی ، لەلای مێردەکەی ومارەیی ومیراتی پێشووی ، (جمال با جووی) لە ل ١٣٣ کتێبەکەی (المرأه فی فكر الاسلامی ) دا دەڵێ : لە (٧) دۆخدا ئافرەت و پیاو یان وەك یەك وەردەگرن یان ئافرەتەکە زیاتریش لەوە بەشێك دەڵێن لە ١٠ شوێن،بۆیە بەشی زۆری وولاتانی جیهانی ئیسلامی لەوتوندیەی بەرامبەر بە یەکسانی دابەشی میرات پاشەکشەیان کرد ، لە مادەی ١٨ی دەستوری تۆنس  ولە عیراق مادەی ٧٤ی دەستوری ١٩٥٨ویاسای ژ:١٨٨ی عیراقی سالی ١٩٥٩ تیایدا بڕیاردرا میراتی پیاو ژن وەك یەك بێت،دوای لە دەستوری ١٩٦٣ی عیراقی بە هۆی یاسای ژ:١١ کۆتایی بە یەکسانی میرات هێنرا، بۆیەڕۆژهەلاتناسی نەمساوی (ڤۆن گرایمەر ١٨٢٦-١٨٨٩ )کەپسپۆرە لە و بارەیەوە دەلێت سیستەمی میراتی ئیسلام ووردو دانا ترین داد گەریەو تەواو لەگەل باری ئافرەت و شوێنەکەی لەناو خێزان دەگونجێ .

تا ئێرە ئاساییە بە پێی تەرازوە ئابوریەکان ئەی بۆچی مانای ئافرەت نیو ئادەمیزاد وەردەگرێ، لە کاتێکا هەموو ئایەتەکانی قورئان ڕووی لە ئافرەت وپیاوە (واتە زکوری نیە)،وەلامەکەی دیارە ئەوەیە ئەو توێژەرو نوسەرو زانایانە یەکسەر لە ڕێی تەورات وئینجیل وفقهی ئیسلامی بۆ قورئانیش دەچن وئەو کێشەیە دروست دەبێت ،چونکە لەهەردووکیان لە هەمو دۆخەکان میراتی نێر دوو هەنکی مێیە  وەك لە تەورات هاتوە :  " إِنْ كَانَ رَجُلٌ مُتَزَوِّجاً مِنِ امْرَأَتَيْنِ، يُؤْثِرُ إِحْدَاهُمَا وَيَنْفُرُ مِنَ الأُخْرَى، فَوَلَدَتْ كِلْتَاهُمَا لَهُ أَبْنَاءً، وَكَانَ الابْنُ الْبِكْرُ مِنْ إِنْجَابِ الْمَكْرُوهَةِ، فَحِينَ يُوَزِّعُ مِيرَاثَهُ عَلَى أَبْنَائِهِ، لاَ يَحِلُّ لَهُ أَنْ يُقَدِّمَ ابْنَ الزَّوْجَةِ الأَثِيرَةِ لِيَجْعَلَهُ بِكْرَهُ فِي الْمِيرَاثِ عَلَى بِكْرِهِ ابْنِ الزَّوْجَةِ الْمَكْرُوهَةِ. بَلْ عَلَيْهِ أَنْ يَعْتَرِفَ بِبَكُورِيَّةِ ابْنِ الْمَكْرُوهَةِ، وَيُعْطِيَهُ نَصِيبَ اثْنَيْنِ مِنْ كُلِّ مَا يَمْلِكُهُ، لأَنَّهُ هُوَ أَوَّلُ مَظْهَرِ قُدْرَتِهِ، وَلَهُ حَقُّ الْبَكُورِيَّةِ "[١٦٥].

مێینەش ئەو کاتە میراتی دەبێ کە نێرینەکەش نەمینێ وەك لە الكتاب المقدس هاتوە  :

[١٦٥] سفر التثنية ﴿ ٢١ : ١٥ _ ١٧ ﴾

" وَأَقْبَلَتْ بَنَاتُ صَلُفْحَادَ . . . ووَقَفْنَ أَمَامَ مُوسَى وَأَلِعَازَارَ الْكَاهِنِ، وَأَمَامَ الْقَادَةِ وَالشَّعْبِ، عِنْدَ مَدْخَلِ خَيْمَةِ الاجْتِمَاعِ وَقُلْنَ: لَقَدْ مَاتَ أَبُونَا فِي الصَّحْرَاءِ، وَلَمْ يَكُنْ مِنَ الْقَوْمِ الَّذِينَ اجْتَمَعُوا مَعَ قُورَحَ وَتَمَرَّدُوا ضِدَّ الرَّبِّ، بَلْ بِخَطِيئَتِهِ مَاتَ مِنْ غَيْرِ أَنْ يُعْقِبَ بَنِينَ. فَلِمَاذَا يَسْقُطُ اسْمُ أَبِينَا مِنْ بَيْنِ عَشِيرَتِهِ لأَنَّهُ لَمْ يُخْلِفِ ابْناً؟ أَعْطِنَا مُلْكاً بَيْنَ أَعْمَامِنَا». فَرَفَعَ مُوسَى قَضِيَّتَهُنَّ أَمَامَ الرَّبِّ. فَقَالَ الرَّبُّ لِمُوسَى: إِنَّ بَنَاتَ صَلُفْحَادَ قَدْ نَطَقْنَ بِحَقٍّ، فَأَعْطِهِنَّ نَصِيباً مُلْكاً لَهُنَّ بَيْنَ أَعْمَامِهِنَّ. انْقُلْ إِلَيْهِنَّ نَصِيبَ أَبِيهِنَّ. وَأَوْصِ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنَّ أَيَّ رَجُلٍ يَمُوتُ مِنْ غَيْرِ أَنْ يُخْلِفَ ابْناً، تَنْقُلُونَ مُلْكَهُ إِلَى ابْنَتِهِ. وَإِنْ لَمْ تَكُنْ لَهُ ابْنَةٌ تُعْطُونَ مُلْكَهُ لإِخْوَتِهِ. وَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ إِخْوَةٌ، فَأَعْطُوا مُلْكَهُ لأَعْمَامِهِ. وَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ أَعْمَامٌ، فَأَعْطُوا مُلْكَهُ لأَقْرَبِ أَقْرِبَائِهِ مِنْ عَشِيرَتِهِ، فَيَرِثَهُ. وَلْتَكُنْ هَذِهِ فَرِيضَةَ قَضَاءٍ لِبَنِي إِسْرَائِيلَ كَمَا أَمَرَ الرَّبُّ مُوسَى"[١٦٦] .

بەگشتی لە پرسەکانی تریش نیوەیی پێوەدیارە وەك لە کتێبی (الدسقولیە لە ل٣٧)هاتوە :
ومن المعروف أن المرأة تذهب للكنيسة بعد ٤٠ يوما" من ولادة الذكر و٨٠ يوما" من ولادة الأنثى !! ،زۆر بە ڕاشکاوانە تر "هومیروس" دەڵێ ئافرەت نیوەش نین مەطەر بۆ بۆ مێردەکانیان زۆر دلسۆز بن ئینجا نیوەن ،دەقەکەی:( المرأة نصف الحياة . . إذا كانت مخلصة لزوجها ) .

**ئەوە لەو ئاینانە بەڵام لە ئاینی ئیسلام** مانای ئەوەیە ئەو ئافرەتە تەنها نیوە بەشی نیە ،لەلایەکی تریش بەشێکی زۆردەڵێن مادام نیو میراتی هەیە واتە نیوئادەمیزادە ،لەلای بەشێك لە فەقیهە ئیسلامیەکانیش ئەو پاساوە دەدەنە دەست بە پالپشت بەو فەرموودەیە: (يا معشر النساء تصدقن فإني أريتكن أكثر أهل النار)، فقلن: وبمَ يا رسولَ الله؟ قال: "تكثرن اللعن وتكفرن العشير، وما رأيت من ناقصات عقل ودين أذهب للُبّ الرجل الحازم من إحداكن"، قلن: وما نقصان ديننـا وعقلنا يا رسول الله؟ قال: (أليس شهادة المرأة مثل نصف شهادة الرجل؟ قلن: بلى، قال: فذلك من نقصان عقلها. أليس إذا حاضت لم تصلّ ولم تصم؟ قلن بلى، قال: فذلك من نقصان دينها) * ،لەچەند

---

[١٦٦] سفر العدد [ ٢٧ : ١ _ ١١ ]

* لە ئینجیل و تەوراتیش وا هاتوە ،با بروانینە سفر اللاوینی تەورات ﴿ ١٢ : ١ _ ٥ ] : " إِذَا حَبِلَتِ امْرَأَةٌ وَوَلَدَتْ ذَكَراً تَكُونُ نَجِسَةً سَبْعَةَ أَيَّامٍ. كَمَا فِي أَيَّامِ طَمْثِ عِلَّتِهَا تَكُونُ نَجِسَةً. وَفِي الْيَوْمِ الثَّامِنِ يُخْتَنُ لَحْمُ غُرْلَتِهِ. ثُمَّ تُقِيمُ ثَلاَثَةً وَثَلاَثِينَ يَوْماً

فەرمودەیەکی تر:المرأة کالضلع ...،شاورهن وخالفوهن، طاعة النساءندامة،خالفوا النساء فإن فی خلافهن البرکة ..هەروەها لە ئیمامی علیش ئەو فەرمایشتە گواستراوەتەوە : (المرأة شر کلها وشر مافیها انه لابـد منها)[١٦٧] ، هەروەها لە عمر بن الخطاب دەگێردرێتەوە "خالفوا النساء فإن في خلافهن برکة"... زۆری تر. چۆن پرۆسەیەکی بایۆلۆجی وەك (بێ نوێژی) دوور لە ویست وئارەزووی ئافرەت دەبێتە نوقستانی ئاینەکەی ، ئەوە بە فەرمودە هاتوە، هەمو لایەك دەزانن چەندە فەرمودەی دەستکاری کراو هەیە، چەند فەرمودەیەك لە بارەی ئافرەت هەلدەبژێرین بە پێی ناصرالدین ئەلبانی دروست کراوە لە "سلسلة الأحادیث الضعیفة والموضوعة" تۆماری کردوە:

١-"طاعة المرأة ندامة" رقم ٤٣٥ في السلسلة.

٢- "لولا النساء لعبد الله حقاً حقاً" رقم ٥٦.

٣- "شاوروهن وخالفوهن" رقم ٤٣٠.

٤- "هلکت الرجال حین أطاعت النساء" رقم ٤٣٦.

٥-"أعدی عدوك زوجتك" ضعیف الجامع الصغیر رقم ١٠٣٣.

لە بەرامبەر ئەوانەش لە قورئان وەسفی دەسەڵاتی ئافرەت لە سەبە بە (**عرش العظیم**)کردوە، لەگەل پیاویش بە (المؤمنون والمؤمنات بعضهم أولیاء البعض)کردوە ، لەفەرمودەش ( ماکرم النساء إلاکریم،وما اهانن إلالئیم )، (الدنیا متاع , وخیر متاعها المرأه الصالحه) ئەوە چۆن لەگەل وەسفی (ئافرەت شەڕە ) دەگونجێ ..، وا پێدەچی ئەسلی بیرۆکەی (نوقستانی عەقلی ئافرەت)لە مەدرەسەکانی یۆنانی–بە تایبەتی ئەرستۆ لە کتێبی (رسالە السیاسە)- کاری کردبێتە سەر ئەدەبیاتی فقهی ئاینەکان ،ئەگینا بە دەیان فەرمودەو ئایەتی تریش هەیە داکۆکی لە مرۆڤایەتی تەواوی ئافرەت دەکات ، بۆیە (نەخێر) لەبەر هۆیەکی زۆر سادە، جارێ لەئیسلام دا کارکەری ئابووری بنچینە نیە (وەك مارکسیەت – وای داناوە – سەرمایەداریش پەیرەوی بەکردە دەکات)، واتە پلەو پایەی ئادەمیزاد لەئیسلام دا لە سەر بنچینەی هەبوون و نەبوون نیە ([١٦٨]) ،وەك لەوەو

في دَمِ تَطْهِيرِهَا. كُلَّ شَيْءٍ مُقَدَّسٍ لاَ تَمَسَّ وَإِلَى الْمَقْدِسِ لاَ تَجِئْ حَتَّى تَكْمُلَ أَيَّامُ تَطْهِيرِهَا. وَإِنْ وَلَدَتْ أُنْثَى تَكُونُ نَجِسَةً أُسْبُوعَيْنِ كَمَا فِي طَمْثِهَا. ثُمَّ تُقِيمُ سِتَّةً وَسِتِّينَ يَوْماً فِي دَمِ تَطْهِيرِهَا ".

[١٦٧] امام علی – الف کلمة المختارة

[١٦٨] - ان اکرمکم عندالله اتقاکم ..

پێش باسمان کرد، یان هەیە دەڵێت لەبەر ئەوەی بەدوو ئافرەت بەشایەدیەك دەژمێرێت مانای وایە ئافرەت مرۆیەکی تەواو نیە ، ئەوەیان لەلای پیاوی عەوامی نەفام دەقۆزرێتەوە بۆ ئەوەی هیچ حیسابەکی مرۆیی بۆ ئافرەت نەکا ،لەلای ئەو نوسەرانە وهەندێ تەیاری ئاینی کەم شارەزاش پاساو دەدرێن ، ئەو جۆرە پرسانە مەسەلەی جیاوازی لەهێزی ئابووری لەهێزی کۆمەلایەتی لە شایەدی ... هەمووی پرسی ڕوالەتین (شکلین) ، بنەچەو هۆی لۆژیکی خۆی هەیە ، چونکە ئافرەت پەیامی دایکایەتی لەو گەردوونە پێ سپێرداروە لێپرساوی هەل و مەرجی ناوەخۆییە ،کەم تر تەرخان کراوە بۆ ئیشی دەرەوە، خۆ بەپێنچ وەزیری بەرگری ناتوانن ببنە وەزیرێکی دەرەوە لەکاتی قەیرانێکی یاسایی، ئایا ئەوە مانای ئەوانە وەزیر تەواونین ،بە ١٠٠پزیشك ناکاتە ڕای یەك جووتیار لە بارەی درەختێك ،بە ١٠٠ ئەندازیارو مەلای ئاینی بە ئەندازەی ئافرەتێکی پزیشك بۆ نەخۆش نابن ، لە دوای هەمو ئەوانە بزانین ئەو پرسیارە ڕوو لە کێیە : ئایا ئافرەت ئادەمی زادێکی تەواوە ؟ ئەو پرسیارە ئەسلەن ڕوو لەئیسلام نیە ،چونکە بێ دوودڵی سەردەمێك ئیسلام بەئادەمیزادی تەواوی هەژماری کردبوو کە ئافرەت هەتا ملی لە قوڕاو چوو بوە خوارەوەو شانازی ئەوە بوو تۆ ئافرەت زیندە بە چال بکەی،لەگەل مێردە مردوەکەی بسوتێ ،ئافرەت لە هەموو مانایەکی مرۆیی هاوێر کرابوو،تەنانەت لە سەر ئاستی ڕەوشەنبیری وپێناسیش هەروابوو ،بەنمونە (نەتەوە-قوم) (بە بنەماڵە و تایفەك وتراوە تەنها بە پیاوەکانیان بێ ئافرەت)[١٦٩] ،لەدوای هاتنی ئیسلام ئەو پێناسە گۆڕاو ئافرەتیشی گرتەوە،واتە هەرچی حیسابە بۆ ئافرەت نەکراوە هەتا لە زمانەوانیش ، یەکێ لە گرفتەکانی عەرەب ومیللەتانی تر دژ بە ئیسلام ئەوەبوو دەیان ووت ئەوە چ ئاینێکە گرنگی بە ئافرەت دەدا ، ئیسلام ئافرەتی خستە سەر پێ ، تاکە شارستانیەکە کە ئافرەت شانازی پێوە بکات هەروەك ڕەش پێستان تەنها شانازیان بە ئیسلامە کە تیایدا بە ئادەمیزادی تەواو حساب کراون، سەرکردەی وەك بلال حبشي و حارس .... لێ پەیدا بوو ([١٧٠]) ،ئاواش ئافرەتانی ناوداری مێژوویی تەنها لەناو ئیسلام دا هەبووە وەك ، خديجه ، فاتمە ، سومەیە ، عایشە ، مریەم ،مەعسومە، ، بەدەیان و سەدانی تر لەو ماوە کەمەی ئیسلامی ڕاستەقینەرۆلیان گێڕاوە لە زانست وئیدارەو سیاسەت و فکرو هەتا عسکریش، سورەت بەناوی ئافرەت هەبوو ،کوا لە چ شارستانیەتێکی تر ئەوە بەدی دەکرێ .

---

[١٦٩] معجم الكنوز الامثال و الحكمة العربية ل٣١، هەروەها مختار الصحاح-الرازي، مادة: القوم.

[١٧٠] بڕوانە: چیرۆکی ( الجذور ) بكة .

کەواتە ئەوپرسیارەی پێشوو ڕوو لە شارستانیەکانی ترە کە بەزۆری تەنها چەند سالێکە دان بە بوونی ئافرەت وەك ئادەمیزاد دەهێنن، ئەگینا بە (بێ عەقل) ، - زەعیفە — شەیتان- قژ درێژی عەقل کورت ، .... ناو دەبران ، لەئیسلامدا ئەگەر لەمیرات کەمتر وەرگری یان بەدوو شایەد بەیەك بچێت هیچ پەیوەندی بە حساب کردنی بەنیوە ئادەمیزاد نیە، کەی شایەدی ئەوەندە گرنگە، ئەوە دۆخە لەژیانا ڕەنگە جارێك تووشی دۆخی وابێت چ ئیمتیازێکی تیانیە، جگە لەسەر ئێشە، ئنجا راستیەکی پێویست هەیە وا دیارە زانایانی دەروون ناسیش بێ دوودلی دانی پیا دەهێنن ، بەلام بەنارێکی دەیخەنە ڕوو و دەیکەنە بەلگەی نوقستانی ئافرەت، کە بریتیە لە پرۆسەی زاوزێ و کاریگەریە دەروونی و زیهنیەکانی، زیاتر ئافرەت بەرەو پسپۆری دایکایەتی دەبا نەك کارو باری دەرەوە کە دەبێتە ئیشی پیاو،ئەو کاتی ناهەقی ئافرەت نیە کە ترکیزی نەبێت و پێویستی بەیەکێکی تر هەبێت شایەدی ورەوتی ڕووداوەکەی بۆ تەواو بکات ،ئایا ئەگەر کێشەیکی فیزیاییان کەوتە نێوان دوو زانا ( وەك کێشەی خێرایی ئەلکترون و شوێنی خولگەکەی )جوتیارێك دەتوانی بەشایەد حساب بکرێت وبتوانێ شایەدیان لەنێوان بدا کە کامیان بۆ چوونەکەی چی بووە ئەوی تر چیە ،رەنگە نەك بە دوو جووتیار بە ١٠ جوتیارو ٢ سەرۆك کۆماریشی بدەیە پالێش شایەدێکی تەواویان پی نادرێ ،بەلام بۆ بابەتیکی سوك تر رەنگە بە دوو جوتیار شایەدیەکە بدریت ،بەلاّم پسپۆرێکی فیزیایی لە نێوانیان بێت بە شایەدێکی تەواو حیسابە ، کەبەرامبەر دەجووتیارەکەیە، کەواتە مەسەلە ژمارە نیە بە لکو مەسەلە پسپۆریە... ئەوانە مانای ئەوە نیە جوتیارەکان یان فیزیاویەکان یان ئافرەتەکان یان سەرۆك کۆمارەکان ئادەمیزادی تەواو نەبن .

لە کۆتایدا ڕای جیاجیای زانایانی فکری ئیسلامی وفقهی ئیسلامیتان وەك خۆی بۆ نەقل دەکەین دەبینین ئەوەی بەلای فکریدایە زیاتر ئەومافە مرۆییەی داوەتە ئافرەت :

لە (فتح الباری) وا هاتوە : أجمع العلماء على القول بظاهر الآية: (وَاسْتَشْهِدُواْ شَهِيدَيْنِ من رِّجَالِكُمْ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاء)، فأجازوا شهادة النساء مع الرجال، وخصّ الجمهور ذلك بالديون والأموال، وقالوا: لا تجوز شهادتهن في الحدود والقصاص، واختلفوا في النكاح والطلاق والنسب والولاء" منعها الجمهور وأجازها الكوفيون.. واتفقوا على قبول شهادتهن فيما لا يطّلع عليه الرجال كالحيض والولادة والاستهلال وعيوب النساء، واختلفوا في الرضاع".

وقال ابن رشد: "فالذي عليه الجمهور أنه لا تُقبل شهادة النساء في الحدود، وقال أهل الظاهر: تقبل شهادتهن إذا

كان معهن رجل، وقال أبو حنيفة: تقبل شهادتهن في الأموال، وفيما عدا الحدود من أحكام الأبدان" مثل الطلاق والرجعة والنكاح والعتق، ولا تقبل عند مالك في حكم من أحكام البدن، وأما شهادة النساء مفردات –أعني النساء دون الرجال- فهي مقبولة عند الجمهور في حقوق الأبدان التي لا يطّلع عليها الرجال غالبًا مثل الولادة والاستهلال، وعيوب النساء، ولا خلاف في شيء من هذا إلا في الرضاع"
وقال ابن حزم في المحلّى: "ولا يجوز أن يقبل في الزنا أقل من أربعة رجال عدول مسلمين، أو مكان كل رجل امرأتان مسلمتان عدلتان، فيكون ذلك ثلاثة رجال وامرأتين أو رجلين وأربع نسوة، أو رجلاً واحدًا وست نسوة، أو ثماني نسوة فقط، ولا يقبل في سائر الحقوق كلها من الحدود والدماء وما فيه القصاص والنكاح والطلاق والرجعة والأموال إلا رجلان مسلمان عدلان، أو رجل وامرأتان، كذلك أو أربع نسوة كذلك، وتقبل في كل ذلك حاشا الحدود رجل واحد عدل أو امرأتان كذلك مع يمين الطالب، ويقبل في الرضاع وحده امرأة واحدة عدلة أو رجل واحد عدل".
ويقول ابن القيم : "والمرأة العدل كالرجل في الصدق والأمانة والديانة، إلا أنها لمّا خيف عليها السهو والنسيان قُويت بمثلها، وذلك قد يجعلها أقوى من الرجل الواحد أو مثله، ولا ريب أن الظن المستفاد من شهادة مثل أمِّ الدرداء وأم عطية أقوى من الظن المستفاد من رجل واحد دونهما أو دون أمثالهما".

٢- **لەبارەی سیستەمی فرەژنییەوە:** لەو سەردەمە هەر ناوی مافی ئافرەت بێت یەكسەر دژایەتی فرە ژنیشی لەگەل دەكرێ ،بۆیەلە زۆربەی پرۆگرامی حزب ورێكخراوەكان ودەستوری وولاتان ورێكەوتننامە نێو دەولەتیەكان باسی لێوەكراوە وەك مافی مرۆڤی نوێش،لەو میانەدا( صندوق الأمم المتحدة للسكان UNFPA) بە توندی دژ بە فرەیی وەستاو بە نەریتێكی كۆنەپەرستی لیستاندو داوای كرد هەموار بكرێ، لە دەستورەكانیش: لە مادەی ١٨ی دەستوری تۆنس و مادەی ٧٤ی دەستوری ١٩٥٨ی عیراق ویاسای ژ:١٨٨ی عیراقی سالی ١٩٥٩ تیایدا قەدەغەی فرە ژنی كرا ،ویەكسانی میرات وشایەدی كرا(لەو یاسایە سزای هەركەسێك دیاری كرا ئەگەر بكاتە دوو ئەوا یەك سال حوكم یان ١٠٠ دینار ،دوای لە دەستوری ١٩٦٣ بە هۆی یاسای ژ:١١ كۆتایی بەو جۆرە یاسایانە هێنرا.

لەلای ئاینیش لە یەهودی ومەسیحی ئەوەندە هاندەری هاوسەری نین ،بۆیە لە پەیامێکی پۆلس دا هاتوە ئێوە تەنها ژنێك بهێنن تا دووچاری خراپە نەبن ( ولكن لسبب الزنا ليكن لكل واحد امرأته ولكل واحدة رجلها) ،بەپێی هەندێ سەرچاوە لە بنەچەدا لە ئاینی یەهودیش تا ٤ژن حەلال بوە،دوای (**مجمع الكنسى**) لە سەدەی ١١لە ئەلمانیا کردیە یەك ژن دوای ئەو بڕیارە چوە فرنساوو دوای سەرووی ئەفریقا ئینجا هەموو جیهان ، بە هەمان شێوەش کنێسەکانی مەسیحی پشتیان بە ڕیوایەتێکی ح میسح بەستوە بۆ یەك ژنەیی بەبێ تەلاق[١٧١]،پاساویشی ئەوەبو کە لە سەرەتادا تەنها بەیەك نێرو یەك مێ دروست کراوە: (... **ولكن من بدء الخليقة ذكرا وأنثى خلقهما الله من أجل ذلك يترك الرجل أباه وأمه ويلتصق بامرأته ويكونا الإثنان جسدا واحدا فالذي جمعه الله لا يفرّقه إنسان**[١٧٢])

**فرەژنی لەنێوان ئارەزووبازی پیاو و بەزەیی ئایینداا**

لەدوایی سەرهەڵدانی ماف ئافرەت﴿ فیمینیزم﴾سێ باس لەجیهانی ئیسلامی بەردەوامە ,یەکەمیان پرسی نیوەیی میراتی ئافرەت وبەدوان شاهێدێك ، ئاخۆ ئەو بەشە گوزارشە لەوەی کە ئافرەت ئادەمیزادێکی تەواوە یان نا، دووەم پرسی خۆ داپۆشینی ئافرەت وتێکەڵ نەبوونی بەپیاو ,ئاخۆ ئەوەش هەرگوزارش کردن نیە لەنوقستانی ....بابەتی سێیەم کەلە هەمووان گرنگترە پرسی فرەژنیە ..,دەمەتەقێ لەبارەی یەکەم و دووەم تاڕاددەیەك خەفە بووەو لە سەروو باسمان کرد .

دەبێ بزانین ئەو باسانەی ئیستا لەکوردستان دەکرێ وریێکخراوی ئافرەتی بۆ دروست دەکرێ ، زۆر بەدەگمەن ڕێکخراوی ئافرەتی واماوە لەئەورووپا ، زیاتر ئەوە لەووڵاتانی دیکتاتۆری تاکە حزبی و داپۆشینی(نا دیموکراسیەتیان)وەك لەئەڵمانیا و ئیتاڵیاو سەردەمی هیتلەر و مۆسۆلینی دەکرا, لەسەردەمی عێراقی صدام حسێن ,ئێستاش سورياو تۆنس وهەندێ ووڵاتی تر(پیش ڕووخانیان) ،لە تۆنس فرەژنی وپۆشاك و هەمو ئەوانە بە دەستوری لەسەردەمی

---

[١٧١] من أجل ذلك يترك الرجل أباه وأمه ويلتصق بامرأته ويكونا الإثنان جسدا واحدا فالذي جمعه الله لا يفرّقه إنسان .(ئینجیل مرقص(١٠-٥)

[١٧٢] ئینجیل ( مرقص ١٠ — ٥ )

بۆرقێبەوەپیادە دەکرێ کەچی دیکتاتۆریترین وولآتن ....ئاوا وولآتی دەگمەن هەیە ئەوە پەیڕەو بکا .

لەکوردستان بانگەشەی ماف ئافرەت ئەو تێبینیە جۆر بە جۆرانەی خوارەوە لەخۆدەگرێ بەکورتی :

١–لاسایی کردنەوەیەکی ئەزموونی یەك سەدەی پێش ئێستای جیهانە, هەربەنمونە لەکوردستان ڕۆژنامەیەکی ماف ئافرەت بەناوی یەکسانی دەردەچوو ,هەمان ڕۆژنامە بەناو و ناوەڕۆك و ئامانجەوە پێش ١١٢ سالٚ لەمەوبەر لەئەلٚمانیا بەناوی گلایخایت – واتە یەکسانی دەردەچوو، دوایی ١٨ سالٚ شکستی هێنا ,واتە ئێمەی کورد لاسایی ئەزموونێکی شکست خواردووی پێش سەدەیەك لەوە و پێش دەکەینەوە .

٢- بەشی هەرە زۆری ئەو ڕێکخراوانەی لەکوردستان بۆ ئافرەتان درووست بووینە لەلایەن پیاوانەوە درووست کراون،ئینجا چ پیاوێکیشی ,پیاوی چاوچنۆك و گەندەلٚ ,....بەشی زۆریشیان کردوویانە بەدووژن یاخوود چەند (girl freand)یان هەیە.هەر بۆیەش هەموو ئەو کۆڕو وارکشۆپ وکۆبونەوانەی بە ئافرەت دەکرێ بۆ پەیدا کردنی مافی ئافرەت عەبەسیە وگومانی لیٚ دەکرێ، ئەگینا بڕیاڕ لە دەست پیاوە بۆ کۆبونەوە بە ئافرەت دەکەن ،ئەو ئافرەتە سەرۆکانەی ئافرەتانیش لە خزمەت ئەو پیاوە چاو چنۆکانەن .

٣–ئەو ڕێکخراوە ئافرەتانە بە موتلەقی ئافرەتێکی تەمەن گەورەی پیرێژن یاخوود بێوەژن و لێقەوماوی تێدا نیە ,وادیارە تەنها ئافرەتە گەنج و جوانەکان مافیان هەیە !.

٤–داواکاریەکانیان خەیالٚین ,هەر بەنمونە داوای یەکسانی دەکەن کەلە هیچ کونجێکی ئەو جیهانە نەهاتتەدی و نایەتەدی،وەك لەبەشەکانی پێشوو باسمان کرد، لەزۆربەی مەدرەسەکانی عەلمانی وەك لیبرال دیموکراس و سۆشیالیستی و شوعیەت ,ناشیۆنالیزمی ....بەزار دەلٚێن یەکسانی بەلآم ئافرەت بەنێچیر سەیردەکەن ,تەنها لەئاییینی ڕاستەقینەو ڕەسەن ئەو مافەی تەواوە و ئەفزەلٚیەت لەسەر بنچینەی مولٚکیەت و ڕەچەلٚەك و ماسولکە و نەژادی .....نیە ،بەلٚکو لەسەربنچینەی سەلامەتی عەقلیەتی ،کەدەرفەتی بۆ هەمووکەسێك بەیەکسانی ڕەخساوە .

٥–هەندیٚ داوای تر دەکەن نازانن مانای چیە ,داوای دایك سالاری دەکەن لەبەرامبەر باوك

سالاری ,جاریَ بناغەی ئەو تیۆرەیە هەر هەڵەیە وەك لە پێشوو باسمان كرد ،لەڕاستیدا دایك سالاری وباوكسالاری یاخود جوانتر بلێین ژن سالاری وپیاوسالاری زولمە وەك بینیمان چ ژن چ پیاو كە دەسەڵاتی بووە زۆربەیان زالم بووینە ،كەواتە نە ژن سالاری وەك فیمینیزمەكان دەیلێن نەپیاو سالاریش وەك لە تەورات وئینجیل وشارستانیەكانی یۆنانی وهندی ومیسری وچینی وناشیۆنالیزمی ئەو سەردەمەو عروبیەتی كۆن ونویَ بانگێشەی بۆ دەكەن بەلكو مرۆڤ سالاری تەواوە ،داد سالاری چارەسەرە .

٦–زۆربەی كێشەكانی ئافرەت لەسوتان و كوژران و خنكان و بەرەو لەش فرۆشی هتد...، ئەو ڕێكخراوانە لێی بەرپرسیارن ,كاتی هانیان دەدەن لەخانەوادە و ژینگەكەیان یاخی بن ،كەیاخیش بوون داوی چاوچنۆكان ئامادەیە و تووشی كارەسات دەبێت، بۆ زیاتر زانیاری لەو بارەیەوە كتێبی (ئۆقیانوسێك لەتاوان )بخوێنەوە .

٧–لەگەڵ زۆر تێبینی تر لێرە مەودانیە باسی بكەین یان دووبارە نەبێتەوە ..كەلەكۆتاییدا گومانی ئەوە دەكریَ خاوەن ئەو گەلاَلانە واتێگەیشتوون هەرچی دژ بە ئایین بكەی پێشكەوتنە ئەو بیرە وەختی خۆی لەلایەن ابوالعلاء المعري و داوایش لەلایەن هوایتهد پەیڕەوكراوە.

**ئافرەت لەڕوانگە جیاوازەكان:** هەڵبەتە هەر حزب و لایەن و كەسایەتیەك كەداوای ماف ئافرەت دەكەن لەڕوانگەی مەدرەسەكەی خۆی دەیكا ,هەربەنموونە لەدوایی بڕیاڕی پەرلەمانی كوردستان لە بارەی ڕەوابوونی فرە ژنی بە مەرج دەنگێكی زۆر هەڵبڕا ،د.رفیق سابیر لەهەموان بەزەق تر ووتی بڕیارەكە مانای كۆیلەكردنی ئافرەتان بووە ,ئەوە بەڕوانگەی ئەو تەواو ڕاستە چونكە مەدرەسەكەی ئەو كە شیوعیەتە واچارەی كێشەی ئافرەت دەكا كەلەخێزان بێتە دەرەوەو هەڵوەشێتەوە ،وەخۆی بەرپرس بیَ لەبەرهەم هێنان وە زیاتر دایك سالارانە لێرە مانای هەیە، كە لەكۆمەڵگەی شیوعیەت بەنیازبوون بهێننەدی ,مەدرەسەی لیبرالی دیمكراسی ڕۆژئاواش پاڵپشت دەكاتە چارەسەری(individual)، لەكۆمەڵگەی مەدەنی كەتیایدا هەرتاكێك تەنها كاریگەری یاسایی لەسەر بێت و بەوشێوەیە ئافرەت بەڕەڵا دەكا ...,هەر لەسەر هەمان بنچینە بۆ چارەسەری كێشەی ئافرەت لەخوودی لەشی مرۆڤ هەر مەدرەسەیەك ئەندامێكی لەشی مرۆڤی بەیەكلاكەرەوە و ناسنامەی ئەو مرۆڤە تێدەگەن ,مەدرەسەی شیوعیەت گەدەی پیَ فاكتەری یەكلاكەرەوەیە, سۆشیالیست دەست و پەنجە

،مەدرەسەی لیبڕالی و فرۆیدی ئەندامی جنسی ,ناشیۆنالیزیەکان پێست و نەژادی ...، هەرچی ئایینی ئیسلامە عەقلی پیَ یەکلاکەرەوەیە..لەسەرهەمان بناغەش چارەسەرەکان دادەڕێژرێن.

**فرەژنی:**

لەگەل ئەوەی هەندیَ ئاین تایبەت بۆ پیاوانی ئاینی ڕەبەنی دیاری کردبوو گوایە هاوسەری پیس وپۆخلی وگەندەڵیە ،لەلایەکی ترەوە لەکۆنەوە بیَ ڕادە فرەژنی هەبووە بۆ پادشاو گەورەکان ,تەنانەت ژمارەی ژنەکانی کیسرا دەگەیشتە ٣٠٠٠ ژن[١٧٣] ، سەرەڕای ئەوەش نامەی بۆکێخواو سەرکارەکانی دەنارد وەسفی ئافرەتی بەخالَ ناردبوو تا لە وولآتەکەیان زیاتری بۆ بنێرن ، لەسەروبەری هاتنی ئیسلام بۆ کوردستان کەئەو دەم لەژێر دەستی فارس بوو سەرکارەکانی لەکوردستان خەریکی ئەوکارە بوون، لەتەورات هاتوەگوایە (ح سلیمان) زیادەڕەوی لە ژن هێنان کردوەو ٧٠٠ژنی هێناوە لە میلەتانی (موایەن وعمونی وئادمی وسیدۆنی و وحسیەکان)[١٧٤]، ئەو زانیاریە هیچ ئەسلێکی نیە ئەوە تەوراتی ئەسلیمان نەماوە تا باوەڕ بە زانیاریەکانی بکەین.

شارستانی ئاینی بەگشتی وئیسلام بەتایبەتی فرەژنی دانەهێناوە بەڵکو سنوری بۆ داناوە، سنورەکەشی نە کاردانەوەیە نە نێوبژی و ڕەنگدانەوەی ئەو سەردەمی بێت بەلکو وەك لە خواروو دەردەکەویَ قوول دەبێتەوە بۆ هۆکارە کۆمەلایەتی وسروشتیەکان,بۆیە ئەو دیاردەیە ئەوەندە ئیسلام لێی بەرپرسیار نیە بەڵکو ئارەزووبازەکان لێی بەرپرسیارن ،کەبەدەرن لەدینداری ,دەبوایە لەبنەچەدا مامۆستایانی ئایینی دەنگی زۆڵم و زۆری ئافرەتان هەڵبڕن، کەلەلایەن ئارەزوو بازو چاوچنۆك و بیَ ویژدانەکان سەربە مەدرەسەی وەزعی و یان ئەوانەی بەپێی بەهاونەریتی کۆمەڵایەتی کار دەکا ,ئێستاش لەو شوێنانەی فرەژنیش قەدەغەکراوە بەیاسا ئەوا ئارەزووبازیەکەی دێنێتە دی لەڕێی فرەژنی بەدەرزەن ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ ،لەئەورووپاو ولآتانی مۆدێرن ومەدەنی فرەدۆستی،لەهەندیَ شوێنی تر خزمەتکارو کەنیزەو ،چارلس تایلەری سەرۆکی پێشووی لیبریا لە ڕۆژی ٢٤/١٠/٢٠٠٢بڕیارێکی

---

[١٧٣] مرتەزا موتەهەری لە کتێبی (الحجاب) و ویل دیورانت لە (قصە الحچارە) باسی ئەو ژمارەیە ژنانەی کیسرایان کردوە ،وسینۆهەش لە سەربردەکانی خۆی ئەو ژنانەی بینیبوو لە باخچە کرابوون کە میوانی کیسا بوە پێی ووتوە سینۆهە برۆ ژنێك لە باخچە دەربێنە بۆخۆت وواشی کرد .

[١٧٤] کتاب المقدس –سفر الملوك الأول ( ١١: ١ –٦) .

دەرکرد کە ژن بە دەرزەن بخوازن وداوای لە ژنەکەی خۆی کرد یەکسەر هەلسێت بەیەك جار ٤ژنی بۆداخوازیٚ،ئیستاش لەو ناوچانە نەریتی بەدەرزەن ژن هێنان وەك سەردەمی نەفامی هەیە، لە هەندیٚ شوێنی مۆدێرنیش ڕەوایی بە فرەیی دراوە، لەکۆنگرەی میونیخی تایبەت بەگەنجان لە ١٩٤٨کە بینرا ئافرەتانی ئەلمانیا چەند قاتی کوڕان بوو ئەوا داوا لەگەنجان کرا هەریەکە چەند ژنێك بهێنێت وەك ئەرکی نیشتمانی ..، بەو شێوەیە نارێکی لەو بڕیارە پێچەوانانە هەیە بە هەردوو ڕووکاری ڕەبەنی وفرەیی، سەرەنجام کۆمەڵێك دەردی کۆمەلأیەتی و تەندرووستی و ئەخلاقی لێدەکەوێتەوە لەکۆتاییدا کۆمەڵگەیەکی نادرووست پێش کەش دەکا.

هەردوولا ،ئەوانەی دژی فرەژنین ئەوانەی لایەنگری فرەژنین تاڕادەیەك لەستاندەر و عەیار تێدەپەڕێنین ، بەوردی ئاگاداری هەندیٚ ئامار و زانیاری نین,هەولٚ دەدەین بەکورتی باسی ئەو عەیارە ناسکە بکەین کەچۆن فرەژنی پێویستیەکی گەردوونی و کۆمەلأیەتی و حقوقیە ,لەلایەکی تریش فرە ژنی لە پێناو ئارەزووبازی (الأهواء)چەندە قێزەوون و زیان بەخشەو قورئانی پیرۆز چەندە دژیەتی ,کەواتە چارە چیە؟چارەکان لەڕوانگەی مەدرەسە وەزعیەکان کراوە و چارەنەبووە وەك لەسەرەوە باسمان کرد, چارەی ئایینی شەرم ناکا لەگۆتەی ئەم و ئەو ,بەڵکو چارەسەریەکی گەردوونیە ,باس لەو چارەسەریە بەعەیارە دەکا,چارەسەرو گەلألەکەشی پێش ئەوەی لەشەریعەت هاتبیٚ لە ئەرزی واقیع هەیە.

**<u>پاساوی ڕاستەقینەی فرەژنی</u>**:پرسیار و وەلأمێکی زۆر لەبارەی ئەوەی ئاخۆ بۆچی پیاو چەند ژنێکی هەبیٚ بۆ ژنێك چەند مێردێکی نەبیٚ؟ بۆچی هاوسەری کاتی نەبیٚ ..لەگەلٚ کۆمەڵێك پرسیاری تری عەبەسی بیٚ ئەوەی زانیاری تەواوی هەبیٚ ،لەلایەکی تریش لەسەرەنجامەکانی نەپێچاوەتەوە کەئێستا باسی دەکەین و بریتیە لە زیادبوونی ڕێژەی ئافرەت لەچاو پیاو ,ئەوەش هەرلەئەنجامی جەنگ و کوشتار نەهاتووە ,هەروەك هەندیٚ دام دەزگا وای بۆچوینە گوایە ئەگەر بەوهۆیەوە ئافرەت زیادی کردووە ئەو فرەژنی وەختێکە و لەگەلٚ کۆتایی جەنگ پێویست نامێنیٚ ,بەڵکو زیادەی ئافرەت پەیوەستە بەچەندین تەوەرەی سرووشتی و بایەلۆجی و ئینجا کۆمەلأیەتی ,بەوشێوەیەی خوارەوە:

١–تێکرایی تەمەنی ئافرەت نزیکەی ﴿٧–١٢﴾سالٚ لەپیاو زیاترە بەگوێرەی ناوچە دەگۆڕیٚ

، لەسەرانسەری جیهان تەمەنی هەردوولایان لەهەندێ وولآت بەنمونە وەردەگرین :لەئەسیوبیا تێکڕایی تەمەنی ئافرەت ٥٣ ساڵەو پیاویش ٥٠ساڵ, ئوسترالیا ٧٤ بە ٦٧ ساڵ ,ئیسپانیا ٨٦ بە ٧٥ ساڵ ,ئیکوادۆر ٧٢ بە ٦٧ ساڵ ,ئایسلاند ٨١ بە ٧٦ ساڵ , بەحرەین ٧٥ بە ٧٠ ساڵ ,بولگاریا ٧٦ بە ٦٩ ساڵ ,تایلاند ٧٢ بە ٦٥ ساڵ ,تورکمانستان ٦٩ بە ٦٢ ساڵ, دانیمارك ٧٨ بە ٧٢ ساڵ ,ڕووسیا ٧٤ بە ٦٢ساڵ , سلڤادۆر ٧٥ بە ٦٥ ساڵ ,سربیا ٧٧ بە ٧٢ ساڵ, چین ٧٢ بە ٦٩ ساڵ , فینلەند ٨٠ بە ٧٢ ساڵ, فلپین ٦٨ بە ٦٢ ساڵ ,قەتەر ٧٤ بە ٦٩ ساڵ, کەنەدا ٨١ بە ٧٤ ساڵ , لبنان ٧٢ بە ٦٧ ساڵ ,نەروویج ٨١ بە ٧٤ ساڵ ,هیند ٦٠ بە ٥٨ ,لەتونس کەفرەژنی لێ قەدەغەکراوە تێکرایی تەمەنی ئافرەت ٧٥ ساڵەو پیاویش ٧١ ساڵە[١٧٥],کوردستانیش کەئەو دەمەتەقێیەی لێ ڕوودا بریتیە لە :تێکڕایی تەمەنی ئافرەت ٦٨ ساڵەو پیاویش ٦٦ ساڵە, تاکە وولاتێك کەئەو زیادەی ئافرەتی تێدانیە دەولەتی فاتیکانە ,ئەویش لەبەر ئەوەی ئەو وولآتە هەر لەبنەڕەتدا ئافرەتی تێدانیە !... لە هەندێ وولآتی تر هەیە نزیك یەکن لەوانە بەنگلادێشو هەندێ ناوچەی دەوروبەری ،لە سەرچاوەکانی تری دیموگرافیاش ئاماژە بەو جیاوازیەی تەمەن کراوە لە قازانجی مێینە[١٧٦]، کەواتە لەهەر وولآتێك بەهۆی تێکڕایی زیادی تەمەنی ژن زیاتر لەپیاو چەندین ملیۆن ئافرەت زیاد دەکا و پێ ی دەوترێ (surpluse).

٢- لەیەکێتی سۆڤیەتی جاران زۆر داکۆکی لە دژی فرەژنی کرالە سالی ١٩٢٠وە لەلاین(لینین)ەوە جاڕی یەکسانی دراو لەمادەی(٧١)ی دەستووری سۆڤیەتیش تۆمارکرا ,کەچی لە ووردترین ئامار دەرکەوت ڕێژەی ژن لەچاو پیاو بریتیەلە :بۆ هەر ١٠٠ پیاو ١٠٦ ئافرەت هەیە[١٧٧]

٣–ڕاپۆرتی نەتەوە یەکگرتووەکان الکتاب السنوی الدیموگرافی :باسی لەمردنی منداڵی نێر و مێ دەکا بەوشێوەیی خوارەوە ,بەرێژەیی هاتووە لەدوای ساڵی(١٩٦١)بەتێکرای مردنی نێر ٤,٩٠ بۆ مێینە(٤,٦٠) دوای(١٠,٩٠ بۆ ٨,٧٠ – ١٩,١٠ بە ١٤,١٠ – ٤٠,٠٠ بە

---

[175] ١٥٥ ئەو ئامارانە یەکە یەکە لە (موسوعە البلدان)م دەرهێناوە هەروەها لەکتێبی (مشکلات السکان) ص١١٤ زیاتر وووردتر باس لەو دیاردە دەکا .

[١٧٦] بروانە :مبادیء علم الدیمغرافی –د یونس حمادی ص١٧١

[177] بروانە: بۆدۆستیك ویاخوت – عرض موجز مادیة التاریخیة .

٣١,٥ ....هتد )[١٧٨]دەبینین دیسان تێکڕایی مردنی منداڵی کوڕ ئەوەندە زیاترە لە کچ سەرەنجام دیسان لەهەر وولاَتێك چەندین ملیۆن ئافرەت زیاد دەکا.

٤–لە(مشكلات السكان) ئامارێکی زۆر دەگمەن و سەیری کراوە لەو بارەیەوە هەڵساوە لەسەردەمی کۆچ و ئیستیعمار ئاماری ژن و پیاوی کۆچبەرەکانی وولاتانی پێش کەوتووی کردووە بۆ کیشوەرە دۆزراوەکانی وەك ئەمریکا و ئوسترالْیاو نیوزلەندا و..,هەڵبەتە لەکۆچ کردن هەرپیاو زیاتر بووینە لەئافرەت ,هەندێکی لیّ تۆمارکردووە بەوشێوەی خوارەوە:

٢٧٠٠ پیاوی چینی لەگەڵ ١٠٠ ژن کۆچیان کرد , ٢٤٠٠ پیاوی یابانی لەگەڵ ١٠٠ ژن , ١٤٠٠ فلیپینی لەگەڵ ١٠٠ ژن بەو شێوەیەش پێداچوە لەگەل باقی ڕەگەزەکانی تر سەرەنجام هەروابوە[١٧٩] ,بەوشێوەیەش ئەوروپیەکان پیاویان زیاتر بۆ ئەمەریکا کۆچ کرد ,ئەوەی ڕوویدا لەو کۆچە لەدوای چەند سەدەیەك بەرە بەرە لەنەوەی ئەو کۆچ بەرانە ئەو جیاوازیەی ژن و پیاو کەم بووە، سەرچاوەی تریش گەیشتونە ئەو ڕاستیەو دەلێن لە سەرەتای ئیستعمارکردنی ئەمریکاو کۆچی ئەوروپیەکان پیاو گەلیّ زیاتر بوون دوای لە ئاماری ١٩٥٠ دەرکەوت بەرەبەرە ئافرەت زیادی کردوە، هاتە ئاستی پیاو، تاوای لێهات ئێستاش ڕێژەی ژن زۆر زیاترە...[١٨٠]هەموو ئەوانە مانای وایە بزووتنەوەی دانیشتوان(النمو السكانی)بەتۆماتیکی ژن زیاد دەکا...

٤– لە سەرەنجاما لەلای حۆشیەوە توێژینەوەکەی (مشكلات السكان) لە ص٥٣٦دەگاتە هەمان ئەنجامی (موسوعە البلدان) دەلێ :ئافرەت لە پیاو زیاترن وهەتا بێوەژنیش لە بێوە مێرد زیاترن لە جهان ،جگە لەوەی بە تێکڕایی هاوسەری پیا وژن هەردەم وایە ژنەکە بچوك ترە ئەوەش بە دەوری خۆی کار دەکاتە زیاد بوونی ڕێژەی ئافرەت .

٥– دوو عاملی تری زیادی ئافرەت:أ–خێرایی پێگەیشتنی جنسی (جدوەلەکەی سکان) ب–بەرگەی زیاتری نەخۆشی هەروەها ڕێژەی تەمەنی ئافرەتیش لەپیاو بە هۆی تر زیاد دەکا یان گوزارشی زیاترە،لە بریتانیا ئافرەت لە ٦٥ سالی خانەنشین دەکریّ وپیاویش لە ٦٠،هەروەها بە

---

[١٧٨] دەقی ئەو ئامارو خشتەکانە بەدرێژتر لە کتێبی گەورەی (مشكلات السكان) –دارین س تۆمسن لەگەل راڤید لویس ص٥٣٩

[179] بڕوانە(مشكلات السكان ) ص ١٢٦.

[١٨٠] الموسوعة العالمية العربية - ج١٦ص١٣٨

پێی خشتەکە دیموگرافیەکانی تەمەنی هاوسەری دووپاتی هەمان ڕاستی دەکاتەوە :ئافرەت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە تێکرایی لەتەمەنی ١٩سالی کەچی پیاو بە تێکڕایی ٢٥سال،ئاسیا ئافرەت٢١سالپیاو ٢٥سال،ئەوروپای رڕۆژهەڵات٢١ بە ٢٥،ئەوروپای رۆژئاوا ٢٣ بە ٢٦، باقی وولاّتانی تریش لەو نێوانەن[١٨١] ،دوای لە ل٣٧٨ی هەمان سەرچاوە خشتەکێکی تری لەوبارەیەوە بۆ سالانی ١٩٤٠،١٩٣٠،١٩٢٠ تا ١٩٦٠ کردوە هەمان ئەنجامی داوەتەوە .بەو شێوەیە لەولایەوبە دیوێکی تریش هەر ئافرەت زیاد دەکا .

جا ئەگەر هەر ئافرەتێك بەبەر پیاوێك بکەوێت، ئەوا چەند ملیۆن ئافرەتێك بێ مێرد ماوە.. کەواتە ئەو هۆیە واقیعیە وەك فشارێك دەیسەپێنێ پێش هەر یاسایەکی ئاسمانی کە دەبێت هەندێك پیاو بەخۆشی یان بەناخۆشی لە یەك ژن زیاتریان هەبێت، نازانین ئەو یاسایەی کە لە هەندێ ولاّتان لە دەستوردا لە پەیڕەوی ناوەخۆی لایەنی سیاسی لە کوردستانی خۆشمان تۆمارکراوە کە بۆ هەر پیاوێ تەنها ئافرەتێك چ چارەیەك بۆ ئەو ئافرەتانەی زیادەن دەدۆزنەوە؟ بەلاّم ئەو یاساو دەستورانە ئەوەندە خۆ بە بەرپرس نازانن لە ئەنجامەکانی کۆمەلاّیەتی و ئەخلاقی و ئابوری و هەتا فیکریش، ئەو یاسایانە بێ دیراسەتەو ئەو سیفاتانەی هەیە: (١- یەك لایەنە، ٢- بێ وردبونەوەیە، ٣- گوێ نەدراوەتە قولاّییەکەی، ٤-پەیوەندییەکانی کارتێکەرەکانی دیراسە نەکراوە، ٥- ئەنجام و ئەگەرەکانی هەلْنەسەنگێنراوە...) واتە زیاتر ئارەزوویەکی تەسکی سەرەڕۆیانە .

**کەواتە ئەگەر ڕێسای (one - to -one)مان پەیڕە و کرد بۆ هاوسەری ئەوا لەسەرانسەری جیهان بەسەدان ملیۆن ئافرەت زیاد دەکا.. چارەیان چیە؟ کەواتە فرەژنی حەتمیەکە لەدەست کەس نیە... ومناقشە و گفت و گۆ هەلْناگرێ ئەگینا زوڵمت لەئافرەت کرد ،لێرەدا چارەی وەزعیش ئەوەیە ئەو بەشە زیادەیە تەنهالەماف جنسی بێبەش نەبێ، بوونی لەخێزانی وڕەوڕەوەی ژیانی شارستانی لایان بەو پلەیە گرنگ نەبوە، ڕێدان بە (پەیوەندی جنسی لابەلا) چارەسەر نیە لە کۆتایی ئافرەتێکی سۆزانی دەردەچێ وەك دەبینین چارەنوسیان لە هەمو جهان چۆنە ؟ ئینجا بێبەشیش دەبێ لە دەیان ماف تر ...کەواتە ئەوە چارەنیە ,چارە هەرئەوەیە ئەوانەش هاوسەری بە (گرێبەست—مارەیی)بکرێ لە چوارچێوەی فرە ژنی**

---

[١٨١] مبادیء الدیمغرافیة - ص٣٧٧

کەئایینی ئیسلام دایناوە ,بەلاّم بەکۆت و بەندی زۆر توند و تۆلّ، تا زولّم نەکریٚ و نەبیٚتە مەیدانیٚکی ئارەزووبازی وخۆویستی ,بەلّکو چارەسەریەکە لەچوارچیٚوەی ئاین پەروەری و دادگەری و خۆبەخشی ,ئەویش بەمارەکردنی بیٚوەژن و سەرپەرشتی هەتیوکردن یاخود لەهەندیٚ دۆخ قەیرە کچیٚك بۆخیٚرو عیبادەت بۆ پیاو ژنەکەو مالّ و مندالّەکەو بەڕەزامەندی هەمولایەك نەك بۆ غەریزەی جنسی ,ئەوکارە واتە هیٚنانی (ئەرمەلە بەجیهاد فی سبیل اللە حساب کراوە بەفەرموودە) ,بەلاّم هیٚنانی کچیٚکی قەشەنگ و جاحیلّ بۆ کپ کردنەوەی ئارەزووبازی ئەوەیان (اهواء)ە، لە کۆنەوە فرە ژنی وڕەبەنی بە ناڕیٚکی هاتوە ،هەردوولایانهەلّەیە،پیٚویستی بە بنچینەو مەرج هەیە،تەنانەت ئاینەکانی تریش لە ژیٚر سایەی ئەو ڕاستیانەی سەروو ڕیٚیان بە فرە ژنی ناڕیٚك داوە ،یاسای مانۆی هندی ڕیٚی دا فرە ژنی بکریٚت بەو مەرجەیژنی یەکەمی قایل بیٚت ،لە یاسای حمورابیش ڕیٚدرا بە فرەژنی ئەگەر ژنی یەکەمی سەقەت یان نەزۆك بوو،ئینجا ژنی بچوکی دەبیٚت خزمەتکاری گەورەکە بیٚت، لە یەهودیش ڕیٚدراو لە تەورات نمونە بە ح سلیمان هاتوە گوایە ٧٠٠ژن و٣٠٠کەنیزەی هەبوە ، دوای لە تلمۆد دانی نا بە ٤ژنە، یەکیٚ لە چاکسازیەکانی مارتن لۆتەر ئەوەبوو فرە ژنی چاکترە لە تەلاق ودەیووت ح ئیبراهیم دووژنی هەبوو،چەند تایفەیەکی تری مسیحی ئەو ڕایەیان پیادەکرد لەوانە: تایفەی ئەناپاپسیٚت وئەوی تر ئۆرمۆن لە سالی١٣٥١ز داوای فرە ژنیان کردو بە باشتریان هەژمار کرد لە فرە دۆستی ،لە سەرئاستی زانایانیشیان دوای ئەزمونیٚکی زۆر ڕەخنەیان لە سیستەمی ئەوروپی یەك ژنی گرت ،لەو بارەیەوە شوبنهاوەر لە کتیٚبی (کلمة عن النساء)دەلیٚ ئەو بڕیارە لەسەربنچینەی ئەوەیە گوایە ئافرەت وپیاو بە ئەندازەی یەکن کەچی وانیە ، بەهەمان شیٚوەش (براتراند راسل )دەلیٚ ئەو بڕیارە وا بەتوندی بنیات نراوە لە سەر بنچینەی یەکسانی ژمارەی پیاو ژن کەچی وانیە ،هەرچی (سپینسر)ە لەکتیٚبی (اصول علم الإجتماع )لەو کاتانە ڕیٚی بە فرە ژنی داوە کە جەنگ بووییٚو پیاو کەم بووبنەوە ، لە کۆنگرەی میونیخی ١٩٤٩ لە ئەلمانیا داوا کرا هەر گەنجیٚکی ئەلمانی چەند ژنیٚك بهیٚنیٚ تا ئافرەتی بیٚ میٚرد نەمیٚنیٚتەوە بە هۆی جەنگی جیهانی دوەم . ئەو نوسەرانەی هاواریانە بۆ ئا ئافرەتان، دەبوایە وەك هاوەلاّنی خۆشەویست نەیانهیٚشتابایە بیٚوەژن و بیٚ میٚردەکان بمیٚنن و مارەیان بکەن بەدلّسۆزی، گویٚ نەدەنە جوانی و ئارەزوبازی، نەك هەر گەنج و

جوانەکان و هەبوەکانیان هەڵبژێرین و نەدار و ناشیرین و بەساڵاچوەکانیش بهێڵنەوە.. ئەوەیە مرۆڤایەتی یان ئەوەی ترە، بەڕاستی دڵسۆزی و جیهاد.

ئێمە پرسیارێك رادەوەشێنین: کوا وەڵام؟ لە ژن و مێردێك، ژنەکەی سەقەت بوو، ئەگەر ژنێکی تر نەهێنێت چی بکا؟ کێ خزمەتی ژنە سەقەتەکە بکات؟ پیاوەکە پێراناگات، یان دەبێ تەڵاقی بدات و ژنێکی تر بهێنێ.. جا نازانم چارەنوسی ئەو ژنە سەقەتە لەدوای تەڵاق بەرەو کوێ؟! دوای ئەوە ئەو کردەوەیە چ ئەخلاقێکە!! کەواتە هەر دەبێت ژنێکی تر بێنێت بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە.. رەنگە بڵێن ئەوە دۆخێکە بەدەگمەنە.. ئێ باشە خۆ فرەژنیش ئەرك وسونە نیە هەر لە دۆخە تایبەتیەکانە.

ئینجا چەندین هۆکاری تری فسیۆلۆجی بەهێزتر کە رەنگە لەگەڵ پێشکەوتنی زانستی زیاتر ئەو مەسەلەیە یەکلا دەکاتەوە نەك دەشێت یان ناشێت، بەڵکو وەك پێویستییەکی دادگەرانە ببێ، جا هەشە ئەو راستیانە رەچاو دەکات، بەڵام پرسیارێکی تر گەڵاڵە دەبێت:

باشە بۆچی لە هەندێ دۆخیشدا با ئافرەتێکیش چەند مێردێکی هەبێت؟

بەڵام ئەوە ناگونجێت، لەبەر چەند هۆیەکی زۆر سادەو ساکار، چونکە لە یەك خێزاندا چەند سەرەك خێزانێك لە یەك کاتدا نابێت، ئینجا ئەو منداڵانە نازانرێ ئی کام باوکە و.. ئیدی ئەگەر پێدا بچین تەواو نابێت، لەهیچ روویەکی کۆمەڵایەتی ئەنترۆپۆلۆجی، ئەخلاقی، فسیۆلۆجی و بایۆلۆجی و.. هەتا تەندروستیش، تاقیکردنەوەکانیش پتر مەحاڵی پیشان داوە، بۆ زیاتر سەیری کتابی (نظرية الجنسية-ل١٠٣) بکە کە توندڕەوترین بۆچون هەر لەوێش دوویات دەکاتەوە کە پیاو لەکاتێکدا مەیلی گۆڕانی جنسی هەیە، بەڵام ئافرەت تەنیا حەزی لە یەك پیاوە، لەسەر ئەو بنچینە بەهێزانە ئاینی ئیسلام وەك ئایینێکی واقیعی بێ شەرم و دوودڵی ئەو بەندە یاساییەی داناوە کە دەشێت لە دۆخی تایبەتی و لەژێر مەرجی توندوتۆڵی پێویست پیاوێك لە ژنێك زیاتر بهێنێ، ئەوەیان دۆخە واتە دائیم ە ئەسل نیە، بەڵام شەریعەتی ئیسلام چونکە هەمە لایەنە یاسا و فەرمانی ئەو دۆخەشی داناوە، وەك ئەوەی نایەڵێت لەسەر رێگا خەڵکی بوەستێت، بەڵام لەبەر پێویستییەك کە هەر وەستاش ئەوا دەبێت بەرێزی وەڵامی خەڵك بداتەوەو تەماشایان نەکات.. واتە لە دۆخەکانیش نابێت بەرەڵا بێت.. ئاواش لە دۆخی فرە ژنی یاساو فرمان هەیە ،دەبێت دادگەر بێت دەبێت توانای مادی و جنسی و عەقڵیت هەبێت.. مەرجی تریشی کە باسمان کرد. ئەو دۆخاتە لەژێر ئەو مەرجە توندوتۆڵانە تەواوەو هەماهەنگی هەیە لەگەڵ ئەو زیادەی ژمارەی ئافرەت چ لە بێوەژن بوون چ لە ژمارە خودی ئافرەت ، دەقاودەق ئەوە

چارەی ئیسلامە و بەشێکە لە دادگەری تاکۆمەڵگایەکی بێ چەوسانەوە دروست بێت،نەك دڕندانە ئاسا بۆ یەکتر وەك نیتچەو هەندێك فەیلەسوفانی تر وای بەڕەشبین دەبینن.

هەندێك لە ئیسلامیەکانیش وا تێگەیشتون دەبێت (سوننەتە) چەند ژنێك بێنێت.. ئەوەیان سونەتە یان ئارەزووە؟

**.پاساوەکانی فرە ژنی لەلای ئارەزووبازان :**

**بەکورتی چەند پاساوێکی تر باس دەکەن بەو ڕادەیە ئەکادیمی نیە، بەکورتی ئەوانەیە:**

**١- فاکتەری جەنگ کەلە سەروو باسمان کرد زیادەی ئافرەت بە هۆیەوە .**

**٢-ڕازی بوونی ئافرەت بەو دۆخە،زیادی مەیلی جنسی لای پیاو زیاتر لە ئافرەت .**

**٣-بەشێکی تر دەڵێن ئارەزووی جنسی پیاو زۆرە تاهەلنەچێ ودووچاری گوناح نەبێ بۆیە دووژنی دەرمانێکە، ئەو ڕایە زۆر بەباوی دەگۆترێتەوە .**

٤-بەرژەوەندی کۆمەلایەتی دووبنەماڵە یان دووعەشیرەت وادەخوازی بیکاتە دووژن .. [١٨٢]

٥-کۆمەلە خالێکی تری ماقول هەیە بەدەرە لەوەسفی ئارەزوو بازی کە لەسەروو باسمان کرد .

**گرفتەکانی فرەژنی**:گرفتی سەرەکی ئەوەیە فرەژنی لەئەنجامی ئارەزووی پیاو بێتە دی بەو بیانۆیەی گوایە تا دووچاری (نەزەر)و (زینا)نەبێ و ئارەزووەکانی تێدابێ لەسەرحسابی ماڧ ژنی یەکەم ،ئەوە پاساوێکی وەزعیە ,خۆبەهەمان ئەندازەش ئافرەتیش پاساوی وای هەیە دەکرێ بلێن بۆ ئەو مەبەستە ئافرەتیش ماڧ چەند مێردی هەیە ,هەرلەوەش مەسەلەی هاتنەدی دادگەری دێتە مەیدان وەك لەقورئان دەیەوێت ,ئەگەر بەهۆی ئارەزووبازی (اهواء)ژنی دووەم بێنێ ئەوا ئەتۆ بەدوای (هل من المزید)ی نەفسی خۆت کەوتووی، نەك ژن بەڵکو زۆرشتی تری دەوێ و ئەوکاتە دادگەری نایەتە دی ،بەزۆری بویتە کارەسات و جیاوازی و کێشە ,بە ئاسایی وسروشتی یەك ژنەیە،ئەگەر دۆخێك هاتە پێش و بەبڕیاری هەردوولا لەڕێی خودا بێوەژنێك مارە دەکەی ئەوا دادگەری دێتە دی، ئەوەی لای مامۆستایانی ئایینی بینراوە کەمتر ئەو خاڵەیان بەووردی ڕوون کردۆتەوە، گەلێ جار بوویتە گاڵتە جاڕی و باس لەدوو ژن و

[١٨٢] ئەو دوو خالەی دوای لە کتێبی (ئافرەت و خێزان لە سایەی شریعەت - علی باپیر ل١٩٧) هاتوە .

سیٚ ژن بەسووننەت کراوە,نابیٚ چارەنووسی ئادەمیزادێك وا بەسانایی و سوکی تەماشابکریٚ . لەکۆتایی و بەپوختەیی ئەوەیە فرەژنی بەندێکی گەردوونیە لەسەرووی دەستوور و پەرلەمانە و قەدەغەکردنی مانای مەحالٚ دیٚت، ئینجا دژی ماف ئافرەتیشە ,بەلاٚم چارەکردنی بەئارەزووبازی ناکریٚ، بەلٚکو ئەوە زیاتر مەینەتیان زیاد دەکا, بەلٚکو چارەی بەئاین پەروەوەری و خۆنەویستی دەکریٚ...کەواتە هاتنەدی ماف ئافرەت لەکۆمەلٚگەی لیبرالٚی وسۆشیالیستی و شیوعی و ناشیونالیزمی ناکریٚ ,لەکۆمەلٚگایەکی ئایینی و دادگەری دەکریٚ .

**ئەسل فرەژنیە یان تاك؟** دەکریٚ ئەو پرسیارە بەوشێوەیە گوزارش بکریٚ: یاسای فرەژنی لەنێوان سوننە و ئارەزوودا.

**لەوەی سەروو بۆمان دەردەکەویٚ ئەسل فرەژنی نیە هەروەك ئەوە لە پەیماننامەی مارەیی دیٚت، ئەوانەی بەتەمای دووژنین پێویستە نەیشارنەوە لە مارە بڕینا ئاماژەی پیٚ بکەن ،ئەگینا خودی مارەییەکە لەسەر تاك ژنی وتاك مێردیە ، لە کاتێکایەك ژن مافی خۆیتیان بۆ ئارەزووی هاوبەش، بەلاٚم فرە ژنی ئارەزوبازی ئەوەیە پیاو هەلٚسێت بۆ مەیلی جنسی کچێکی جوان تر لەوەی خۆی بهێنیٚ،ئەوەش مانای پێشینەیە کە دادگەری پیٚ ناکریٚ ، فرەژنی خێر خوازیش ئەوەیە لە ڕێی تەقواو ئیمان بە پرس وڕای هاوسەری وبە پێی پەیماننامەی مارەیی بێوەژنێك یان قەیرە کچێك یان هەر ژنێك کە لە پێناوی ئارەزووبازی نەبێت ئەوە وەك (جهاد فی سبیل الله)یە بە دەقی فەرمووده،بەدەیان ئایەت وفەرموودەش دژ بە ئارەزووبازی هەیە ،لەسەر ئەو بنچینە قوولٚە لە** (کۆنگرەی١٩٨٧ی تاران) زانایانی ئیسلامی سەبارەت بە(مافی مرۆڤ ومافی ئافرەت) هاتوە کەئەسل لە ئیسلامدا یەك ژنیە،نابێت سیرەی پێغمبەران وهاوەلاٚنی لەو بارەیەوە بکرێتە پالپشتی ئارەزوبازی فرە ژنی ، ئەوان بۆ مەبەستی ئارەزوبازی وجنسی فرە ژنیان نەکردوە ، بۆمەبەستی تر بوە چارەی کێشەو بێوەژنی وقەیرەیی وهەتیوان یان وەك ئامرازێك بۆ بلاٚوکردنەوەی دەعوەو پەیداکردنی ئامرازی پەیوەندی خزمایەتی[١٨٣] ، ئەوەلەسەردەمی جیهاد بووینە بەلاٚم لەسەردەمی(عمر کوری عبدالعزیز)دەبینین کۆتایی بەیەك ژن هێناوە ، لە کاتێکا خەلیفەکانی پاش وپێش ئەو زیاتر لە چواریان هەبوە بە بیانۆی جیا جیا ئەو خەلیفانەی فرە ژنیان هەبوە بەوەش

---

[١٨٣] تقرير مؤتمر– حقوق الإنسان فی الإسلام – ص٤٢٨ .

نەوەستاون سیستەمی کەنیزەشیان زیندوو کردۆتەوە کە ئاینی ئیسلام لە ناوی بردبوو،زیاتریش لەوە خەلیفەی بەدکاری واهەبوە هەر باوەڕی نەبوە بەکەیفی خۆی فەقیهی هەبوە فەرمودەی بۆ دروست کردوە، خەلیفە (ولید بن یزید٨٨-١٢٦ه) بە گالتەجاڕی بە خواو قورئان لە وەلامی ئایەتی (واستفتحواوخاب کل جبارعنید) دەداتەوە ودەلیّ:

أتوعد کل جبار عنید فها اناجبار عنید

فأن لاقیت ربك یوم حشر فقل: یارب خرقنی الولید [١٨٤]

بەشێکی تریش وەستانی ئیمامی عەلی بەیەك ژن(ح فاتیمە) لەسەر داوای پێغمبەر(د خ)بەباشترین بەلّگە هەژمار دەکا کە ئەسل یەك ژنیە ، بەشێکی تر دەلّێن ئەگەر ئەسل فرە ژنی بوایە ئەوا یەکسەر بۆ ح ئادەم یەك ژن دروست نەدەکرا بەلکو چەند ژنێکی بۆ دروست دەکرا، بە هەمان شێوە خوای گەورە فەرمانی بە نوح داکە تەنها نێرو مێیەك لەگەل خۆی هەلگریّ ئەوەش مانای ئەسل یەك ژنیە .

**فرە ژنی حەرام** : وا باش تربوو زاراوەی (حرام) نەهێنینە ناو ئەو بابەتە چونکە ئەوە کاری ئیمە نیەو لە ئاستی ئیمەش نیە ،بەلام بۆ تێگەیشتن ولەبەر باوی ئەو زاراوە بەکارمان هێناوە واچاك بوو زاراوەی (سنور بەزاندن) بەکاربهاتبوایە .

پیش ئەوەی بزانین فرەژنی حرام چیە پیویستمان بەوە هەیە فرەژنی حلال چیە؟بەکورتی ئەوانەیە:١-بۆچارەسەری کێشەیەکی فسیۆلۆجی یان سۆسیۆلۆجی ٢- لە چوارچێوەی ڕێکەوتن وتەقواو چارەسەری بێوەژنی وقەیرە کچ وخاوەنیەتی هێتیم ٣-بە ڕاوێژی هەردوولاو پاراستنی خۆشەویستی خێزانی ... بە پیچەوانەی ئەو هەنگاوانە ئەو فرەژنیە حەلال نیە ،واتە بە پێی شریعەت ودادگەری ناکرێتە فرەیی بەلکو بەپێی ئارەزووبازی دەکریتە فرەژنی ولە جیاتی چارە کیشەی تریش زیاد دەکا. ئەوەی خوارەوەش هەنگاوو نیشانەکانی فرەژنی حەرامە:

١- یەکیّ لەمەرجەکانی فرەژنی (عدل) و(هەق) پەروەریە (فان خفتم الا تعدلوا فواحدة..)کەواتە فرەژنی بۆ هەمو کەس نیە چونکە دەقی قورئان باس لەوە دەکا کە زۆرایەتی خەلك دژ بەهەقە،واتە دژ بە عەدلیشە ،واتە ئەوانەی شایستەی فرەژنین کەمایەتین وبۆ هەمو کەس نیە.

٢- بە پێی خالی یەکەم فرەژنی لە فەزای ئارەزووبازی وخۆویستی دەردەچیّ ، دەچێتە فەزای ماف وعیبادەت وخواییانە،مادام بەدوای ژنی جوان گەڕای مانای ناعەدالەتی دەستی

---

[١٨٤] د محمد عمارة-المعتزلة والثورة ص٧٢

پێکرد،بەدوای ژنی لیقەوماو کەوتی عەدالەتت دەستی پیکرد، ئەوەش وا دەکا فرەژنیەکەت بەمەبەستی چارەسەری کیشەی خیزانیکە ،بیوەژنیکە ،قەیرە کچێکە .. لەوەوە (الساعي على الأرملة والمسكين كالمجاهد في سبيل الله) کەچی ئەوانەی بەدوای کچی جاحیل وناسك دەگەڕێن ئەوە (اهواء)ە کەدەیان ئایەتی دژهەیەو حەرامە.بەلام نابێ ئەو هەنگاوەت بۆ تەقوابێت کەچی گوناحیکی لە پال بکەی بەوەی ژنی یەکەمت بتۆرێ و(مەوەدەو رەحمە)بشکێ،بۆیە یویستە ئەو هەنگاوە خواییە بە ڕاوێژو پرس ورِا بێت ،خێرەکە بۆ هەردوولا دەبێت،خۆ ئەگەر ژنی یەکەم قایل نەبێ ئەوا ئەو ژنە گوناهبار دەبێ ،هەلەی پیاو لەوەیە ناوەستێ لەسەر ئەوەی ئەوگوناحە بکەوێتە ئەستۆی ژنەکەو پرۆسەکە هەر دەکا ناوەستێ لەسەر ئەسل و ڕێکەوتنی مارەیی و..،ئەوەیە دیکتاتۆری وپیاو سالاری .

٣- لەبەر ئەوەی ئەسل یەك ژنیە و فرەژنی دۆخە،چارەیە،.. ئەوا ئەوانەی بە نیازن بیکەنە فرەژنی دەبێ لە (گرێبەستی مارەیی) تۆماری بکەن وبە ڕاشکاوانە بە ئافرەتەکە بلێ ، ئەگەر تۆماریش نەکرابێ ئەوا لە دۆخە (پیویستەکانی وەك: نەزۆکی ، ڕوودانی شکان،نەقسی بایۆلۆجیانەی جنسی..یان هەر دۆخیکی هاوتا ) و بە پرس وراوێژ لەگەل یەکتری بوار بە فرەژنی دەدرێ لەو کاتانە ئەگەر ئافرەتەکە قایل نەبێ ئەوە وگوناحی پیدەگا،ئەگینا فرەژنی شکاندنی گرێبەستی مارەییە و حرامە.

٤- لەبەر ئەوەی (مەودەو رحمە) یەکێ لە (مقاصدە) بنچینەییەکانی هاوسەریە (ومن اياته ان خلق لكم من انفسكم ازواجا لتسكنوا اليها وجعل بينكم مودة ورحمة ان في ذلك لايات لقوم يتفكرون) تا خیزان وکۆمەلگەیەکی خۆشەویست دروست بکرێ ،واتە هەمو ئەو فرەژنییانەی خۆشەویستی وبەزەیی وەردەگێڕی بۆ ڕق وقینەو نادادگەری ..حەرامە، کەواتە یەکەم مەرج وهەنگاوی فرەژنی ئەوەیە دەبێ بە پرس وڕای هەردوولا دەبێت،ئەگەر پاساوی ئەوانەی دەیکەنە فرەژنی وپرس بە هاوسەرەکانیان ناکەن دەلێن پرسیان پێ بکەین قایل نابن، پاساوێکی لاوازو زالمانەیە و شکاندنی گرێبەست وئەسل ومەقاسیدێکی قورئانیە،پرس پینەکردنی واتە نەمانی متمانەو خۆشەویستی وتەبایی نیوانیانە ,,هەمو ئەوانە هەم تیکدانی بناغەکانی خیزان وکۆمەلگەیەو هەم بەرهەمهینانی مرۆڤی سەلبی وهاندانی تاوانە...حەرامیشە.

پوختە ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە ئەوانەی دژ بە فرەژنین وئەوانەی لەگەل فرەژنین بێ قەیدو شەرت هەردوولا بەهەلەداچووینە،فرەژنیەك گونجاوە لەژێر مەرجی توندوتۆل لەگەل ئەو ڕێژە زیادەی ئافرەت ،ئەوەیە ڕێك کۆمەلگەیەکی تەندروستیت پێدەدا .

**چارەسەری یەکجاری کێشەی ئافرەت:** هەموو لایەك دان بەوە دەنێن کە ئافرەت چەوساوەیە بە چەندین ڕووکارو ئاڕستەوە،بەشێکی بە ڕزگاری نیشتمانی چارە دەبێ ،بەشێکی تری بە ڕزگاری چینایەتی ،بەدامەزراندنی کۆمەلگەی مەدەنی بەشێکی تر چارە دەبێ ،بەشی تری بە پیادەی دادگەری و...هتد ،لەدوای هەمو ئەوانە بەشێك دەمێنێت تایبەت بە ئافرەت مادام هاوسەری بریتی بێت لە گواستنەوەو خستنە سەر میلاکی پیاو ،لێرەدا گرێبەستی مارەیی وپیادەی یاسای هەرەدادگەری ڕۆل دەبینی بەلاّم لەکۆتایدا لە چوارچێوەی خێزان ئەگەر ئەو پیاوە بە بیروباوەڕو ئاینێکی زۆر ستاندەر پەروەردە نەبووبێت ئەوا لایەنی شەڕانیەتی مرۆڤ لەو کەمە دەسەلاّتەی(مێردایەتی) بەکاردەهێنێ، ئەوەیان کێشەیەك بوە لەو مێژوەی مرۆڤایەتی بە ئاینیەکانیشەوە فەترەی کەم ونمونەی دەگمەن نەبێ لێی جێ بە جێ نەکراوە.

لەلایەکی ترەوە مادام نەریتی کۆمەلگە وابێت ناموس تەنها لای ئافرەت بێت ولەهەر ڕووداوێکی ڕاستەوخۆ وناڕاستەوخۆ لەلایەن هەردوو ڕگەز ئەوا پیاو سەربەرزو براوە بێت وئافرەتیش دۆڕاو بێت،لای پیاو بە بنەمالّەوخێلەوە شانازی پێ بکەن ولای ئافرەتیش داماو،ئەو کاتە سزای ئافرەت دەدرێ وپاداشی پیاو دەکرێ،ئەو کاتی کە کچێکت بوو ڕووت گرژ دەبێ،زاوا بوون شەرمە دەبێ لەلای خزم وکەسی ئافرەتەکە،ئەو کاتە ئافرەت بە مرۆڤی تەواو هەژمار ناکرێ بایاساو شریعەتیش پێچەوانەی ئەو نەریتە لە دەسەلاّتابن، هەمو ئەو دۆزانە ژێر خانێکی تری هەیە وراستەوخۆ دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی بۆچی لایەنی جنسی ئافرەت عەیبەیەو لای پیاویش مەردایەتیە،هەموو ئەوانە دەگەڕێنەوە بۆ سەرچاوەیەکی سادە ئەگەر لەوێ چارەسەر بوو باقی کێشەئالّۆزەکان چارە دەبێ، ئەویش بەوە دەبێ کە بتوانی کۆمەلگایەکی وا دروست بکەی تیایدا پرۆسەی جنسی نێوانیان مانای سایکۆلۆجی وکۆمەلاّیەتی لاوازنەبەخشێ،بەو ئارستەی پیاو تیایدا براوەو سەربەرز ئافرەتیش دۆڕاو شەرمەزاری ،تائەو ڕادەیە چۆن کەس وکاری پیاوەکە سەربەرزن بەو پرۆسەیە ئاواش لای ژنەکە ...ئەگینا ئەوکێشەیە چارەسەر نابێت ،سزای ئافرەتیش دەدرێ پیاویش خەلاّت دەکرێ، هەرچەندە شریعەتی ئیسلام سزاو پاداشی بۆ هەردوو ڕەگەز

بەیەکسانی داناوە بەڵام نەریتی کۆمەڵگە تا ئەو ساتەش نەگەیشتۆتە ئەو ئاستە بتوانی پێی قایل بێت ،ئەوەش پێویست بەدروست کردنی کۆمەلگەیەکی سەرووی مەدەنیەتە کەتاکەکان وسیستەمەکەی بە بیرو باوەڕێکی ئەوەندە پتەو دامەزراو بن دەرباز بووبن لە نەریت وشەرم وعەیبەی بیّ بنچینە ، ،کۆمەلگەی تەندروست بەوە بەرپا دەبێت کە پەیوەندی نێوان نێرو میّ ژن وپیاو لەو پانتاییە فراوانەی پەیوەندی مرۆڤایەتی تەسکی بکەیتەوە بۆتەنها پەیوەندی جنسی و هەمو دەم بەو ڕوانگە تەسکە سەیری ئافرەت بکەیت .

❊❊❊ ❊❊❊ ❊❊❊

**پوختە و ئەنجام :**

١- ئافرەت دەچەوسێتەوە هەتا ئادەمیزاد بچەوسێتەوە، کێشەیەکی سەربەخۆی نیە، بەشێکە لە کێشەی ئادەمیزاد و نەبوونی دادگەری.

٢- ئەو کێشەیە لەلایەن پیاوانەوە زیاتر گەلاڵە دەکرێت و کۆمەلّێك ڕێکخراو و سەندیکای ئافرەتانیان پێکهێناوە، هەر لە خزمەت پیاواندایەو زیاتریش بەپێی زۆربەی ڕاپرسی و ئامارەکان ئافرەت لەو ڕێکخراوانە نەك هەر زیاتر دەچەوسێنەوە بەڵکو بەشێکی زۆریش دەکەونە ژێر ئارەزوبازی پیاوە دەسەڵاتدارەکان.

٣- بانگێشەی یەکسانی ئافرەت و پیاو پێش ئەوەی لەڕوی کۆمەلایەتی و ئابوریی و سایکۆلۆجی و مێژوویی نەشیاو بێت مەحالەو زانستیش نیە.

٤- بە پشکنینیش بێت ئەگەر نمونەیەکی دەگمەنیش دۆزرایەوە کە تیایدا ئادەمیزادەکان (پیاوەکان) بەگشتی سەربەست بوون کەچی کێشەی ئافرەت هەبوو، ئەوە مانای وانیە کێشەی ئافرەت کێشەیەکی سەربەخۆیە..دەردەکەش لەسیستەمی باوك سالاری یان یەکسان نەبوونی پیاو و ئافرەت یان..نیە،بەلکو لە نەبوونی دادگەری ڕاستەقینە دێت .

٥- ئەو کاتە کێشەی ئافرەت چارەسەر دەبیّ کە کۆمەڵگەیەکی دادگەرو گەشەسەندوو دروست بکریّ بە جۆرێك ناموس تەنها لای ئافرەت نەبیّ ،لە پرۆسەی سێکسی پیاو بەسەرکەوتو وئافرەتیش بە

شەرمەزار حیساب نەکرێ ،ئەگەر شەرعی بوو هەردوولا سەربەرزو ئەگەر ناشەرعی بوو هەردوولا ڕێسوا .

٦- چارەسەرکردنی کێشەی ئافرەت دەبێتە هۆی کارا کردنی دوو قاتی ووزەی کۆمەلگە کە ئیستا نیوەی پەك خراوە لەگەل هەندێك باش بوونیشی،ئەو کاتی زیاتر کۆمەلگە بەختەوەر دەبێ وبەرهەم زیاد دەکاو پەیامەکەی مرۆڤایەتیش (کە تەعمیری زەمینە) باش تر دێتە دی.

## لە بلاوکراوەکانی نوسەر:

١- هەلبژاردن لەنێوان عەلمانی وئیسلامیەکان .

٢- دەقـەکانی سـیڤەر وخویندنەوەیـەکی تـر (سـەلام نـاوخۆش) (مسـعودعبدالخالق) بـەهاوکاری (یـەکێتی پەرلەمانتالرانی کوردستان) .٣٠جار چاپکرایتەوە .

٣- چارەنوسی فیدرالی لە دوای دەرچو ونی عێراق لە بەندی (٧)-.

٤- کێشەی ئافرەت لە ڕوانگەی ئاینی و عەلمانی، بەهاریکاری یەکێتی خوشکانی یەکگرتووی کوردستان .

٥- ڕۆلی عەلمانیەت لە دروست بوونی مەینەت کورد.

٦- کوردســتانیەتی کـەرکوك وناوچـە دابڕێنراوەکـان بـە پێـی بەلگەنامـە نێودەولەتیـەکان- لەلایـەن (ی.پ.ك)بلاوکرایتەوە ، لەو زوانە بەمەولەتی بەرێزیان دەبێتە زنجیرەی ١١ی ستاندەر .

٧- مەوسوعەی جودی .

٨- ناسنامەی حزبە کوردستانیەکان .

٩- ناسنامەی کەرکوك بە پێی بەلگەنامە نیودەولەتیەکان .

١٠- ڕەوشی فلسفی لەسەدەی ٢١ .

١١- بە عربی: الأسسلام والعلمانیە واپرهما فی نشأە الدولە العراقیە الحدیپە .

١٢- سەری سال ..شێکردنەوەیەکی فەرهەنگی .

